بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

(( إنَّ الحَمدَ للهِ نَحمدهُ ونَستعينُهُ ونَستغفِرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنفُسِنا وَسيّئاتِ أعمالِنا، مَنْ يهدِهِ اللهُ فَلا مُضلَّ لَهُ، ومَنْ يُضلِل فَلا هاديَ لَهُ، وأشهَدُ أن لا إلـه إلاّ الله وحدَهُ لا شَريكَ لَهُ، وأشهَدُ أنَّ محمّداً عَبدُهُ ورَسولهُ.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ (آل عمران: ١٠٢)

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ ( النساء: ١)

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلاً سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَـٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾. (الأحزاب: ٧٠-٧١)

أمابعدُ فإنّ أصدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ، وخيرَ الهَدي هَدِيُ مُحمّد(ﷺ)، وشَرَّ الأمُور مُحدَثاتُها، وكُلَّ مُحدَثةٍ بِدعَة، وكلَّ بِدعَةٍ ضَلالَةً، وكُلَّ ضَلالَةٍ في النّارِ )).

**مرۆڤ ئەو زیندەوەرەیە کە مەبەست و ئامانج و ئەرکی سەرشانی بۆ دیاریکراوەو بەرنامەیەکی تێرو تەواوی بۆ داڕێژراوە لەلایەن خوای خاوەنییەوەو پێویستە بیکات بەکالآی بالای، ئەو بەرنامەیەش هەر لەدایك بوونەوە هەتاکو مردن و لەهەستان لەخەوەوە هەتاکو خەوتنەوەو هەموو کاتەکانی تری ژیانی گرتۆتەوە. بۆیە شارەزابوون بەو بەرنامەیە ئەرکی سەرشانییەتی، وە زیکرەکانیش بەشێکە لەبەشە سەرەتاییەکانی ئەو بەرنامەیە.**

**پاش ئەوەی چاپی یەکەم و دووەم و سێیەمی نامیلکەی (قەڵای موسڵمان لە زیکرەکانی ڕۆژانەو شەوانە لەقورئان و سوننەت دا) کەوتە بازاڕەوە. موسڵمانان بەتامەزرۆو پەرۆشەوە باوەشیان بۆی گرتەوەو دیاربوو تاڕادەیەك جێی خۆی دیاریکرد. بەڵام لەلایەکی تریشەوە هەندێکی تر لەو موسڵمانە دڵسۆزانە چەند تێبینی و ڕەخنەیەکیان خستە ڕوو کە ئەمەش هانی منیدا کە زیاتر گرنگی پێبدەم و پیایدا بچمەوە، لەوانە هەندێ زیکری فەرموودەی لاوازی تێدابوو دەرم هێناو هەندێکی ترم بۆ زیاد کرد لەفەرموودەی چەسپاوو صەحیح کە لەچاپی یەکەم دا نەبوو.**

**پاشان هەستام بەزیادە ڕوون کردنەوەی زیکرەکان و وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی کوردی و داڕشتنەوەی بەشێوەیەکی ڕێك و پێك تا موسڵمانان ئاگاداربن بەماناو مەبەستی ئەو زیکرانەی کەدەیڵێن**

کەئەمـەش زۆر پێویسـتـە. وە هـەروەها دانـانی سەرچاوەی ئـەو فەرموودانــە لەپــەراوێزی خــوارەوەدا بــۆ زیــاتر متمانــە بــوون بەراسـتێتی فەرموودەکـە. چونکە پێویسـتە موسـڵمانان هـەردەم چاوڕۆشن بن بەراستیو ناڕاستی ئەو زیکرانەی کە دەیڵێن.

وە هەوڵمداوە زیکرەکان بەپێی پلەپلەیی ژیانو هەڵسوکەوتەکان دابنێمو دیارە ئەمەش زۆر وردەکاری پێویستە.

پاشان جگە لە زیکرەکانیش چەند سوننەتو ئادابێکی ئیسلامیم بۆ زیاد کردووە بۆ زیاتر سوود وەرگرتن لێی.

ئاشکراشە هیچ کارێکی مرۆڤ بێ تانـەو کـەموکورتی نییـەو هـەر هەڵەیەکیشـی تێـدابێت داوای لـێخۆشبوون دەکـەم لـەخوا لـێی.

وە هەر چاکەیەك و تەواوییەکی پێوە دیاربێ لەخوای گەورەوەیەو هەر هەڵەیەکم کردبێ لە شەیطان و نەفسەوەیە. شادمانیش دەبم بە ناردنی هەر ڕەخنەو پێشنیارێك لەسـەری، تـا بەهـەموو لایـەك خزمەتێکی ئەم بوارەی تری ئیسلام بکەین.

لەخوای گەورە داواکارم یارمەتی دەرمان بێت بۆ هەموو کارێکی چاکە و نیەتمان لە ژەنگو ژاڵ پاك بکاتەوەو پەنا دەگـرم بـەخوا لـەوەی کـە ئـەم کـارەم بـۆ مەبەسـتێکی تـری جگـە لـە ڕەزای ئـەو کردبێـت. داواکاریشـم لـەدوعای خێـر بێبەشـم مەکـەنو خـوای گەورە ئەم کارەم بخاتە سەر تـەرازووی چاکە کەمـەکانم لـەرۆژی دواییدا.

حەمزە بەرزنجی

١٤٢٠ کۆچی – ٢٠٠٠ زاینی

## بەشی یەکەم:

# ناوە جوانە تەواوەکانی خوای گەورە

﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٨٠﴾ ﴾ (الأعراف: ١٨٠)

**واتە: بۆ خوای گەورەیە تەواوو جوانترینی ناوەکان. جا تەنها بەو ناوانە لێی بپاڕێنەوەو عیبادەت بکەن و واز لەوکەسانە بهێنن کە لە ڕاستێتی ناوەکانی لادەدەنو هاوبەشی بۆ پەیدادەکەنو ناوی تری لێ دادەتاشن. بەسزای کردەوەی خۆیان دەگەن[(١)]**

**وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت:** (( إنّ للّهِ تِسعةَ وَتِسعينَ إسماً، مَنْ أحصاها دَخَلَ الجَنّةَ )).[(٢)] **و في روايةٍ:** (( إنّ للّهِ تِسعةَ وَتِسعينَ

---

**(١ ) تفسير ابن كثير ٤٤٢/٢. وأنظر مجموع الفتاوى شيخ الأسلام١٤١/٦.**

**(٢) أخرجه البخاري: كتاب الدعوات(٦٤١٠) ومسلم: كتاب الذكر والدعاء (٣٦٧٧) . ئیبن القیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پلەکانی لەبەرکردنی ناوەکانی خوای گەورەی دیاری کردووەو فەرمویەتی: (پلەی یەکەم: لەبەرکردن و ژماردنی ناوەکان. دووەم: تێگەیشتن لە ماناو مەدلولەکانی. پلەی سێیەم: پاڕانەوە پێی، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلِلَّـهِ الْأَسْـمَاءُ الْحُسْـنَى فَـادْعُوهُ بِهَـا ﴾ ئەمیش دوو پلەیە: یەکەمیان پاڕانەوەی ستایش و پەرستش، دووەمیش: پاڕانەوەی داواکردن ، جا ستایشی خوا ناکرێت بە غەیری ناوە جوان و سیفاتە بەرزەکانی، هەروەها لێشی داوا ناکرێت بەو ناوو سیفاتانە نەبێت. هەر بۆیە نابێ بوترێت: ئەی بوون، ئەی زات، ئەی شت، لێم خۆشبەو ڕەحمم پێ بکە، بەڵکو لە هەموو پێویستییەکدا بە ناوێك دەپاڕێیتەوە کە گونجاو بێت لەگەڵ ئەو پێویستییەدا، بەمەش کەسەکە تەوەسول دەکات بۆ لای خوا**

إسـماً، مِائـةً إلاّ واحِـداً، لا يحفظُهـا أحـدٌ إلاّ دخَـلَ الجنـةَ، وَهُـوَ وِتـرٌ يُحبُّ الوِترَ)).

**واته: خوای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەیە لە سەد یەکی کەمە، هەر کەسێ بیـژمێرێت ولەبـەری بکـات (کـە ئەمـە وتـەی بوخـاری و زۆربەی زانایانە، وە ووتراوە لە ماناو مەدلولەکانی تێبگات، وە ووتـراوە ماناکـەی بزانـێو بـڕوای پێـی هـەبێت، وە وتـراوە تـا ئەتوانێ خۆی بەماناکەی بڕازێنێتـەوە ) دەچێتە بەهەشتەوە.وە خوای گەورە تاکەو تاکی پێخۆشە.**

**بەڵام زاناکان دەفەرموون خوای گەورە هەر ئەم نەوەدو نۆ ناوەی نییە و بەس، بەڵکو زیاد لە(١٥٠) ناویـان هێنـاوە لە قورئان و سوننەتدا، وە زیادەی دوای فەرموودەکە کـە ناوەکـانی هێنـاوەو ژماردوویـەتی و ئیمـامی الـترمـذی ڕیوایـەتی کـردووە لـە ئـەبی هــورەیرەوە( ڕەزای خــوای لێ بێــت) ضــەعیفــە وەك الحــافظ دەفەرموێت لـە (الفتح)دا(٢١٥/١١)، وە ئیبن تەیمیـە لـە (مجمـوع الفتـاوی)(٣٧٩،٣٨٢/٦) باسـی ئـەوە دەکـات کـە ئـەو زیادەیـە ووتــەی پێغەمبــەر(ﷺ) نییــە بــە هــاودەنگی شــارەزایان بــە فەرموودەکە، بەڵکو ئیمامی ترمذی لە هەندێ شێخی شامییەوە باسی کردووە.**

---

بەو ناوە، بۆ نمونە دەڵێ: (یاغفار) لێم خۆشبە هەر تۆ لێبوردەو بە بەزەییت، (یا رزّاق) رزقم بدە خۆت رۆزی دەرو بەخشندەیت...وە بەم جۆرە.../ بدائع الفوائد: ١٤٨/١.

## نەوەدو نۆ ناو لە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە

**الله:** پەروەردگارو پەرستراوی شایستەی پەرستراوێتی بەسەر هەموو دروستکراوەکانیەوە، کۆکەرەوەی مانای سەرجەم ناوە جوانەکان و سیفەتە بەرزەکانیەتی. بە ملکەچی و خۆشەویستییەوە دەیپەرستن.

**الأوّل:** سەرەتایەو پێش هەموو شتێکە بەبێ سنوورو سەرەتایەك نییە بۆ بوونی، هەموو شتەکان جگە لەو لە نەبوونەوە هاتۆتە بوون.

**الآخِر:** کۆتایەو دوای تیاچوونی دروستکراوان هەر دەمێنێت و کۆتایی بە بوونی نایەت، لە دوای هەموو شتێکەوەیە بە بێ کۆتایی، کۆتاو مەبەست و جێ نیازی دروستکراوانە.

**الظاهِر:** لەسەرو هەموو شتێکەوەیەو زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا. بەتواناو گەورەو ئاشکرایەو کەس لە سەروو ئەوەوە نییە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سیفەتەکانی گەورەیەو هەموو شتێك لە کەس و سیفات لە بەرامبەر گەورەیی ئەودا بچوکن.

**الباطِن:** بە چاوان نابینرێت بەلاّم لە خەڵکەوە نزیکەو ئاگاداریانە. زانایە بە ڕووی ناوەوەی شتەکان و ئاگادارو نزیکە بە شاراوەو نهێنییەکان.

**العَليّ:** بڵندە بە زاتی خۆی لەسەر مەخلوقاتەکانی و لەسەر عەرشە وە بە توانای خۆی بەرزو زاڵە بەسەریاندا. وە بە سیفاتی

بەرزەو سیفاتی تەواوو بی نوقسانییە و كەس لە سەروو ئەوەوە نییەو خاوەنی بڵندی و بەرزی یە.

**الأعلى:** لە هەموو بڵندو بەرزییەك بەرزترە، سیفەتەكانی بەرزترین سیفەتە، بەرزو گەورەیە.

**المُتَعال:** بەرزە بەسەر هەموو دروستكراوانییەوە بە زات و تواناو دەستەڵاتی، هەموو شتێك زەلیلە لە بەردەم بەرزی ئەوداو هیچ شتێك لەسەروی ئەوەوە نییەو هەمووی لە ژێر دەستەڵاتی ئەودایە. زۆر گەورەیە لە درۆی درۆزنان و پاكە لە وەسوەسەی سەرگەردانان.

**العَظِیم:** گەورەیەو خاوەنی گەورەیی و شكۆیە لە موڵك و دەستەڵات و هەموو شتێكدا، سیفەتی گەورەو تەواوی هەیەو كەس شیاو نییە وەك ئەو بە گەورە دابنرێت.

**المَجید:** بەخشندە فراوان و خاوەنی بەرزی و پلەو مەدح و ستایشەو خاوەنی سیفاتی تەواو گەورەو فراوانە، دروستكراوان ناتوانن سیفەتەكانی بژمێرن. وە كردار زۆرو فراوان و پڕ لە خێرو بەردەوامە.

**ألكَبِیر:** گەورەیە لە زات و سیفاتیدا، گەورەترە لە شویهاندنی بە مەخلوقات، گەورەترو بەرزترە لە هەموو شتێك.

**السّمیع:** زۆربیسەرە، هەموو شتێك دەبیستێت، بیستنی ئیحاطەی تەواوی دەنگی هەموو مەخلوقاتی داوە، هەموو دەنگەكان نهێنی و پەنهان بە جیاوازی زمانەكانی دەبیستێت و لێی تێكەڵ نابێت،

وە بیسەری وەڵامگۆی ئەو کەسانەیە کە دەپاڕێنەوەو داوای لێ دەکەن.

**البَصیر:** زۆر بینەرە، هەموو شتێك دەبینێت. بینینی ئیحاطەی هەموو بونەوەرو مەخلوقاتی داوە، بینینێك شایستەی گەورەیی خۆی بێت، بچوك و گەورەیان دەبینێت، بینەرو شارەزایە بە نهێنی شتەکان و جیهانی شاراوەکانیان.

**العَلِیم:** زانایەو زانستی ئیحاطەی هەموو شتەکانی داوە لە ئاسمانەکان و زەویدا، زانایە بە ئاشکراو نهێنی و رابووردوو ئێستاو داهاتوو ئەوەش کە نەبووەو ئەگەر ببوایە چۆن دەبوو هیچی لێ وون نابێت.

**الخَبیر:** ئاگادارەو زانستی ئیحاطەی داوە بەنهێنی و شاراوەی شتەکان، هەروەك چۆن ئاگادارە بە ئاشکراو ڕواڵەتیان.

**الحَمید:** سوپاسکراوە لەبەر زاتی بەرزو ناوی پیرۆزو سیفاتی بەرزو کردارە پڕ لە حیکمەتەکانی لە خۆشی و ناخۆشیدا، سەراپا دروستکراوان سوپاسی دەکەن. هەر ئەو شایەنی شوکرو سوپاسە.

**العَزیز:** هەموو دەستەڵات و عیززەتێ شایستەی ئەوە، بۆ ئەوە عیزەتی هێزو دەستەڵات، هیچ کەس لە مەخلوقات ناتوانێت دەستی بیگاتێ، بە گەورەیی خۆی دروستکراوانی ژێربارخستووەو ملکەچی کردوون و پێویستی بە کەس نییەو بێ فەرمانی ئەو هیچ نابێت.

**القَدِير:** زۆر بەتوانا، بەتوانای خۆی دروستکراوانی بەدیهێناوەو ڕێکی خستوون و توندوتۆڵی کردوون. ئەم ووشەیە لە (القادر) بەهێزترە.

**القـادِر:** بـە توانایـەو هیچـی لێ عاسـی و قـورس وگـران نییـە، بـە توانایە بە ویست و دەسـتەڵاتی خـۆی و مانـدووبوونی بەسـەردا نایەت.

**المُقْتَدِر:** زۆر بەتواناو دەستەڵاتە. ئەندازەی هەموو شتێك دەكات و دروستی دەكات بە گوێرەی زانیاری خۆی.

**القَوِيّ:** بەهێزو زاڵ و عەزیزە، كـەس زاڵ نـابێ بەسـەریداو كـەس ناتوانێت ڕەدی قەزاو بڕیاری بكاتەوەو كەس ناتوانێت لە دەستی هەڵبێت، هەرگیز لە كاتێك لە كاتەكاندا بێ دەستەڵاتی بەسـەردا نایەت. تەواوی هێزی ڕەهای هەیە.

**المَتِين:** خاوەنی هێزی توندو زاڵە، زۆر بەهێزەو هەرگیز هێزەكەی نابڕێـت و تـەواو نابێـت و لـە كردارەكانیـدا ماندوویـەتی بـەردا نایەت.

**الغَــنِيّ:** دەوڵەمەنــدە بــە زاتــی خــۆی. هــەموو دروســتكراوان موحتـاجی ئـەون، بـەڵام ئـەو هـیچ پێویسـتی بـە كـەس نییـە، دەوڵەمەندی تەواوو ڕەها لە هەموو ڕوویەكەوە بۆ ئەوە.

**الحَكِيم:** كاربەجێیـە لـە بـەدیهێنانی مەخلوقاتـدا، كاربەجێیـە لـە شەرع و فەرمانیدا و هەڵە ناكات، هیچ كارێك ناكات بە هەوانتەو بێ بوونی ماناو بەرژەوەندی و حیكمەتێك.

**الحَليم:** زۆر بە حیلمە لەگەڵ بوونی دەستەڵات و توانایدا، خێرا ناكات و بە پەلە نییە لە سزادانی بەندەكانیدا و مۆڵەتیان دەدات تا پەشیمان ببنەوە لە تاوان، لێبوردەو ئارامە نەفامێتی نەفامان و تاوانی تاوانباران تووڕەی ناكات، بەڵكو لێبووردەیە لەگەڵ توانادا و نیعمەتەكانی ناگرێتەوە لێیان.

**العَفُوّ:** لێخۆشبووە، گوناهان دەسڕێتەوەو لە گوناهباران دەبوورێت ئەگەرچی شایستەی سزان، لێبوردەیە لە كاتی ئەنجامدانی تاوانێك لە بەندەكانییەوە بە تایبەت ئەگەر كارێك ئەنجام بدەن ببێتە هۆكاری لێبوردن وەك پەشیمانی و استغفار.

**الغَفور:** گوناهپۆش و لێخۆش بووە، بەردەوام لە تاوان خۆش دەبێت و تەوبەی تەوبەكاران قبوڵ دەكات. وە سزای زۆر كەسیان نادات مادام هاوبەشی بۆ بڕیار نەدات.

**الغَفّار:** زۆر گوناهپۆشی بەندەكانێتی، نهێنی بەندە ئاشكرا ناكات تا خەڵكی ببینن و پەردەی لەسەر لانابات بەوەی سزای بدات و ئەو كەسە لەبەرچاویان ئاشكرابێت.

**التّوّاب:** زۆر تەوبە وەرگرە، بەردەوام تەوبەی تەوبەكاران وەردەگرێت و لە گوناهی پەشیمان بووان خۆش دەبێت، تەوبە وەرگرە بە تەوفیقدانی كەسەكە بەرەو تەوبەو دڵ وەرگێڕانیان بەرەو پەشیمانی، وە تەوبە وەرگرە دوای تەوبە كردنیان بە قبوڵ كردن و لە گوناه خۆشبوونیان.

**الرّقيب:** پارێزەری مەخلوقات و ئاگاداره بە چاوتروكاندن و ختوورەی دڵ و هەموو كردارەكان، ئاگاداره بەوەی لە دەروندا شاراوەیە، پارێزەری مەخلوقاتەو ڕایگرتوون لەسەر جوانترین و تەواوترین نیزام.

**الشّهيد:** ئاگاداره بە هەموو شتێك و هیچی لێ وون نابێت، ئاگادارو شاهیدە لەسەر كردارییان و پارێزەری ووتەكانیانەو ئاگاداره بە نهێنی و ووردەكاری كردەوەكانیان و هیچی لێ شاراوە نییە، شایەتی تەنهایی و دادپەروەری خۆیەتی و شایەتی ڕاستگۆیی ئیمانداران و پێغەمبەران و مەلائیكەتەكانەو شایەتە لەسەر كردەوەكانیان.

**الحَفيظ:** پارێزەری چاودێری كردەوەی بەندەكانە كە چییان كردووە لە چاكەو خراپەو هەمووی لە (لوح المحفوظ)دا نوسیوەو مەلائیكەتەكانی نوسەری لەسەر بەندەكان داناوە، هیدایەتدەرو پارێزەری بەندەكانە بە گشتی لەو زیانانانەی ناخۆشە لایان، بە تایبەتیش بەندەكەی دەپارێزێت لە تاوان و كوفرو تیاچوون و دوژمن. پارێزگاری لە دروستكراوانی دەكات بە دەستەڵاتی خۆی.

**اللّطيف:** بەبەزەییە، ئاگاداره بە ووردەكاری و نهێنی شتەكان، بە ڕەحمی بێ سنووری خۆی بەخشینی خۆی و بەرژەوەندی دەگەیەنێتە بەندەكانی لە ڕێگایانێكەوە كە ئەوان هەستی پێ

ناکـەن. بەنارەحـەتی تاقییـان دەکاتـەوە لـە کاتێکـدا ڕێگـای خۆشبەختیانی تیایەو نایزانن.

**القَريب:** نزیکە لە هەموو دروستکراوەکانیەوە بە گشتی بە زانست و ئاگـاداربوون و بینینـی بۆیـان، وە نزیکـە لـە ڕەگـی لامـل، وە نزیکییەکی تایبەت لە دوعاکاران و خواپەرستان ئەویش نزیکی خۆشویستن و سەرخستن و پشتیوانی و وەڵامدانەوەو گیرابوونی دوعایە. لەگەڵ ئەوەشدا لەسەرو عەرشی خۆیەوەتی و تێکەڵ بە دروستکراوەکانی نابێت.

**المـُجيب:** وەڵامـدەرەوەی پاڕانـەوەو داواکـاری و قبوڵکـاری پەرستشـی بەنـدە وەڵامدەرەوەکانیـەتی، دوعـاو داوای هـەموو کەسێك بە گشتی وەردەگرێت کە لێی بپارێتەوە، وە بە تایبەتیش پاڕانـەوەی کەسـی پـێگیراوو ئـەو کەسـانەی لـە کـات و شـوێنی گیرابووندا دەپاڕێنەوە وەڵام دەداتەوە.

**الوَدود:** خۆشەویستی خۆش ویستراو، پێغەمبەران و پیاوچاکان و بەنـدە بڕوادارەکـانی خۆشـدەوێت، ئـەوانیش تـەواوی خۆشەویسـتیان بـۆ ئـەوە، هـەروەها خۆشویسـتراوی شایسـتەی ئەوەیـە بـە تـەنها هـەموو خۆشەویستییەك بۆ ئـەو بێـت و بـەلای بەندەوە ئەوی لە هەموو خۆشەویستانی خۆشتر بووێت.

**الشّاكِر:** سوپاسکارە، کۆششی کردارێك لەبەر ئەو کرابێت بە زایە نادات بگرە زیـادی دەکـات، سوپاسـی زانسـتی پـاکی بەسـوودی کـەم دەکـات و لـە هەڵخلیسـکانی زۆر دەبوورێـت و پاداشـتی

کردەوەی چاك بە زایە نادات و زیادی دەكات بە بێ ژمارەو حیساب.

**الشَّكور:** شوكری بەندەكانی بە پاداشت وەڵام دەداتەوە، لە گوناهی زۆر دەبورێت و سوپاسی كرداری كەم دەكات و زیادی دەكات و قبوڵی دەكات و پاداشتی دەداتەوە.

**السَيِّد:** گەورەی دروستكراوان و سەردارو سەرپەرشتیارو خاوەن و نێوچەوان بەدەستی بەندەكانەو خاوەنی فەرماندانە، هەموو بەندەی ئەون، بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوەو كار بە فەرمانی ئەو دەكەن، بۆ چاوتروكانێكیش بێ نیازنین پێی.

**الصَّمَد:** جێنیازی سەراپای بوونەوەرو بەندەكانە، لە هەموو پێویستییەكانیاندا بە زەلیلی و هەژارییەوە موحتاجی ئەون، پەروەردگاری سیفات تەواوی گەورەیە، هیچ سیفەتێكی كەماڵیتی نیە ئیلا هەیەتی، ئەو دەڵەمەندەو هەموو بوونەوەر هەژارن بۆ لای ئەو.

**القاهِر:** سەراپا بوونەوەرو دروستكراوانی زەلیل و ژێربارخستووە، هەموو دروستكراوان گەردنكەچ و زەلیلی دەستەڵات و ویستی ئەون، هیچ شتێك نابێت بەبێ ئیزنی ئەو.

**القَهّار:** گەردنكەچكەری هەموو جیهانیانی سەروخوارە، بە تەنهایەو هەموو دروستكراوان گەردنكەچی عیززەت و هێزو توانای ئەون، بەندە خۆبەزلزانەكان گەردنكەچكردوە بەسزای و هەموو دروستكراوەكانی ناچاركردووە بە مەرگ و مردن.

**الجَبّار:** خاوەن موڵك و گەردنكەچكارو بەرزو بڵندی دوور لە نوقسانییە، بڵندە لەسەرو مەخلوقاتەوە، كاروبار چاككارە، گەردنكەچكەری بەندەكانیەتی لەسەر ئەو ئەمرو نەهییەی ئەو دەیەوێت، دڵی دڵشكاوان دەداتەوەو هەژاران دەوڵەمەند دەكات.

**الحَسِیب:** هەموو پێداویستی دونیاو قیامەتی بەندەكانی دابین كردووەو بەسە بۆ بەندەكانی بەگشتی لە بەدەستهێنانی سودو دوركەوتنەوە لە گرفت و زیانەكانیاندا وەبە تایبەتیش بۆ ئەوانەی پشتیان بەو بەستووە، وە پارێزەری كردەوەی چاك و خراپی بەندەكانەو زاناو ئاگادارە، پاداشتدەرەوەی چاكەو خراپەی بەندەكانە بە پێی حیكمەت و زانستی بە ووردەكاری كردەوەكانیان.

**الهادي:** ڕێنمایی كارو ڕێ پیشاندەری بەندەكانیەتی بەرەو هەموو جۆرە سوودمەندییەكان و دوورخستنەوەیان لە زیانەكان، ڕێنمایی كاری دروستكراوان و هیدایەتدانیانە بەرەو كاریان، هیدایەتی تەوفیق و ئیلهامیان دەدات بەرەو تەقوا.

**الحَكَم:** فەرمانڕەوایە لە نێوان بەندەكانیدا لە دونیاو قیامەتدا بە دادپەروەری، فەرمانڕەوایە بە هەق، فەرمانڕەوای بوونەوەری قەدەری و فەرمانڕەوای دینی و شەرعییە و قورئانی دابەزاندووە بۆ ئەوەی ببێتە حوكمێك لە نێوان بەندەكانیدا و فەرمانڕەوای پاداشت و سزایە لە قیامەتدا.

**القُدُّوس:** گەورەو پاکە لە هەموو عەیبێك، پاکە لە منداڵ و هاوەڵ، پاکە لە هەموو جۆرە خراپەو ناتەوای و کەموکوڕی و عەیبێك کە شایستەی ئەو نەبێت. تەنها ئەو کامڵەو وێنەی نییە.

**السَّلام:** پاك و سەلامەتە لە هەموو عەیب و نوقسانی و لێکچونی بە مەخلوقێك، چونکە لە زات و سیفات و کرداریدا تەواوە، وەسەرچاوەی سەلامەتی و ئەمینییە، هەرکەس بە دوای سەلامەتیدا بگەڕێت لە غەیری ئەو نایدۆزێتەوە.

**البَر:** چاکەکارە لەگەڵ دروستکراوەکانیداو کاریان چاك دەکات، چاکەکارە لەگەڵ چاکەکاراندا بە زیادکردنی پاداشت و لەگەڵ تاوانبارانیشدا بە لێبووردن، چاکەی زۆرە بەسەر مەخلوقاتەوەوە بە نیعمەتە ئاشکراو پەنهانەکانی.

**الوَهّاب:** زۆر بەخشندە، بەسەخاوەتەوە دەبەخشێت بە بێ پاداشت و وەهەق بۆ کردنەوەیەك لەبری شتێك، بەخشینی لە جۆرەکانی بەخششەکانیدا ڕەنگی دەداتەوەو هەموو بوونەوەی گرتۆتەوە بە بێ داواکردن و بە پێی حیکمەتی.

**الرَّحْمن:** بەڕەحمە، ئەمە سیفەتی زاتی خوایە، فراوانترە لە (الرحیم) بەرانبەر هەموو دروستکراوان لە دونیاو دوارۆژدا بە ڕەحمەو هاووێنەی نییە، دروستکراوانی دروستکردووەو ڕۆزیداون و لە موڵکیدا مۆڵەتی داون. ئەم ناوە تایبەتە بە خوای گەورەوەو نابێت کەس بەوەوە ناو بنرێت.

**الـرّحيم:** ئەمـە سـيفەتی فيعلـی خوايـە، بەڕەحمـە بەرانبـەر بـە ئيمانداران بە تايبەت لە دونياو قيامەتدا، هيدايەتی داون بەرەو يەكخواپەرستی و پەرستش و لە قيامەتدا ڕێزيان لێ دەگرێت بـە بەهەشت.

**الكَـــريم:** زۆر بەخشــندەو خــاوەنی چــاكەی زۆرە، نيعمـــەت دەبەخشێت بێ داوای هەق بۆ كردنەوە، لە گوناه خۆشدەبێت و تاوانبار دەپۆشێت، پاكە لە نوقسانی، بـە هـەمووان دەبەخشـێت بەبێ جياوازی.

**الأكَـرم:** سـيفەتی زاتـی خوايـە. لـە هـەموو كـەس بەخشـندەترە. سەرچاوەی خێرو زۆر چاكە كردنە، كەس لەسەرو ئەوەوە نييەو بێ نوقسانييە، كۆكەرەوەی چاكەو بەخشين و سوپاسـە، هـەموو چاكەو تەواوييەكی بێ ئەژماری تێدايەو هاوێنەی نييە.

**الـرَّؤوف:** قـوڵترو فـراوانترە لـە (الرحمـة)، بەبـەزەيی و بـە ڕەحمـە، نيعمەتــەكانی لــە هــەموو ڕوويەكــەوە چــێژلێوەرگيراوە، بــەڵام (الرحمــة) ئــەگونجێت لــە ئێســتادا ئــازاری لەگەڵــدابێت بــەڵام سەرەنجامەكەی چێژە.

**الفَتّاح:** دەرووكەرەوە، دادوەری نێوان بەندەكانييەتی بە هـەق و دادپەروەری، دەروكەرەوەی دەرگاكانی ڕەحمەت و رزق و دەرگا داخراوەكانـە لـە بەنـدەكانی، سـەرخەری ئيمانـداران و سـتەم لێ كراوانە.

**الـرّازق:** زۆر ڕۆزی دەرە بـە گشـتی بـۆ هـەموو زینـدەوەران بـە گەیاندنی هەموو پێویستییەکی بژێوو ژیان، ئەندازەی بۆ داناوە پێش دروستکردنیان. وە بە تایبەتیش ڕۆزی بەسوودو بەردەوام لـە دونیـاو قیامەتـدا، ڕۆزی دەری دڵانـە بـە زانسـت و ئیمـان، وە لاشە بە حەڵاڵ.

**الـرّزّاق:** ڕۆزی دەری ڕاگـری هـەموو نەفسـەکانە بـە ڕۆزیـدانیان، ڕۆزی دان و بەزەیی هەموو دروستکراوانی گرتۆتەوەو کەسیانی تایبەت نەکردووە پێی.

**الحَـي:** زیندووی تەواوو بەردەوام و هەرماوە کە هەرگیز مردن و نـەمانی بەسـەردا نایـەت، سـەرەتاو کۆتـایی نییـە، تـەواوی ژیـان هـەموو سـیفەتە زاتییـەکانی خـوای گـەورە لـە خۆدەگرێـت، وەك زانست و عیززەت و تواناو ویسـت و گـەورەیی... تـەواوی ژیـان ئەو دەیبەخشێت.

**القَیّوم:** ڕاوەستاوە بە زاتی خۆی. سیفەت بەرزە، ڕاگری خۆیەتی و پێویستی بـە مـەخلوقات نییـە، وە ڕاگـرو تـەدبیرکاری زەوی و ئاسمانــەکان و ســەراپای بوونــەوەرو دروســتکراوانەو هــەموو پێویستیان بەوە، لە دروستکردن و فەرمان کردن و ڕێکخستنی.

**الـرَّبّ:** پەرسـتراوو خـاوەن و متصـرف و پـەروەردگاری هـەموو بەندەکانــە بــە سەرپەرشــتی کــردن و تــەدبیرکردن و هــەموو جۆرەکانی نیعمەت بەسەردا ڕژاندن، بە تایبەتیش پەروەردگاری ئیماندارانە بە چاککردنی دڵ و ڕۆح و ڕەوشتیان.

**المَلِك:** خاوەن و متصرفی ڕەها لە دروستکردن و فەرمان و سزادا، خاوەنی ئەمرو نەهییە، کەس لەسەرو ئەوەوە نییە، خاوەنی هەموو شتەکانەو موتەسەریفە تیایدا بەبێ بەرهەڵستی، بوونەوەر هەموو موڵکی ئەوە، هەموو بەندەو خاوەن پێویستین بەو، خاوەنی فەرمان و نەهی کردنە.

**المَلِيك:** پاشای گەورەو دروستکەری بەدەستەڵات و خاوەنی ڕەهایە.

**الواحِد:** یەك، تاکی گەردنکەچکەرە، هەموو شتەکان ژێربارخراوی گەورەیی و توانای ئەون.

**الأحَد:** تەنهایە لە هەموو گەورەیی و جوانی و تەواوەتییەکدا، تەنهایە لە پەروەردگارێتی و پەرستراوێتی دا، بێ هاووێنەو هاوەڵە لە موڵکیداو بەرهەڵست و مونازعی نییە.

**المُتَكَبِّر:** خاوەنی گەورەیی و دەستەڵات.پاك لە هەموو خراپەو ناتەواوی یەك، خۆبەگەورەگرە بەسەر بەندە سەرکەشەکانیدا کاتێ لە گەورەییدا ڕکابەری و مونازەعەی دەکەن و پشتیان دەشکێنێت، خۆگەورەگرە لە ستەم کردن لە بەندەکانی و لە سیفەتی مەخلوقاتی، گەورەو مەزنەو هەموو شتێك جگە لەو بچوکە.

**الخالِق:** داهێنەرو بەدیهێنەری دروستکراوانە لەسەر وێنەیەك کە پێشتر نەبووە، تەقدیری کردووە پێش بەدیهێنان.

**الخَـــــلاّق**: زۆر دروســـــتكارو بەدیهێنـــــەرە، مـــــەخلوقات و بـەدیهێنراوەكانی زۆرن، لـە سـاتێكدا بـە ملیۆنـەها مـەخلوقات دێنێتە بوون.

**البارِيء**: بەدیهێنەرو داهێنەرە لـە نەبوونـەوە، دروستكراوەكانی جیاكردۆتەوە لەیەكتر لە شێوەیاندا، مرۆڤیشـی لـە گڵ دروست كردووە.

**المُصوِّر**: شێوەكێشی ئەو شتەیە كە دەیەوێت بەدیبهێنێت لەسەر ئەو شێوەو سیفەتەی ویستی لێیەتی بە پێی حیكمـەتی خۆی، شـێوەدارێژو وێنەكێشـی هـەموو دروسـتكراوێكە لەسـەر ئـەو وێنەیەی كە لەسەری بـەدیهێناوە، هـەر دانـەو لەسـەر وێنەیـەكی تایبەت بە خۆیان.

**المُـؤمِن**: بـە ڕاسـت دانـەری دڵنیاكـارو ئـەمینكارە، ڕاسـتی خـۆی دەســـەلمێنێ و ستایشـــی خـــۆی دەكـــات بـــە یەكپەرســـتراوی و سیفاتی، وە بەراسـت دانـەری پێغەمبـەران و شـوێنكەوتوانیانەو بەڕاســـت دانـــەری بەنـــدە ئیماندارەكانیـــەتی لـــە قیامەتـــدا، دروستكراوەكانی ئەمین دەكاتەوە لە ستەم لێ كردنیان، وە ئەمین بەخشە بە ئیمانداران لە دونیاو قیامەتدا.

**المُهَیمِن**: ئاگاداری زانای چاودێرە بەسەر بەندەكانییەوە لەوەی كە دەیڵـــێن و دەیكـــەن لـــە نهێنـــی و شـــاراوەیاندا، زاڵ و سەرپەرشتیكارو هەڵسوڕێنەری كارو ئەجەلی بەندەكانییەتی.

**المُحيط:** ئاگادارو زانایە، تواناو بینین و بیستن و ڕەحمەت و دەستەڵاتی سەراپا دروستکراوەکانی گرتۆتەوەو ئیحاگەی داوە، بە زانستی ئیحاگەی هەموو شتێکی داوەو هەموو شتێکی ژمارە کردووە.

**المُقيت:** بژێوگەێن، بژێوی گەیاندۆتە هەموو دروستکراوەکان و ڕۆزی داون بە حیکمەت و ستایشی خۆی بەڕێی کردوون، ئاگادارو بە تواناو پارێزەرە بەسەریانەوە.

**الوَكيل:** خاوەن و چاودێرو سەرپەرشتیارو هەڵسوڕێنەری کاری دروستکراوەکانیەتی بەگشتی بە زانست و دەستەڵات و توانای تەواوو حیکمەتی فراوان لە بەدیهێناناو ڕۆزی دان و ژیان ومردنیان، وە بە تایبەتیش سەرپەرشتیارو پارێزەرو پشتیوانی دۆستانیەتی بەرەو چاکە ڕێیان بۆ ئاسان دەکات و دەیانپارێزێت، وە هەرکەس بە وەکیلی بزانێت دەیپارێزێت.

**الكافي:** سەرپەرشتیارو پارێزەری بەندەکانە بە گشتی بە ڕۆزیدان و سەرپەرشتیکاری کارو پێویستیانە، وە تایبەتیش بۆ ئیمانداران و ئەوانەی پشتیان پێی بەستووە بە چاودێری کردن و توفیق دان و سەرخستنیان.

**الواسِع:** سیفات فراوان، گەورەیی و دەستەڵات و موڵك و چاکەوفەزڵی فراوانە، ڕۆزی دانی سەراپا دروستکراوەکانی گرتۆتەوە، بەزەیی هەموو شتێك و دەوڵەمەندکردنی هەموو هەژارێکی گرتۆتەوە.

**الحَقّ:** حەقە لەزات و سیفاتی دا، بوونی حەقەو بێ گومان و زانـــراوەو ســـیفاتی تـــەواووە، حەقـــە لـــە پـــەروەردگارێتی و پەرستراوێتی و کرداریدا، پەرستنی حەقەو پەیمانەکانی حەقە.

**الجَمیل:** جوانە لە زات و ناوو سیفات و کردارەکانیدا، هەموو جوانی دروستکراوەکانی لەوەوەیە. هیچ عەبدێك ناتوانێت تەعبیر لە هەندێ لە جوانییەکانی ئەو بکات.

**الرَّفیق:** بەبەزەیی و هێدی و نەرم و لەسەرخۆیە لە کردارەکانی و لە شەرعی دا، دروستکراوانی دروستکردووە بە پلەپلەیی بە پێی حیکمەتی لەسەرخۆی خۆی.

**الحَیي:** بەشەرمە بەو جۆرەی شایستەی ئەو بێت، دوورە لەو شـــتانەی گونجـــاو نییـــە لەگـــەڵ فراوانـــی ڕەحـــم و فراوانـــی بەخشندەیی و گەروەیی لێبوردنیدا، لە تەواوی دەستەڵات و بەخشندەییەوە شەرم دەکات عەبدەکەی فەزح بکات، یان سزای ئەو کەسە بدات مووی سپی بووە لە ئیسلامدا، یان دەستی دوعاکار بە بەتاڵی بگەڕێنێتەوە.

**السَّتیر:** فەزحی بەندەکەی ناکات لە کاتی تاوان کردنیانداو پـــەردەی داپۆشـــین دەدات بەســـەریدا، عـــەیب پۆشـــی و فـــەزح نەکردنی پێخۆشە.

**الإلـه:** پەرستراوی شایستەی پەرستن، هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت بە هەق جگە لەو، بە خۆشەویستی و

گەڕانەوەو بە گەورەگرتن و لێ ترسانەوە دەپەرسترێت.کۆکەرەوەی سیفەتە بەرزەکانیەتی. بنچینەی ناوی(الله)یە.

**القـــابِض:** بــە دادپـــەروەری و پێــوان رزق و ڕۆزی و نـــەفس و ڕۆحەکان دەگرێتەوەو تەسکی دەکاتەوە لەسەر ئەو کەسەی خۆی ویستی بێت بە حیکمەتی خۆی.

**الباسـِط:** فراوانکـاری ڕزق و رۆزی و ڕەحمـەت و دڵەکانـە، رزق ورۆزی فـراوان دەکـات لەسـەر ئـەو کەسـەی خـۆی ویسـتی بێـت. دەرگای تەوبەی کراوەیە بۆ تاوانباران.

**المُعطي:** بە ڕەحم و حیکمـەتی بەخششـە بـێ سنوورەکانی خـۆی دەبەخشێت، گرەوە نییە لەوەی ئەو دەیبەخشێت و بەخشەر نییە لـەوەەی ئـەو دەیگرێتـەوە، لـە دنیـادا بـە گشـتییەو بەخششـی فراوانـەو هـەموو بـێ بـاوەڕو ئیمانـدارێکی گرتۆتـەوە، بـەڵام لـە قیامەتدا تەنها بە ئیمانداران دەبەخشێت.

**المُقـدِّم:** پێشـکەوتووی پێشخەرە(سـیفەتی زاتـی و کردارییە)بـە حیکمـەتی خـۆی پێشـخەرە لـە دروسـتکردنی مەخلوقاتـداو بـە شەرعیش وەك پێشخستنی و فەزڵدانی پێغەمبەران و هەندێك لە عەبدەکانی بەسەر هەندێکی تریاندا بە رەحمەتی خۆی.

**المُؤَخِّر:** (سیفەتی زاتی و کردارییە) کۆتایەو دواخەری ئەو شتەیە کە ویستی لێیەتی بـە توانـاو ویسـت و حیکمـەتی خـۆی. سـزای بەندەکانی دوا دەخات هەتا تەوبە بکەن.

**المُـبين:** ڕۆشـن و ئاشـكراى ڕۆشـنكەرەوەیە، بـوون و تـەنهایی لـە پەروەردگارێتی و پەرسـتراوێتی و نـاوو سـیفاتیدا، لـە ڕوانگـەی بەڵگەكانــەوە ڕوون و ئاشــكراو دیــارە، ڕۆشــنكەرەوەی ڕێگــای هیدایەت و ئەحكامەكان و ئەو كردارانەیە كە بەندەكان شایستەی پاداشت و سزا وەرگرتن ئەبن لەسەری.

**المَنّــان:** زۆربەخشــندە، بەخششــەكانی زۆرە، بــە بــێ داواكــردن نیعمـەتی خـۆی دەبەخشـێت، ژیـان و عـەقڵ و بیسـتن و بیـنین و ڕواڵـەت و نیعمــەت و لــەش ســاغی و ئــەمن و رزق و هیدایــەتی بەخشـیوە، منـەتكردنی بەسـەر مەخلوقاتـدا تـەواوی نیعمـەت و چێژو لەزەتی تێدایە.

**الــــوَلي:** سەرپەرشـــتیارو پـــارێزەری كاروبـــاری بونـــەوەرو دروستكراوانە لە هەموو كاروباریاندا بەندەكان ڕووی تێ دەكەن بــە عیبــادەت و چــاكەكردن، وە ســەرخەرو پشــت و پــەناوی ئیمانداران‌ـە بـە تایبـەت لـە تاریكییەكانـەوە دەریـان دێنێـت بـۆ ڕووناكی، وە پشتیوانییان دەكات بە تەوفیق دان و سەرخستن و سەرپەرشتی كاری پاداشت و سزایانە لە قیامەتدا.

**المَــــولى:** خـــاوەن و ســـەردارو دروســـتكاری مـــەخلوقات و سەرپەرشتیارو پەرستراوی بە هەقیانە، خۆشەویست و پشتیوان و سەرخەرو تەوفیقدەری ئەوانەیە كە گوێڕایەڵی دەكەن.

**النَّصــیر:** ســەرخەرو پشــتیوانی بەنــدە ئیماندارەكانییــەتی، ســەرخەری ئەوانەیــە شــەرعەكەی جێبــەجێ دەكــەن و دینەكــەی

سەردەخەن و پشتیوانیان دەکات و هۆکارەکانی سەرکەوتن و دامەزراویێتیان پێ دەبەخشێت.
**الشّافي:** شیفادەری ڕاستەقینەی نەخۆشیەکانی دڵ و لاشەیە، شیفادەری مەعنەوەی و ڕۆحییە لە نەخۆشییەکانی دڵ و گومان ئارەزوو، وە شیفادەری ماددییە لە نەخۆشییەکانی لاشە. شیفاش تەنها لای ئەوە.
**مالِكُ المُلك:** خاوەنی هەموو موڵك، تەواوی موڵکی دونیاو قیامەت هی ئەوە، پاشاو هەڵسوڕێنەرو تەدبیرکاری هەموو دروستکراوانی ئاسمان و زەویە، بە کردارو فەرمان بەڕێوەی دەبات.
**جامِعُ النّاس:** کۆکەرەوەی خەڵك و کردەوەو ڕۆژییانە، مردوانی پەرتەوازەو ڕزیوو پرتوکاوی سەرەتاو کۆتایی دونیا بە تواناو دەستەڵات و زانستی فراوانی کۆدەکاتەوە لە ڕۆژی دواییدا. وە پاداشتی کرداری چاك و خراپیان دەداتەوە.
**نُورُ السَّموات والأرض:** ڕووناك کەرەوەی ئاسمانەکان و زەوییە، هەموو تاریکییەکان و جیهان سەراپا بە نووری ڕووی ئەو ڕۆشن بووەتەوە، دڵ و ڕۆحەکان بەو نوورەی ئەو ناردویەتی (کە قورئان و سوننەتە) ڕۆشن دەبێتەوە.
**ذو الجَلالِ والإكرام:** خاوەنی گەورەیی و مەزنی و ڕەحمەت و بەخشش و چاکەیە بە گشتی بۆ دروستکراوان، وە بە تایبەتیش ڕێزگیراوی ڕێزگری ئیماندارن و دۆستانی و ئەو کەسانەیە

بەگەورەی دەگرن و خۆشیاندەوێت. خاوەنی چاکەو نیعمەتی زۆر.

**بَدیعُ السَمواتِ والأرضِ:** دروستکارو بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە لەو پەڕی جوانی و سەرنجڕاکێشی و نیزامی سەرسووڕهێنەرو پتەوی دا.(٣)

---

(٣) بڕوانە مانای ئەم ناوانەو چەندان ناوی تر لەگەڵ بەڵگەکانیان لەقورئانو سوننەتدا لە کتێبی (شرح الأسماء الحسنى في ضوء الكتاب والسنة)ی سعید بن علی بن وهف القحطاني، وە بڕوانە (معالم التوحيد)ی د.مروان ابراهيم القيسي..المكتب الآسلامي. وە کتێبی (ولله الأسماء الحسنى)ی شیخ عبدالعزیز ناصر الجليل.

## بەشی دووەم:

# مانای ( زیکر ) و چەند تێبینی یەك

مانای زیکر: هەر ووتەیەکە کە ستایش و پاڕانەوەی تێدا بێت، واتە پەرستشێکی گوفتارییەو بە گەورەگرتن و ستایشی خوای گەورەی تێدایە بە ناوو سیفاتەکانی، بە گەورەگرتن و بە تەنها پەر ستنی وە سوپاس و بەگەورەگرتنی، یان بە خوێندنەوەی قورئانەکەی، یان بە داواکردن و پاڕانەوە لێی.[٤]

کەواتە زیکر: بریتییە لە دەربڕینی چەند ووشەیەك بە دەم یان لەدەروون دا بەو شێوەیەی کە خوای گەورە پاشان پێغەمبەرەکەی(ﷺ) ڕێیان پێداوەو تیایدا بە گەورە زانین و پاك ڕاگرتن و ستایش کردن و یادکردنی پەروەردگاری تێدایە. وە بەندە لەسەری پاداشت وەردەگرێتەوەو تای تەرازووی چاکەکانی پێ دەوڵەمەندو قورس دەکات، وە بەهۆیەوە لە دنیاشدا دەپارێزێ لە شەیطانو خراپە .

ابن حجر(ڕەحمەتی خوای لێ بێت)فەرمویەتی: مەبەست بە زیکر لێرەدا وتنی ئەو لەفزانەیە کە هاندان هاتووە لەسەر وتنی و زۆر دوبارەکردنەوەی بە نمونەی الباقیات الصالحات کە بریتییە لە (سُبْحانَ اللهِ وَالحَمدُ للهِ وَلا إلَـهَ إلاّ اللهُ وَاللهُ أَكْبَر) ئەوانەی تریش کە

---

(٤) انظر: الموسوعة الفقهية٢١/٢٢٠، والفتوحات الربانية١/١٨.

وەك ئەون لە: (الحَوقَلة وَالبَسمَلة وَالحَسبَلة وَالإستِغفار) و لەو جۆرانە و پاڕانەوەی چاکەی دونیاو قیامەت.
هەروەها زیکری خوا بەکاردەهێنرێت بە مەبەستی بەردەوامی لەسەر کردەوە واجب و دیاری کراوەکانی وەك خوێندنەوەی قورئان و فەرموودەو فێربوونی زانست و نوێژی سوننەت.
پاشان زیکر هەندێك جار بە زوبان دەوترێت و کەسەکەش پاداشتی لەسەر وەردەگرێت، وە مەرج نی یە کە دەبێت ماناکەی بهێنێتەوە بیری خۆی، بەڵام مەرجە غەیری ئەو مانایەی مەبەست نەبێت کە هەیەتی، خۆ ئەگەر لەگەڵ وتنی زاردا دڵیشی لەگەڵدا بێت ئەوە تەواوترە. ئەگەر لەگەڵی دا مانای زیکرەکەی بهێنێتەوە بیری خۆی وە ئەوەش کە لەخۆی گرتووە لە بەگەورەگرتنی خوای گەورەو نەفی کردنی نوقصانی لێی ئەوا زیاتر تەواوترە. خۆ ئەگەر ئەو زیکرە لە کردەوەیەکی چاکی فەرزدا بێت وەك نوێژ یان جیهاد یان غەیری ئەمانە زیاتر تەواوترە...[٥]
کەواتە ئەو زیکرەی کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووەو ستایشی زیکرکەرانی کردووەو باسی لە پاداشتی خێراو دواخراوی کردوون: لە کاتی بە ڕەها ناوهێنانیدا هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە لە خوای گەورەت نزیك دەکاتەوە لە: بیروباوەڕ، یان بیرکردنەوەی بەسوود، یان ڕەوشتی جوان، یان

---

(٥) فتح الباري – ابن حجر – دار المعرفة (١١/ ٢٠٩)

کردەوەی دڵ یان لاشە، یان ستایش کردنی خوای گەورە یان تەسبیح و هاووێنەکانی، یان فێربوونی ئەحکامە ئوصولی و فەرعییەکانی شەرع، یان هەر زانستێك یارمەتی دەر بێت بۆ ئەوانە، هەموو ئەمانە دەچنە ناو بازنەی زیکری خوا.(٦)

جا زیکر کردن بەشێکە لە عیبادەت و بگرە لە چاکترینی پەرستشەکانەو هیچ عیبادەتێکیش وەگیراو نابێت هەتا دوو مەرجی تێدا نەیەتە جێ:

١- لەبەرخوا بێت و مەبەست و نیاز تێیدا تەنها ڕەزامەندی خوا بێت.

٢- بە پێی شەرعی خوا بێت و لەسەر بەڵگە ئەنجام بدرێت. نەك بە پێی هەواو داهێنراو. وە ئەگەر بەم شێوەیە نەبێت ئەوا یان حەرامە یان مەکروهە، وە تیایاندایە شیرکەو زۆر کەسیش هەستی پێ ناکات.

کەواتە بۆ هیچ کەسێك نییە جۆرە زیکرێکی دیاری کراو دابهێنێت (نە لەچۆنییەتیداو نە لە ژمارەیدا) و خەڵکی پابەند بکات پێوەی، چونکە لە زیکرە شەرعییەکاندا هەموو ئەم لایەنە پڕ کراوەتەوەو کەسیش پشت لەمە ناکات و بچێت بۆ لای زیکری داهێنراو جگە لە نەفام یان بە زایەدەر یان سنوور بەزێن..(٧)

---

(٦) تفسير السعدي١/٩٤٥.

(٧) بڕوانە درێژەی ئەم ووتەیەی شێخی ئیسلام ابن تەیمیە(رحمه الله) لە: مجموع الفتاوی٢٢/٥١٠.٥١١.

**بزانە کە قورئان زیکرە و گەورەترین زیکرە، خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ﴿١٢٤﴾ ﴾. (طه: ١٢٤)

**واتە: ئەوەیش ڕوو وەربگێرێت لە بەرنامە و یادی من پشتی تێ بکات، بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی ترش و تاڵ و ناخۆش پێش دێت، لە ڕۆژی قیامەتیشدا بەکوێری حەشری دەکەین.**

**وە نوێژ کردن زیکرە:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٩﴾ ﴾.(الجمعة:٩)

**واتە: ئەی ئەوانەی باوڕتان هێناوە کاتێ کە بانگ درا بۆ نوێژ لە ڕۆژی هەینیدا، ئێوە بە پەلە بچن بەدەم یادی خواوە و واز لە کڕین و فرۆشتن بهێنن، چونکە ئەو کارەتان چاکترە بۆتان ئەگەر بزانن و تێبگەن.**

**هەروەها پاڕانەوەو صڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) زیکرەو فێرکردنی خەڵکی لە زانستی شەرعی زیکرەو زۆربەی هەڵس و کەوتەکانی تری ڕۆژانەش زیکری تایبەتی هەیە.**

**١- هەموو زیکرێك تەواونییە تا بە زوبان نەوترێت و دەرنەبڕدرێت بەجۆرێك خۆی بیبیستێ ئەگەر بیستنی تەواو بوو.**

٢- یادکردن(ذِكر)ی خوای گەورە بەدڵ و زوبان چاکترە لە یادکردنی خوا تەنها بەدڵ، وە یادکردنی خوا تەنها بەدڵ چاکترە لە یادکردنی خوا تەنها بە زوبان، وە پێویستە کەسی زیکرکەر مانای ئەو زیکرانە بزانێو داڵغەی لەلای بێ.

ئیبن القیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: چاکترین و بە سوودترین جۆری زیکر ئەوەیە کە دڵ و زمان بەشداربن تیایداو لە زیکرەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بێت و ئەو کەسەی زیکردەکە دەکات ئاگای لە ماناو مەبەستەکەی بێت.[٨]

٣- زۆر جار چاك وایە لەکاتی زیکرکردندا ببپچرێتو دوایی بچێتەوە سەری لەبەر چەند هۆیەکی گرنگ. وەکو وەڵام دانەوەی سڵاوکەرێك یان یەکێك پژمی و ووتی (الحمد لله) پێویستە وەڵامی بداتەوە بە (یَرحَمُكَ الله) یان وەڵام دانەوەی تەلەفۆن...

٤- لەش گرانو ئافرەتی بێنوێژو زەیستان (الحائضَة والنفساء) دەتوانی بەدڵو زوبان زیکر بخوێنێو جائیزە وەکو تەسبیحاتو پاڕانەوە....

٥- خوێندنی قورئان ئەگەر ئایەتێك یان چەند ئایەتێك بێت دروست نییە لەسەر لەش گرانو ئافرەتی بێنوێژو زەیستان. بەڵام ئەگەر زیکرێکی دەخوێندو لە زیکرەکەدا ئایەتێك یان زیاتری تێدابوو ئەوە دروستە بەمەرجێ مەبەستی سوننەتەکە بێت.

---

(٨) الفوائد ص٢٤٧.

٦- زیکرکردن له هەموو کاتێکدا چاکەو جائیزە تەنها لەچەند کاتێکی شازدا نەبێت، وەکو کاتی سەرئاوکردن یان کاتی جیماع یان کاتی گوێگرتن له وتاری هەینی یان کاتی خەواڵویی.

٧- ئەگەر دەمت پاك نەبوو ئەوا بەئاو پاکی بکەرەوە. وە ئەگەر تامی گۆڕابوو ئەوا بەسیواك پاکی بکەرەوەو ئینجا زیکر بخوێنە، چونکە زیکرکردن یان قورئان خوێندن بەدەمی ناخاوێنەوە مەکروهە بەڵام حەرام نییە، وە لە شوێنێکی پاك و بە دەست نوێژەوەو بەشێوەیەکی خشوع دانیشە ئەگەر کرا .

٨- زیکری خوا له هەموو حاڵەتێکی لەشداو بەهەموو شێوەیەك جائیزە. ئەگەر بەوەستانەوە بێت یان دانیشتن یان ڕاکشاوی یان بەرێگاوەو بەڕۆیشتن یان بەسواری، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ ..﴾.(آل عمران: ١٩١)

واتە: ئەوانەی یادی خوا دەکەن لەکاتێکدا کە بەپێوەن یان دانیشتوون یان ڕاکشاوون (لە هیچ حاڵەتێکدا یادی ئەو زاتە فەرامۆش ناکەن).

٩- ئەگەر بۆ کاتێك یان شوێنێکی دیاری کراو چەند زیکرێك هاتبوو لە فەرموودەی صەحیح دا: ئەوا چاك وایە هەرجارەو یەکێکیان بووترێ، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) وای کردووە. وە چاك وایە خوو نەگرین بە دانەیەکیانەوە. تا لە خێرو پاداشتی هەموویان بێبەش نەبین.

## بەشی سێیەم:

# پاڕانەوە ( الدُّعاء )

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ٦٠ ﴾ (الغافر: ٦٠)

**واتە: خوای پەروەردگارتان فەرمانتان پێدەکات بە پاڕانەوەو بەڵێنی داونەتێ بە وەڵام دانەوەی. ئەوانەی لە پەرستش و پاڕانەوە لێم و یەکتاپەرستی من یاخین ئەچنە دۆزەخەوە بە بێڕێزی و سەرشۆڕی و ڕیسوایی.**

**وە دەفەرموێت:** ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌۖ أُجِيبُ دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لِي وَلۡيُؤۡمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمۡ يَرۡشُدُونَ ١٨٦ ﴾ (البقرة:١٨٦)

**واتە: ئەگەر بەندەکانم پرسیاریان لێکردی لە بارەی منەوە ئەوە من نزیکم لێیانەوە، وەڵامی پاڕانەوەیان دەدەمەوە ئەگەر لێم بپاڕێتەوەو داوا بکات، دەبا ئەوانیش وەڵامی فەرمانەکانی من بدەنەوەو باوەڕی تەواوم پێبێنن بۆ ئەوەی ڕێگای ڕاست بدۆزنەوە.**

**پێغەمبەریش(ﷺ) دەفەرموێت:** (( الدُّعاءُ هُوَ العِبادَةُ وَقالَ رَبُّكُمُ ﴿ادعُوني أستَجِبْ لَكُم﴾ )).[9]

**واتە: پاڕانەوە پەرستشە. پەروەردگارتان دەفەرموێ: لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە.**

**وە دەفەرموێت (ﷺ):** (( إنّ رَبَّكُم تَبارَكَ وَتَعالى حَيِيٌ كَريمٌ يَستَحي مِن عَبْدِهِ إذا رَفَعَ يَدَيهِ إليهِ أن يَردَّهُما صِفراً ))[10]

**واتە: پەروەردگاری پاك و بەرزی ئێوە بەشەرم بەڕێزە شەرمی لێ دێت کاتێك بەندەیەکی هەردوو دەستی بۆ بەرزبکاتەوە و بپاڕێتەوە کە بەبێ ئومێدی و بە بەتاڵی بگەڕێنێتەوە.**

**وە دەفەرموێت (ﷺ) :** (( ما مِنْ مُسلمٍ يَدعُو اللّهَ بدَعوةٍ ليسَ فِيها إثمٌ وَلا قَطِيعةُ رَحِمٍ إلاّ أعطاهُ اللّهُ بها إحدَى ثلاثٍ: إمّا أنْ تَعَجَّلَ لَهُ دَعْوَتُهُ.وَإمّا أنْ يَدَّخرها لهُ في الآخرةِ. وَإمّا أنْ يَصرِفَ عَنْهُ مِنَ السُّوءِ مِثلَها. قالوا: إذاً نُكْثِرَ. قالَ: أللّهُ أكثَر )).[11]

---

**(٩) أبو داود ٧٨/٢ والترمذي ٢١١/٥ و ابن ماجه ١٢٥٨/٢ و بڕوانە صحيح الجامع الصغير ١٥٠/٣ وصحيح ابن ماجه ٣٢٤/٢ .**

**(١٠) أخرجه أبوداود ٧٨/٢ والترمذي ٥٥٧/٥ وابن ماجه ١٢٧١/٢ وقال ابن حجر: سنده جيد. وە بڕوانە صحيح الترمذی ١٧٩/٣.**

**(١١) الترمذي ٥٦٦/٥ و ٤٦٢/٥ وأحمد ١٨/٣ وانظر صحيح الجامع ١١٦/٥ وصحيح الترمذي ١٤٠/٣.**

واتـــه: هـــيچ موســڵمانێك نییــه كــه بپاڕێتــەوە لــەخوای گــەورە بەداواكارییەك كەتاوانو بێ بەزەیی نەبێت ئیلا خوای گەورە یەكێك لەم سێ شتەی دەداتێ:

١- یان پاڕانەوەكەی بۆ پێش دەخاتو گیرا دەبێت.

٢- یان بۆی هەڵدەگرێ بۆ پاداشتی قیامەت.

٣- یـــان بەئەنـــدازەی پاڕانەوەكـــەی خراپـــەو بـــەڵای لیـــدوور دەخاتەوە. وتیان: كەواتە زۆر دەپاڕێینەوە. ئەویش فەرمووی: خوای گەورە زۆرتر پاداشتتان پێ دەبەخشێ.

## لە ئادابەكانی پاڕانەوەو هۆكانی وەڵام دانەوەی[١٢]

١- تەنها خوای گەورە مەبەست بوون(الإخلاص).

٢- دەبـێ بەسـوپاسو ستایشـی خـوای گـەورەو صـڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) دەست پێ بكات .

٣- جەزم كردن لەپاڕانەوەو بڕوابوون بەوەڵام دانەوەی.

٤- ســــووربونو دووبارەكردنــــەوە (إلحــاح) لەپاڕانـــــەوەداو پەلەنەكردن. واتە نەڵێت پاڕامەوەو گیرا نەبوو .

٥- ئامادەبونی دڵ لەكاتی پاڕانەوەدا.

٦- پاڕانەوە لە كاتی خۆشی و ناخۆشی و تەنگاوی و پێگیراندا.

---

(١٢) بڕوانە ئەم ئاداب و هۆكانی وەڵام دانەوانە لەگەڵ بەڵگەكانیاندا لە(الذكر والعلاج من الكتاب و السنة) لاپەڕە ٨٨-١٢١ .

**٧- جگە لەخوای گەورە لە کەس نەپاڕێتەوە.**

**٨- نەپاڕانەوە لەکەس‌و کارو سامان‌و منداڵ‌و خۆت بەخراپە .**

**٩- دەنــگ نــزم کردنــەوە لــەکاتی پاڕانــەوەدا لــە نێــوان پەنهان‌وئاشکرادا.**

**١٠- دان نان بەتاوان‌و داواکردنی لێخۆشبوون لە خوا لێی‌و دان نان بەنیعمەت‌و سوپاس کردنی خوای گەورە لەسەری.**

**١١- زۆر لەخۆنەکردن لەرێکخستنی سـەروا لـە پاڕانـەوەدا** (عَدَم تَكلّف السّجع).

**١٢- کوڕوزانەوەو خشوع‌و ئومێدو ترسان لەخوای گەورە.**

**١٣- گەڕاندنەوەی مافی ستەم لێ کراوان لەگەڵ تەوبەدا.**

**١٤- سێ بارە کردنەوەی پاڕانەوەکە .**

**١٥- ڕووکردنە ڕووگە**( القِبْلة ).

**١٦- دەست بەرزکردنەوە لە پاڕانەوەدا.** [١٣]

---

(١٣) بۆ شێوازەکانی دەست بەرز کردنەوە لەپاڕانەوەدا:

عن ابن عباس( رضى الله عنهما ) أنّ النبي(ﷺ) قال: (( المَسألَةُ أن تَرفَعَ يدَيكَ حَـذوَ مَنكبَيكَ أو نَحوَهما، و الإستغفارُ أن تُشيرَ بِأصبعٍ واحِدةٍ، و الإبتِهالُ أن تَمُدَّ يَدَيكَ جميعـاً)). أخرجهُ أبوداود(١٤٨٩-١٤٩١). وصححه العلاّمة الألباني في صحيح سنن أبي داود (رقم:١٣٢١، ١٣٢٢، ١٣٢٤) موقوفاً ومرفوعاً. وفي صحيح الجامع برقم(٦٦٩٤).

واتە: بۆ داواکردن و پاڕانەوەی شتێك لە چاکە، یان دوور بوون لە خراپەیەك هەردوو دەستت تا ئاستی شانەکانت یان نزیکی بەرز دەکەیتەوە، وە بۆ داوای لێخۆشبوون کردن لە خوای گەورە بە یەك پەنجە( کە پەنجەی شایەتمانە) ئاماژە دەکەیت، وە بۆ کاتی زۆر ناڕەحەتی و سەغڵەتی و پەرێشانی هەردوو دەستت درێژ دەکەیت.

## ١٧- دەست نوێژ شتن پێش پاڕانەوە ئەگەر گونجا.

## ١٨- سنوور نەشکاندن لە پاڕانەوەدا (واتە نەپاڕانەوە بە شتی ستەم ومەحاڵ ودەنگی بەرز یان قوڵکردنەوەی مەسەلەیەك).[(١٤)]

---

**تێبینی:**

(ابن باز)(ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێت) دەفەرموێت: (دەست بەرزکردنەوە لەپاڕانەوەدا سوننەتەو یەکێکە لەهۆکانی گیرابوونو وەڵام دانەوەی.. بەڵام سوننەت نیە کەدەست بەرز بکرێتەوە لەو شوێنانەدا کەلەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بەرز نەکراوەتەوە، وەکو دوعای دوای نوێژە فەرزەکانو نێوان هەردوو کوڕنوشەکەو پێش سەلاودانەوەی نوێژو کاتی ووتاردانی ڕۆژی هەینیو جەژنەکان.چونکە پێغەمبەر(ﷺ) لەو کاتەدا دەستی بەرزنەکردۆتەوە. بەڵام ئەگەر دوعای باران بارین (الاستسقاء)ی کرد لەخوا لەووتاری ڕۆژی هەینی یان دوو جەژنەکەدا ئەوا ئەتوانێ دەست بەرز بکاتەوە. هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) کردویەتی. بەڵام بۆ نوێژی سوننەت ئەوا هیچ ڕێگرێك نازانم لەبەرزکردنەوەی دەست لەپاڕانەوەی دوای نوێژەکەدا. بەبەڵگەی کارکردن بەهەموو دەلیلەکان. بەڵام باشتر وایە بەردەوام نەبیت لەسەر ئەمە. چونکە ئەمە لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) نەهاتووە کە کردبێتی. خۆ ئەگەر بیکردایە لەدوای هەموو نوێژە سوننەتەکانەوە ئەوا هاوەڵان بۆیان نقلێ دەکردین چونکە هاوەڵان هەموو ووتارو کردەوەکانی پێغەمبەریان(ﷺ) لەسەفەرو مانەوەیو لەهەموو کاتەکانیدا بۆ گەیاندوین ـ خوای گەورە لەهەموویان ڕازیبێت). بڕوانە کتێبی (فتاوى مهمة تتعلق بالصلاة) لاپەڕە ٤٧ ـ ٤٩..

(١٤) ابن حجر(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (سنور بەزاندن لە پاڕانەوەدا بەوە دەبێت: دەنگ زیاد لە پێویست بەرز بکاتەوە، یان داوای شتێك بکات کە شەرعەن ڕوودانی مەحاڵ بێت، یان داوای تاوان بکات، یان بە شتێك بپاڕێتەوە کە لە شەرعدا نەهاتبێت بە تایبەت ئەوانەی کەراهەتی لەسەر هاتووە وەك زۆر لەخۆ کردن بۆ ڕێکخستنی قافیەی پاڕانەوەکەو وازهێنان لەوەی فەرمان کراوە پێی). فتح الباری١٣/٥٥.

**١٩- دەبێ دوعاکەر لە پێشدا بپاڕێتەوە بۆ خۆی پاشان ئەگەر ویستی بۆ غەیری خۆی بپاڕێتەوە.** (١٥)

**٢٠- دەبێ تەوەسول بکات بۆ لای خوا بەناوە جوانەکانیو سیفەتە بەرزەکانی یان بەکردەوەیەکی چاك کەدوعاکەر خۆی ئەنجامی دابێت یان بە پاڕانەوەی پیاوچاکێکی زیندووی ئامادە کە بۆی بکات.**

**٢١- دەبێ خواردنو خواردنەوەو پۆشاکی حەڵاڵ بێت.**

**٢٢- نابێ بپاڕێتەوە بەتاوان یان بێبەزەیی.**

**٢٣- دەبێ فەرمان بکات بەچاکەو بەرگری بکات لەخراپە.**

**٢٤- دوورکەوتنەوە لە هەموو جۆرە یاخی بوونێکی خوای گەورە.**

---

(١٥) چەسپاوە لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) کەسەرەتا بەخۆی دەستی بەپاڕانەوە کردووە. وەهەروەها چەسپاویشە کەبەخۆی دەستی پێنەکردووە وەکو پاڕانەوەی بۆ: (أنس وابن عباس وأم اسماعيل و غەیری ئەوان) وەبڕوانە درێژەی ئەم مەسەلەیە لەشەرحی نەوەویدا بۆ ( صحيح مسلم ) (١٤٤/١٥) وە(تحفة الاحوذي) شەرحی (سنن الترمذي) ٣٢٨/٩ والبخاري مع الفتح ٢١٨/١. چەسپاوە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) کەسەرەتا بەخۆی دەستی بەپاڕانەوە کردووە. وەهەروەها چەسپاویشە کەبەخۆی دەستی پێنەکردووە وەکو پاڕانەوەی بۆ: (أنس وابن عباس وأم اسماعيل و غەیری ئەوان) وەبڕوانە درێژەی ئەم مەسەلەیە لەشەرحی نەوەویدا بۆ ( صحيح مسلم ) (١٤٤/١٥) وە(تحفة الاحوذي) شەرحی (سنن الترمذي) ٣٢٨/٩ والبخاري مع الفتح ٢١٨/١.

# چەند کات و شێوازو شوێنێك کە پاڕانەوەی تیادا وەڵام دەدرێتەوە [١٦]

١- شەوی قەدر.

٢- کۆتای نیوەی شەو.

٣- لەپاش هەموو نوێژە فەرزەکانەوە. [١٧]

٤- لەنێوان بانگ‌و قامەتدا.

٥- کاتێك لەهەموو شەوێکدایە.

٦- لەکاتی بانگ دان بۆ نوێژە فەرزەکان.

٧- لەکاتی باران بارینددا.

٨- لەکاتی تێك ڕژانی سوپاکان لەپێناوی خوادا.

٩- کاتێـك لـە ڕۆژی هـەینی دایـە: کـە زانایـان چـەندین ڕاو بۆچوونیان هەیە سەبارەت بەم کاتـە. وە ڕاستترین ووتـە لەمـەدا ئەوەیە کە کۆتایی کاتە لەکاتەکانی عەسری ڕۆژی هەینی،[١٨]

---

(١٦) بڕوانـە ئـەم کـات‌و شـێوازو شـوێنانە لەگـەڵ بەڵگـەکانیان بەدرێـژی لـە(الـذکر و الدعاء و العلاج بالرقى من الكتاب والسنة) لاپەڕە ١٠١ ، ١١٨ . جگە لە خاڵی ٤٠ .

(١٧) ابـن تەیمیـە( ڕەحمـەتی خـوای لێ بێـت) ئامـاژە بـەوە دەکـات کـەوا پێغەمبـەری خوا(ﷺ) فەرمانی کرد بەمەعاذ کە لە پاش هەموو نوێژەکانەوە بڵێ: (( اللَّهُمَّ أعِنِّي علـى ذِكـرِكَ وشُـكرِكَ وحُسـنِ عبادتِـكَ )) وە باسـی ئـەوە دەکـات کـە(دُبر الصلاة) واتای‌پێش سڵاودانەوەیەو مانای دوای تەواو بوونی نوێژەکەش دەگەیەنێ.

(١٨) وەك ئیبن قەیم ئەمەیانی تەرجیح کردووە لە زاد المعاد (١/٣٩٠ ـ ٣٩١).

**وه واردیش بووه كه ئەگونجێ لەو نێوانەدا بێت كه ئیمام لە كاتی ووتاردانەدا دائەنیشێ تا نوێژەكە تەواو دەبێ.**[19]

**١٠- لەكاتی خواردنەوەی ئاوی ( زەمزەم ) لەگەڵ نیەتێكی ڕاست دا.**[20]

**١١- لە كوڕنوش دا (السجود).**

**١٢- لەكاتی بەخەبەرهاتن لەشەوداو پاڕانەوە بە سوننەتی(مَأثور)ی ئەوكاتەدا.**

**١٣- ئەگەر لەسەر پاكێتی (دەست نوێژ) خەوت و پاشان لەشەودا بەخەبەرهات و پاڕایەوە .**

**١٤_ لەكاتی پاڕانەوەدا بە:** (( لا إلهَ إلاّ أنتَ سُبْحانَكَ إنّي كُنْتُ مِنَ الظالِمينَ )).

**١٥- پاڕانەوەی خەڵكی لەپاش مردنی كەسێك.**

**١٦- پاڕانەوە لەدوای ستایشی خواو صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لەتەحیات دا .**

**١٧- لەكاتی پاڕانەوە لەخوا بەو ناوە گەورەیەی** (الإسمُ الأعظَم) **كە ئەگەر هەركەسێك پێی بپاڕێتەوە وەڵام دەدرێتەوەو ئەگەر داوای پێ بكرێ پێی دەبەخشرێ.**[21]

---

(١٩) وە هەردوو ڕایەكە فەرمودەی صەحیحی لەسەرە بەڵام پلەی صەحیحی فەرمودەكانی ڕای یەكەمیان بەهێزترە. والله اعلم .

(٢٠) ( لەكاتی نەخۆشیدا دەخورێتەوە بەڵام بۆ دوعاكردن لەم كاتەدا بەڵگەم نەدیوە لەسەری ) م.عبدالكريم.

١٨- **پاڕانەوەی موسڵمان بۆ برا موسڵمانەکەی بەپەنهانی.**

١٩- **پاڕانەوە لەڕۆژی عەرەفەدا لەعەرەفە.**

٢٠- **پاڕانەوە لەمانگی ڕەمەزان دا.**

٢١- **لەکاتی کۆبوونەوەی موسڵمانان‌دا لەکۆڕی زیکردا.**

٢٢- **پاڕانەوە لەکاتی بەڵاو موسیبەت دا بەووتنی:** (( إنّا للهِ وإنّا إليهِ راجعونَ اللَّهُمَّ اجُرْني في مُصيبَتي وأخلِف لي خيراً مِنْها )).

٢٣- **پاڕانەوە لەکاتی ڕووکردنی دڵ بۆلای خوای گەورەو تاوسەندنی دڵسۆزی و تەنها خوای گەورە مەبەست بوون**(الإخلاص).

٢٤- **پاڕانەوەی ستەم لێکراو لەو کەسەی ستەمی لێ کردووە.**

٢٥- **پاڕانەوەی باوك لە کوڕەکەی بەچاکەو خراپە.**

٢٦- **پاڕانەوەی گەشتیار** (المُسافر).

٢٧- **پاڕانەوەی ڕۆژووەوان هەتا بەربانگ دەکاتەوە.**

٢٨- **پاڕانەوەی ڕۆژووەوان لەکاتی بەربانگ کردنەوەدا.**

٢٩- **پاڕانەوەی ناچارو لێ قەوماوو پێگیراو.**

٣٠- **پاڕانەوەی پێشەوای دادپەروەر.**

٣١- **پاڕانەوەی کوڕی چاکەکار لەگەڵ دایك‌و باوکیدا.**

٣٢- **پاڕانەوە لەدوای دەست نوێژ ئەگەر پاڕایەوە بە سوننەتی**(مأثور)**ی ئەوکاتە.**

---

(٢١) بڕوانە ناوە گەورەکەی خوای گەورە لە لاپەڕە(٢٧-٢٨) لەم نامیلکەدایە.

**٣٣- پاڕانەوەی دوای ڕەجم کردنی** (الجَمرةُ الصُّغری).

**٣٤- پاڕانەوەی دوای ڕەجم کردنی** (الجَمرةُ الوسطی).

**٣٥- پاڕانەوە لەناو کەعبەدا. هەرکەس نوێژی کرد لەناو**(الحِجر)**دا ئەوا هەر بە**(البَیت) **حسابە.**

**٣٦- پاڕانەوە لەسەر (صەفا).**

**٣٧- پاڕانەوە لەسەر (مەروە).**

**٣٨- پاڕانەوە لەلای** (المَشعَرُ الحَرام)**دا.**

**٣٩- ئەو کەسەی لە جیهاددایە لە پێناوی خوای گەورەدا.**

**٤٠- ئەو کەسەی لە حەج یان عەمرەدایە.**

**وە بڕوادار هەردەم لە پەروەردگاری خۆی دەپاڕێتەوە لە هەر شوێنێکدا بێت. خوای گەورە دەفەرموێت:**

**﴿ وإذا سألَكَ عِبادي عَنيّ فإنّي قَريبٌ اُجيبُ دَعوَةَ الدّاعِ إذا دَعانِ... ﴾، بەڵام ئەم کات و شوێن و شێوازانە پێویستی یان بە چاودێری و گرنگی پێدانی زیاتر هەیە.**(٢٢)

---

(٢٢) بۆ مەبەستی زیاتر شارەزابوون بڕوانە (الدعاء ویلیه العلاج...) لا ٦ - ١٧.

## ناوە گەورەکەی خوای پەروەردگار( إسمُ اللهِ الأعظَم )

١- (( اللَّهُمَّ إنّي أسأَلُكَ بأنّ لَكَ الحَمْدُ. لآ إلهَ إلاّ أنْتَ (وَحدَكَ لا شَريكَ لَكَ) المنّان (يا) بَديعَ السّمواتِ وَالأرض. ياذا الجَلالِ والإكرام. يا حَيُّ يا قَيّوُم. إنّي أسأُلُكَ (الجَنةَ وأعُوذ بِكَ مِنَ النّار))).[٢٣]

**واتە: خوایە من دەپاڕێمەوە و داوات لیدەکەم بەوەی کەسوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە. هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لەتۆ، تەنهای بێ هاوەڵی، خاوەنی فەزڵ و منەتی. ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی. ئەی خاوەن پایەی بەرزو ڕێز. ئەی زیندووی مشوورگێڕی هەڵسوڕێنەری بوونەوەر. من داوای بەهەشتت لیدەکەم و پەنات پیدەگرم لەئاگری دۆزەخ.**

٢- (( اللَّهُمَّ إنّي أسأُلُكَ بأنّي أشْهَدُ أنَّكَ أنتَ اللهُ لا إلهَ إلاّ أنتَ الأَحَدُ. الصّمَدُ. الّذي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَد. وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أحد )).[٢٤]

**واتە: خوایە من داوات لێ دەکەم بەوەی کەمن شایەتی دەدەم کەتۆ ئەو خوایەیت کە هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لەتۆ. تەنیای**

---

**(٢٣) أبوداود ٢/٨٠ وابن ماجه ٢/١٢٦٨ والنسائي ٣/٥٢ والترمذي ٥/٥٥٠ وە بڕوانە صحيح النسائي١/٢٧٩.**

**(٢٤) أبوداود ٢/٧٩ والترمذي ٥/٥١٥ وابن ماجه ٢/١٢٦٧ وأحمد ٥/٣٦٠ وە بڕوانە صحيح السنن الترمذي ٣/١٦٣.**

**جێـی مەبەسـتی. ئـەو خوایـەی کەکەسـت لێ نـەبوەو لەکـەس نەبوویتو کەس هاوشێوەی تۆ نی یە.**

**٣-** (( رَبِّ اغفِرلِي. وَتُبْ عَليَّ إنّكَ أنْتَ التَّوّابُ الغَفُور )) .[٢٥]

**واتە: پەروەردگارم لـێم خـۆش ببـەو تۆبـەم لی وەرگـرە، بەڕاسـتی هەرتۆ تەوبە وەرگری لێ بووردەی .**

---

**(٢٥) أبوداود. والترمذي واللفظ له. والنسائي وابن ماجه ١٣٥٣/٢. وه بڕوانه صحيح ابن ماجه ٣٢١/٢ وصحيح الترمذي ١٥٣/٣.**

**تێبینی/ له کۆتایی فەرمودەکەدا هاتووە: ((....بەو ناوە گەورەکەی خوا پاڕایەوە کە هەرکەسـێك پێـی بپاڕێتـەوە وەڵام دەدرێتـەوەو ئەگـەر داوای پـێ بکرێـت پێـی دەبەخشرێت)).**

**الطيبي (رحمـه الله) فەرمويـەتی: (بەڵگـەی ئـەوەی تێدایـە کـە خـوای گـەورە نـاوێکی گەورەی هەیە ئەگەر کەسێك بەو ناوە لێی بپاڕێتەوە وەڵام دەدرێتەوە).**

**الشوكاني (رحمه الله) فەرمویەتی: (له بارەی دیاری کردنی ئەو ناوە کە ئاخر کامەیە زانایان جیاوازن و لەم بارەیەوە چل بۆچوون هەیە. وە السيوطي نوسراوێکی تایبەتی لەسەر هێنانی ئەو ڕایانە داناوە. ابن حجر (رحمه الله) فەرمویەتی: (ڕاجیحترینیان لە ڕووی سەنەدەوە بریتییە لە ووتنی: الله لا إله إلا هو الأحد الصمد، الذي لم يلد ولم يولد، ولم يكن له كفواً أحد).... الجزري (رحمه الله) فەرمویەتی: (بەڕای من الاسم الأعظم ئەمەیە: لا إله إلا هو الحي القيوم). ئيبن القيم فەرمويـەتی بریتییـە لـە (الحـي القيـوم)/ انظر تحفة الذاكرين ص ٧٩-٨٠.**

**بەشی چواردەم**:

# فەزڵ و گەورەیی( زیکر ) کردن

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ ﴾ (البقرة: ١٥٢)

**واتە: ئەی ئیمانداران زیکر و یادم بکەن، منیش یادتان دەکەم و سپڵەیی و بێ باوەڕی مەکەن بەرامبەرم.**

**وە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:** (( مَثَلُ الَّذي يَذكُرُ ربَّهُ وَالّذي لا يَذكُرُ ربَّهُ مَثَلُ الحَيِّ والمَيّت )).[(٢٦)]

**واتە: نمونەی ئەو کەسەی کە یادی پەروەردگاری دەکات و ئەوکەسەی کەیادی پەروەردگاری ناکات وەکو نمونەی زیندوو مردوو وایە.**

**وە دەفەرموێت(ﷺ):** (( ما مِن قومٍ يَقومونَ منْ مَجلِسٍ لا يَذكرونَ الله فيه، إلاّ قاموا عَن مِثلِ جيفةِ حِمار وَكان لَهُم حَسرةً )).[(٢٧)]

---

(٢٦) **البخاری مع الفتح ٢٠٨/١١(٦٤٠٧) ومسلم** به لفظی: (( مَثَلُ البَيتِ الّذي يَذكُرُ الله فيه والبيتِ الّذي لا يَذكُر الله فيهِ مَثَل الحَيّ وَالمَيّت )) **٥٣٩/١برقم(٧٧٩)**

**واتە: نمونەی ئەو ماڵەی یادی خوای تێدا دەکرێتو ئەو ماڵەی یادی خوای تێدا ناکرێ وەکوو نمونەی زیندوومردوو وایە.**

(٢٧) **أبوداود ٢٦٤/٤ برقم(٤٨٥٥) وأحمد ٣٨٩/٢ بڕوانە صحيح الجامع ١٧٦/٥ برقم(٥٧٥٠) .**

**واتە: هەر کۆمەڵێك لەمەجلیسێك هەستن و یادی خوایان نەکردبێ تیایدا. ئەوا وەکو ئەوە وایە کە لەسەر لاکی گوێ درێژێك هەڵسن و لەڕۆژی دوایی دا دەبێتە پەشیمانی بۆیان.**

**وە دەفەرموێت**(ﷺ): (( ألا أُنَبّئكُم بِخَير أعمالِكُم. وأزكاها عِنْدَ مَليكِكُم. وأرفَعِها في درجاتِكُم، وَخَيرٍ لَكُم مِن إنفاقِ الذَّهَبِ والوَرَقِ. وَخَيرٍ لَكُم من أن تَلقَوا عَدوَّكُم فَتَضْرِبُوا أعناقَهُم وَيَضرِبوا أعناقَكُم؟ قالوا بلى. قال: (ذِكرُ اللهِ تعالى) ))(٢٨).

**واتە: ئایا هەواڵتان بدەمێ بەچاکترینی کردەوەکانتان و پاکترینیان لەلای خوای گەورەتان و بەرزترینیان لەپلەتانداو چاکتر لەپەخشینی ئاڵتون و زیوو. وەچاکتر لەوەی کەبگەن بەدوژمنەکەتان و بدەن لەگەردنیان و بدەن لەگەردنتان؟ ووتیان: بەڵێ فەرمووی: یاد (زیکر)کردنی خوای گەورە.**

**وە دەفەرموێت** (ﷺ): (( ما جَلَسَ قَومٌ مَجْلِساً لَمْ يَذكرُوا اللهَ فيهِ. وَلَمْ يُصَلّوا عَلَى نبَيّهِم إلاّ كانَ عَلَيهِم تِرَةٌ. فإنْ شآءَ عَذّبَهُم وَإنْ شآءَ غَفَرَلَهُم))(٢٩).

**واتە: هیچ کاتێك کۆمەڵێك دانانیشن لەمەجلیسێکدا کە زیکری خوای تێدا نەکەن و صەڵاواتیان تیایدا نەدابێ لەسەر پێغەمبەرەکەیان(ﷺ) ئیلا دەبێتە ناتەواویی و پەشیمانی بۆیان، ئەگەر خوای گەورە ویستی بێت سزایان دەدات ( لەسەر کەمتەرخەمییان) و ئەگەر ویستی بوو(بە فەزڵ و ڕەحمەتی خۆی) لێیان خۆش دەبێ.**

---

(٢٨) الترمذي ٥/٤٥٩ برقم(٣٣٧٧) وابن ماجه ٢/١٢٤٦ برقم(٣٧٩٠) وە بڕوانە صحيح ابن ماجه ٢/٣١٦ وصحيح الترمذي ٣/١٣٩.

(٢٩) الترمذي برقم(٣٣٨٠). وە بڕوانە صحيح الترمذي ٣/١٤٠.

## بەشی پێنجەم:

# لە هەڵس و کەوتە دووبارە بووەکانی ڕۆژانە

# هەستان لە خەو[30]

١- (( أَلحَمدُ للهِ الّذي أَحْيانا بَعْدَ ما أَماتَنا وَإليهِ النُّشُور )).[31]

**واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ژیاندینییەوە دوای ئەوەی کە مراندینی(مەبەست بە مراندنێکی مەجازییە کە خەوتنە) وە زیندوبونەوەش هەر بۆ لای ئەوە.**

**٢- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: هەرکەسێك بەشەو بەخەبەر هات بڵێ:** (( لا إلهَ إلاّ اللّهُ وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ. لهُ المُلكُ ولَهُ الحَمْدُ وهوَ عَلَى كُلِّ شيءٍ قَدير. سُبحان اللهِ والحَمدُ للهِ وَلا إلهَ إلاّ اللّهَ، وَاللهُ أَكبرُ. وَلا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلاّ باللهِ العَليِّ العَظِيم ))

**واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە(الله). تەنهایەو بێ هاوەڵە. هەموو موڵك و سوپاس و ستایشێك هەر بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە. پاکی و بێ عەیب و ناتەواوی هەربۆ خوایەو سوپاس بۆ خواو هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە(الله) وەخوا گەورەترە لە هەموو شتێك و هیچ گۆڕان و هێزێك نییە مەگەر بە ویست و پشتیوانی خوای بەرزی مەزنەوە. پاشان بپاڕێتەوەو بڵێ (ربِّ اغفِرلي) پەروەردگارم گوناهەکانم بپۆشە.**

---

(٣٠) لەبەیانیدا بۆ نوێژی بەیانی نەك شەو.

(٣١) البخاري مع الفتح ١١٣/١١ برقم(٦٣١٢) ومسلم ٢٠٨٣/٤برقم(٢٧١١).

**(خوا لێی خۆش دەبێت) وەلید دەفەرموێت: یان فەرمووی:**

**( ئەگەر بپاڕێتەوە وەلامی دەدرێتەوەو ئەگەر هەڵسێتو دەست نوێژ بشۆریو پاشان نوێژ بکات نوێژەکەی وەردەگیری) .**[(٣٢)]

**٣-** (( ألحَمْدُ للهِ الّذي عافانِي في جَسَدِي وَرَدَّ عَلَيَّ رُوحي وَأذِنَ لي بذِكرِهِ)).[(٣٣)]

**واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە لەش ساغی کردم و پاراستمی لە نەخۆشی و بەلا و ڕۆحی بۆ گەڕاندمەوەو یارمەتی دام و کارئاسانی بۆ کردم تا زیکرو یادی بکەم.**

**٤- خوێندنی سورەتی**(آل عمران) **لە ئایەتی(١٩٠-٢٠٠):**

﴿ إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَـَٔايَـٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَـٰذَا بَـٰطِلًا سُبْحَـٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَـٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ

---

**(٣٢) البخاري مع الفتح ٣/٣٩ برقم(١١٥٤) وغيره واللفظ لابن ماجه برقم(٣٨٧٨) بروانة صحيح ابن ماجه٢/٣٣٥.**

**(٣٣) الترمذي ٥/٤٧٣ برقم(٣٤٠١) وانظر صحيح الترمذي ٣/١٤٤.**

ٱلۡمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾ فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ
أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي
سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن
تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾ لَا يَغُرَّنَّكَ
تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ ثُمَّ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ
ٱلۡمِهَادُ ﴿١٩٧﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ
خَٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ ﴿١٩٨﴾ وَإِنَّ مِنۡ
أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَمَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِمۡ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ
لَا يَشۡتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۗ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡۗ إِنَّ
ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿١٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ
وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾ ﴾.(٣٤)

## ٥- خوێندنی هەردوو سورەتی (الفلق) و (الناس).(٣٥)

---

(٣٤) البخاري مع الفتح ٢٣٧/٨ برقم (٤٥٧٢) ومسلم ٥٣٠/١ برقم(٧٦٣) .

(٣٥) پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: (ئەی عوقبە ئایا چاکترین دوو سورەتێکت فێر بکەم کە خوێنرابێت: ﴿ قل أعوذ برب الفلق﴾ و ﴿قل أعوذ برب الناس﴾، ئەی عوقبە هەرکاتێك نوستی و هەستایت لەخەو بیخوێنە، هیچ دوعاکارو پەناگرێك داوای نەکردووەو پەنای نەگرتووە بە شتێك هاووێنەی ئەم دووانە بێت). حسنه الألباني في صحيح الجامع برقم(٧٩٤٨)، وانظر صحيح وضعيف الجامع الصغير (٤٠٨/٢٨) برقم(١٣٩٠٨).

# پێش خەوتن[٣٦]

**١- ( ئەگەر چووە ناو جێگەی نوستن دەستی بدات لەیەك و پاشان فووی پێدابكات و سورەتی:**

﴿ قُلْ هُوَ اللهُ أَحَد﴾ و ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الفَلَق ﴾ و ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النّاس ﴾ **ی پیادا بخوێنێ .**

**پاشان دەستی بهێنێ بەسەر ئەو شوێنەدا ئەتوانێ لە لەشی. وە لەسەری لەگەڵ دەم و چاوی و پێشەوەی لەشییەوە دەست پێ بكات، وە ئەمە سێ بارە بكاتەوە).[٣٧]**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ۝٣ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ۝٤ ﴾

---

**(٣٦) عن أبي الأحوص قال: قال عبد الله: (النوم عِنْدَ الذِّكْرِ من الشيطان. إن شئتم فجربوا إذا أخذ أحدكم مضجعه وأراد أن ينام فليذكر الله عز وجل). قال الألباني: صحيح موقوف. أنظر الأدب المفرد بالتعليقات (٢٨٢/١- ٢٨٣) برقم (١٢٠٨)(ث٣٢٩).**

**واتە: خەو داگرتن لە كاتی زیكر كردندا لە شەیطانەوەیە، ئەگەر حەز دەكەن تاقی بكەنەوە بەوەی كاتێ یەكێك لە ئێوە چووە ناو جێگەی نوستنی و ویستی بخەوێت، با یادی خوای گەورە بكات.**

**(٣٧) البخاري مع الفتح ٦٢/٩ برقم(٥٠١٧) ومسلم ١٧٢٣/٤ برقم(٢١٩٢)، چونكە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەموو شەوێك ئاوای دەكرد.**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ۝١ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ۝٢ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ۝٣ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِي ٱلۡعُقَدِ ۝٤ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ۝٥ ﴾.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ۝٢ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ۝٣ مِن شَرِّ ٱلۡوَسۡوَاسِ ٱلۡخَنَّاسِ ۝٤ ٱلَّذِي يُوَسۡوِسُ فِي صُدُورِ ٱلنَّاسِ ۝٥ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ۝٦ ﴾.

**٢- (( ئەگەر چویتە سەر جێگاکەت ( آيـةَ الكُرسـي ) بخوێنەو تەواوی بکە. چونکە پارێزەرێکت لەلایەن خواوە لەگەڵدا دەبێت و شەيطان نزيكت ناکەوێتەوە تا بەيانی )).(٣٨)**

أعوذ باللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرّجيم

﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ۝٢٥٥ ﴾. **(البقرة: ٢٥٥)**

---

**(٣٨) البخاري مع الفتح ٤/٤٨٧ برقم(٢٣١١) .**

**٣- (( هەركەسێ دوو ئایەتی كۆتایی سورەتی(البقرة) بخوێنی لە شەودا ئەبێتە پاراستن بۆی و بەسیەتی )).[٣٩]**

أعوذ باللهِ مِنَ الشيطانِ الرّجيم

﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ٢٨٥ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٢٨٦﴾. (البقرة: ٢٨٥-٢٨٦)

**٤- ﴿ قُلْ يا أيّها الكافرونَ ﴾ بخوێنە چونكە بۆت دەبێتە (بەرائەت لە شيرك).[٤٠]**

---

**(٣٩) البخاري مع الفتح ٩٤/٩ برقم(٤٠٠٨) ومسلم ٥٥٤/١ برقم(٨٠٨).**

**(٤٠) لە( فروەی كوڕی نوفل ) ەوە هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خــوا شـــتێكم فێربكــە كــە چــوومە ســـەر جێگاكـــەم بیڵـــێم. ئـــەویش فەرمووی...فەرموودەكە) رواه الترمذي وابوداود وقد صححه الالباني في صحيح السنن الترمذي ١٤٥/٣. وفي صحيح سنن أبي داود ٩٥٣/٣ - ٩٥٤ رقم(٥٠٥٥) وَ فِيهِ: عن فروة بن نوفل عن أبيه. وە زیادەیەكی لەگەڵە لە( سنن أبی داود)دا ئەویش ئەمەیە: (پاشان بە كۆتایی پێهێنانی بنوو، چونكە بۆت دەبێتە بەرائەت لە شيرك).**

**واته: ڕزگار بوون یان قوتار بوون له هاوبەشی پەیدا کردن(وه سوود بەخشه بۆ یەکتاپەرستی).**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١ لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ٢ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ مَّا عَبَدتُّمۡ ٤ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ٥ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ٦﴾

**٥- ( ئەگەر لەسەر جێگاکەت هەستایت و گەڕایتەوه سەری. سێ جار بە لوێچێکی کراس و جلەکەت جێگاکەت بتەکێنە. وه ( بِسْمِ اللهِ) بکه چونکه تۆ نازانی دوای خۆت چی تێ چووه له زیندەوەرو شتی زیان بەخشن وه که ڕاکشایت بڵێ:**

(( بِاسـمِكَ رَبّـي وَضَـعْتُ جَنبـي وَبِـكَ أرفَعُـهُ، فـإنْ امسَـكْتَ نَفسِـي فارحَمْها . وَإنْ أَرسَلْتَها فاحْفَظْها بِما تَحْفَظُ بهِ عِبادَكَ الصّالِحينَ)).(٤١)

**واته: بەناوی تۆ پەروەردگارم تەنیشتم داناو بەناوی تۆوه بەرزی دەکەمەوه. ئەگەر ڕۆحی منت گرتەوەو مراندت بەزەیت پێیدا بێتەوه. وه ئەگەر ناردتەوه بۆ جەستەکەم ئەوا بیپارێزه بەوەی کەبەندە صاڵحەکانتی پێ دەپارێزی.**

---

**(٤١) البخاري ١٢٦/١١ برقم(٦٣٢٠) ومسلم ٤/ ٢٠٨٤ برقم(٢٧١٤). وه لەفزی موسلیم بەم جۆرەیه: ((سُبحانَكَ اللَّهُمَّ رَبّي بِكَ وَضَعتُ جَنبِي وَبِكَ أَرفَعُهُ إن أَمسَكتَ نَفسي فَاغفِر لَها وَإن أَرسَلتَها فَاحفَظها بِما تَحفَظُ بِهِ عِبادَكَ الصَّالِحِينَ))**

٦- (( اللَّهُمَّ إِنّكَ خَلَقْتَ نَفْسِي وَأَنْتَ تَوَفّاها، لَكَ مَماتُها وَمَحْياها. إنْ أحيَيْتَهـا فاحفَظهـا. وإْن أمَتَّهـا فاغْفِرْلهَـا. اللَّهُـمَّ إنّـي أَسـأَلُكَ العافيةَ)).[٤٢]

**واته: خوایه تۆ ڕۆحی منت بەدیهێناوەو تـۆ دەیمرێنـی. مـردن و ژیانی بە دەستی تۆیە. ئەگەر ژیاندت(هێشتەوە لەسەر ژیان) بیپارێزەو ئەگەر مراندت لێ ی خۆش ببە. خوایە داوای پارێزراوی و لەش ساغیت لێ دەکەم.**

**٧- پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر بیویستایە بخەوێت دەستی ڕاستی دەخستە ژێر ڕوومەتی و دەیفەرموو:** (( اللَّهُمَّ قِني عَذابَكَ يَومَ تَبْعَثُ عِبادَكَ )).[٤٣]

**واته: خوایە بمپارێزە لەسزاکەت لەو ڕۆژەدا کەبەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە.**

٨- (( بِاسمِكَ اللَّهُمَّ أمُوتُ وَأحيا)).[٤٤]

**واته: لەسەر یادی ناوی تۆ خوایە دەمرم و دەژیم.**

**٩-** (( **ئایا شتێکتان پێ بڵێم کە چاکتر بێت بۆ هەردووکتان لەخزمەتکارێك، ئەگەر چوونە سەر جێگا(٣٣) جار**(سُبحانَ الله)

---

(٤٢) اخرجه مسلم ٢٠٨٣/٤ برقم(٢٧١٢) وأحمد بلفظه ٧٩/٢ .

(٤٣) أبوداود بلفظه ٣١١/٤ برقم(٥٠٤٥) وانظر صحيح الترمذي ١٤٣/٣ .

(٤٤) البخاري مع الفتح ١١٣/١١ برقم (٦٣١٢) ومسلم ٢٠٨٣/٤ برقم (٢٧١١).

**و(٣٣) جار**(الحَمْدُلله) **و (٣٤) جار**(الله أكبر ) **بكەن ئەوە چاكترە بۆ ئێوە لە خزمەتكار** )).[٤٥]

**١٠-** (( اللَّهُــمَّ رَبَّ السَّــماواتِ السَّــبْعِ. ورَبَّ الأَرْضِ، وَرَبَّ العَــرشِ العَظِيم. وَربَّنا وَرَبَّ كُـلِّ شَـيءٍ. فـالِقَ الحَـبِّ وَالنَّـوَى. ومُنـزِلَ التَّـوراةِ والإنجيلِ. والفُرقانِ. أعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ شَيءٍ أنْتَ آخِذُ بناصِيَتِهِ. اللَّهُمَّ أنْتَ الأَوَّلُ فليسَ قَبْلَكَ شَيءٌ. وَأنْتَ الآخِرُ فليسَ بَعْدَكَ شَيءٌ. وَأنتَ الظّاهِرُ فلَيسَ فَوقَكَ شَيء. وَأنتَ الباطِنُ فَلَيسَ دُونَكَ شَيءٌ. إقضِ عَنّا الدَّينُ وأغنِنا مِنَ الفَقرِ )).[٤٦]

---

**(٤٥) پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمەی بە ئیمامی عەلی و فاطمەی كچی فەرموو كاتێ داوای خزمەتكاریان لێ كرد كە بۆیان بگرێ/ البخاري مع الفتح ٧١/٧ برقم(٣٧٠٥) ومسلم٤/٢٠٩١ برقم(٢٧٢٧).**

**تێبینی/ ابنُ القيم (رحمه الله) دەفەرموێت: (زیكركردن هێزێك دەبەخشێت بەو كەسەی زیكرەكە دەكات بەجۆرێك ئەتوانێت هەندێ كار ئەنجام بدات بە زیكرەوە كە بەبێ زیكرەكە ناتوانێت بیكات، وە من خۆم هێزو توانایەكی زۆر سەیرم لە شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییەم بینیوە لە ڕۆیشتن و قسە كردن و هەڵپەكردن و نوسینیدا)، پاشان ئەم فەرمودەیە دەهێنێت و دواتر دەفەرموێت: (ووتراوە هەركەس بەردەوام بێت لەسەر ئەم زیكرە هەست بە هێزێكی وا دەكات لە لاشەیدا كە پێویستی بە خزمەتكار نابێت).الوابل الصيِّب (ص١٠٦).**

**وە نەقڵی كردووە لە شێخی ئیسلامەوە كە فەرمویەتی: (پێمان گەیشتووە كە هەركەسێك بەردەوام بێت لەسەر ووتنی ئەم ووشانە، هەست بە ماندوویەتی ناكات لە سەرقاڵی و كاروبارەكانی دا). الوابل الصيِّب (ص١٣١).**

**(٤٦) مسلم ٤/ ٢٠٨٤ برقم(٢٧١٣).**

**واتــه: خوایــه پــەروەردگاری حــەوت ئاسمانــەکانو زەوی و پـەروەردگاری عەرشـی گـەورە. پـەروەردگارمانو پـەروەردگاری هەموو شتێك. تەقێنەرو ڕوێنەری تۆوی دانەویڵەو ناوکی خورماو دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و قورئان، پەنادەگرم پێت لەخراپەی هەموو شتێك کە ناوچەوان و چارەنوس و نسیبی بەدەست تۆیە. خوایە تۆ یەکەمینیو کەس لەپێش تۆوە نی یەو تۆ دوایەمینیو کـەس لـەدوای تـۆوە نییـەو تـۆ بەدەسـتەڵات و زاڵ و دیـارو ئاشکرایت و کەس لەسەرو تۆوە نییەو تۆ پـەنهانی و بـەئاگای بەشاراوەکانو شتێك نییە لـەتۆ پـەنهان. سا قـەرزاریمان لەسـەر هەڵگرەو بێنیازو دەوڵەمەندمان بکە لە هەژاری .**

١١- (( ألحَمْدُ للهِ الّذي أطْعَمَنا وَسَقَانا. وَكَفانا. وآوانا. فكَم مِمَّن لا كافِيَ لَهُ وَلا مُؤوِيَ )).(٤٧)

**واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە تێری کردین و تێرئاوی کردین و پێویستی نەخستینە غـەیری خـۆی و بەقەنەعەت و کیفایـەتی داین(لــە خراپــەی شــتە ئازاراوییــەکان و پێویســتییەکانی نەهێشـتین) و کردینـە خـاوەن خانـەو مـەنزڵ(یان ڕەحمـی پـێ کـردین). زۆر کـەس هەیـە لـە خراپـەی دوژمـن و خراپـەکاران پارێزراو نییە، وە مۆڵگەی نیشتەجێی نییە.**

---

**(٤٧) مسلم ٤/٢٠٨٥ برقم(٢٧١٥) .**

١٢- (( اللَّهُمَّ عالِمَ الغَيبِ وَالشَّهادَةِ. فاطِرَ السَّماواتِ وَالأرضِ. رَبَّ كُلِّ شَيء وَمَلِيكَهُ. أشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلاّ أنْتَ. أعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسي وَمِنْ شَرّ الشَيطانِ وَشِرْكِهِ. وأنْ أقترِفَ عَلى نَفْسي سُوءاً أو أجُرَّهُ إلى مُسلِمٍ )).(٤٨)

**واتە: خوایە ئەی زانای غەیبو ئاشکرا. ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوی. پەروەردگارو پاشای هەموو شتەکان. شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لەتۆ. پەنا دەگرم پێت لە خراپەی نەفسم. وە لە خراپەی شەیطانو هاوبەش دانانی(یان داوەکانی). وە لەوەی کە خراپەیەك بهێنم بەسەر نەفسمدا یان خراپەیەك بهێنم بەسەر موسڵمانێکدا.**

**١٣- پێغەمبەر(ﷺ) نەدەخەوت هەتا سورەتی** (ألسّجدة) ﴿ آلم.. تنزيل .. ﴾ و ﴿ تَبارَكَ الّذي بِيَدِهِ المُلكُ.. ﴾ **ی دەخوێند.**(٤٩)

---

(٤٨) أبوداود ٣١٧/٤ برقم(٥٠٨٣) وانظر صحيح الترمذي ٣/ ١٤٢.

(٤٩) الترمذي برقم (٣٤٠٤) والنسائي في عمل اليوم والليلة برقم(٧٠٧)، وانظر صحيح الجامع ٢٥٥/٤ برقم(٤٨٧٣) و(الصحيحة) برقم(٥٨٥). أبو الزبير دەفەرموێت: ( ئەم دوو سورەتە بەسەر هەموو سورەتێکی قورئاندا بە حەفتا چاکە فەزڵدراون، وە هەر کەسێك ئەم دوو سورەتە بخوێنێت بەهۆیەوە حەفتا چاکەی بۆ دەنوسرێت و حەفتا پلە بەرز دەبێتەوەو حەفتا گوناهی دەسڕێتەوە). قال الألباني في الأدب المفرد بالتعليقات (٢٨٢/١- ٢٨٣) برقم (١٢٠٧): صحيح من قول أبي الزبير، فهو مقطوع موقوف .

**١٤- پێغەمبــەر(ﷺ) نەدەخــەوت هــەتا ســورەتی ﴿الزمـر﴾ و ﴿الإسراء﴾ی دەخوێند.**(٥٠)

**١٥- ئەگـەر چوویته سـەرجێگای نوسـتن دەسـت نوێـژی نوێـژ بشۆرەو پاشان لەسەرلای ڕاستت ڕابکشێ‌و پاشان بڵێ:**

(( اللَّهُمَّ أسلَمْتُ نَفْسي إلَيكَ. وَفَوَّضْتُ أمري إلَيكَ. وَوَجَّهْتُ وَجْهي إليــكَ. وألجَــأْتُ ظَهْــري إليــكَ. رَغْبَــةً وَرَهْبَــةً إلَيــكَ. لامَلْجــأَ وَلا مَنجا مِنكَ إلاّ إلَيكَ. آمنتُ بِكِتابِكَ الّذي أَنْزَلْتَ، وَبِنَبّيِكَ الّذي أرْسَلْتَ )).(٥١)

**واته: خوایه نەفسم گوێڕایەڵ و تەسلیمی تۆ کردو کاروباری خۆم دایه دەستی تۆ، وە ڕووم کرده تـۆو پشـتم بەسـت بـەتۆ. بـه پـێ خۆشبوون حەز پێ کردن له پاداشت و بەترسـان لـه سـزای تـۆ.**

---

(٥٠) أخرجه الترمذي وابن خزيمة والحاكم وصححه الألباني في الصحيحة(٦٤٢/٢) برقم(٦٤١).

(٥١) ئەگەر ئەمه بڵێیت‌و بمریت لەسەر فیطرەتی ئیسلام دەمری. (وە باکۆتا شتێك بێت که دەیڵێیت). البخاري مع الفتح ١١/ ١١٣ برقم (٦٣١٣، ٦٣١٥، ٧٤٨٨) ومسلم ٢٠٨١/٤برقم (٢٧١٠). وە له ڕیوایەتی بوخاری‌و الترمذیدا هاتووه: (ئەگەر ئەو شەوه بمریت لەسەر فیترەت دەمریت و ئەگـەر بەیانیت لێ بویـەوە چاکەت تـوش بووه). صحيح الترغيب والترهيب (١/ ١٤٧) برقم٦٠٣ وقال الألباني: صحيح.

تێبینـی/ سـوننەته ئەگـەر لەشـی گـران بـوو دەسـت نوێـژ بشـۆرێ پـێش خـەوتن. له عبدالله وە فەرمووی: عومەر پرسیاری له پێغەمبەر(ﷺ) کرد: ئایا یەکێك له ئێمه ئەتوانێت بخەوێت به لـەش گرانیەوە؟ فـەرمووی: (( بـەڵێ ئەگـەر دەسـت نوێـژی هەڵگرت)). البخاري ٣٩٣/١، وە هەروەها بوخاری ڕیوایەتی کردووە لەعائیشەوە له کرداری پێغەمبەرەوە(ﷺ) که خۆی وای کردووه ٣٩٣/١ .

هیچ قەڵاو حەشارگەو ڕزگاربونێك نییە مەگەر بۆلای تۆ. باوەڕم هێنــاوە بەکتێبەکــەت کــە داتبەزاندۆتــە خــوارەوە، وە بــەو پێغەمبەرەت(ﷺ) کەناردوتەو ڕەوانەت کردووە .

١٦- (( لا إلهَ إلاّ اللهُ وَحدَهُ لاَ شَريكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ وَهوَ على كُلِّ شَيءٍ قَدير، لا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلاّ بِاللهِ، سُبحانَ اللهِ وَالحَمدُ للهِ وَلا الهَ إلاّ اللهُ وَاللهُ أكبر )).(٥٢)

واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە (الله) تەنهایەو هیچ هاوەڵی نییە، هەموو موڵك و سوپاس بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە، هیچ گۆڕان و هێزێك نییە بە خوای گەورەوە نەبێت، پاکی بۆ خواو ستایش بۆ خواو هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە (الله) و خوا لە هەموو گەورەیەك گەورەترە.

١٧- ((الحَمـدُ للهِ الَّـذي كَفـاني وَآوانـي، الحَمـدُ للهِ الَّـذي أَطعَمَنـي وَسَقاني، الحَمدُ للهِ الَّذي مَنَّ عَلَيَّ وَأَفضَل، اللَّهُمَّ إنّي أَسأَلُكَ بِعِزَّتِكَ أَنْ تُنجني مِنَ النّارِ)).(٥٣)

---

(٥٢) هەرکەسێك کاتێ چووە ناو جێگای نوستنی ئەمە بڵێت ئەوا خوای گەورە لە تاوان یان گوناهەکانی خۆش دەبێت ئەگەر چی وەکو کەفی دەریاش وابێت./ رواه النسائي وابن حبان في صحيحه واللفظ له، وعند النسائي: (سبحان الله وبحمده) وقال في آخره: (..غفرت له ذنوبه ولو كانت أكثر من زبد البحر). صححه الألباني أنظر السلسلة الصحيحة برقم (٣٤١٤). وصحيح الترغيب والترهيب برقم(٦٠٧).

(٥٣) هەرکەسێك کاتێك ئەچێتە ناو جێگای نوستنی بڵێ:......ئەوە بە حەمد و ستایش کردنی هەموو دروستکراوان ستایشی خوای گەورەی کردووە). أخرجه الحاكم في المستدرك، وغيره، وصححه الألباني أنظر السلسلة الصحيحة برقم(٣٤٤٤) و صحيح الترغيب والترهيب برقم(٦٠٩).

**واتـه: سـوپاس و سـتایش بـۆ ئـەو خوایـەی کیفایـەتی دایـن و جێنشـینی کـردین، سـتایش بـۆ ئـەو خوایـەی خـواردن و خواردنەوەی داینیٚ، ستایش بۆ ئەو خوایەی بەخشش و منەتی خۆی پـیٚ بەخشـیم بـه فـەزڵی خـۆی، خوایـه بـه عیززەتـی خـۆت داوات لیٚ دەکەم کە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارم بکەیت.**

**١٨- پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە شەودا کاتیٚ دەچووە ناو جێگای نوسـتنی دەیفـەرموو:** (( بِسْـمِ اللهِ وَضَـعْتُ جَنْبِی، اللَّهُـمَّ اغْفِرْ لِی ذَنْبِـی، وَأَخْسِـئْ شَـيْطَانِی، وَفُـكَّ رِهَـانِی، وَثَقِّـلْ مِيزَانِـي، وَاجْعَلْنِـی فِـی النَّدِيِّ الأَعْلَى)). (٥٤)

**واتە: بە ناوی خواوە تەنیشتم دانا، خوایە لە تاوانەکانم خۆشبەو شەیتانەکەم لیٚ دووربخەرەوەو نەفسی بارمتەم ئازاد بکە (لە هەموو مافێك کە لەسەرمە)و تای کێشانی چاکەکانم قورس بکەو بمگێڕە لە ئامادەبوانی مەجلیسە بەرزەکە (کە کۆڕی مەلائیکەتە پلە بەرزەکانە).**

---

**(٥٤) صححه الألباني في صحيح وضعيف الجامع الصغير(٤٢٥/١٨) برقم(٨٧٧٨)، وأنظر صحيح الجامع برقم (٤٦٤٩)، والمشكاة برقم(٢٤٠٩).**

## وەرگەڕان لەسەر جێگا لە شەودا
## ( لە بارێکەوە بۆ بارێك )

**لــە عائیشــەوە( ڕەزای خــوای گــەورەی لێ بێــت) دەفــەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر لە شەودا وەربگەڕایەتە سەرلایەکی تــری دەیفــەرموو:** (( لا إلـهَ إلاّ اللهُ الواحِـدُ القَهّـار. رَبُّ السَّـمواتِ وَالأرضِ وَما بَينَـهُما العَزيزُ الغَفّار )).(٥٥)

**واتــە:هیچ پەرسـتراوێك نــی یــە بــە هــەق جگــە لــە(الله) ی تــاکی گردنکەچکرو ناچارکاری هەموو دروستکراوان. کە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایەو خاوەنی عیززەتی تەواوو لێ بوردەیە .**

## زیکرو پاڕانەوەو داوای لێخۆشبون کردن لە خوای گەورە لە سێ یەکی کۆتایی شەودا

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ٱلصَّـٰبِرِينَ وَٱلصَّـٰدِقِينَ وَٱلْقَـٰنِتِينَ وَٱلْمُنفِقِينَ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ ﴿١٧﴾﴾ (آل عمران: ١٧)

---

(٥٥) أخرجه الحاكم وصححه ووافقه الذهبي ٥٤٠/١ والنسائي في عمل اليوم والليلة برقم(٨٦٤) وابن السني في عمل اليوم والليلة برقم(٧٥٧) وصححه الالباني. وانظر صحيح الجامع ٢١٣/٤ برقم(٤٦٩٣).

**واتە: ئیمانداران ئەمانە سیفەتیانن: خۆراگرن و شان ئەدەنە بەر فەرمانـەکانی خـوا، هەمیشـە راسـت بێـژو راسـتگۆن، ملکـەچ و گوێرایـەڵن، هـەمووکات خـەریکی نوێـژو خواپەرسـتین، سـامان بەخشن، بەر لەنوێژی بەیانییش خەریکی شەو نوێژو، پارانەوەی لێخۆشبوونن.**

**وە خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ كَانُواْ قَلِيلاً مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ (الذاريات: ١٧–١٨)

**واتە: ئەوانە کەمێك لە شەودا دەخەوتن و هەر سەرقاڵی شەونوێژ بوون، وە لەبـەرە بـەیان و پـێش نوێـژی بـەیانی خـەریکی داوای لێخۆشبوون کردن بوون.**

عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) قَـالَ: (( يَنْـزِلُ رَبُّنَـا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الْآخِرُ، يَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ، مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ)).(٥٦)

**واتـە: خـوای پـەروەردگار بـە زاتـی خـۆی هـەموو شـەوێك( بـە دابەزینێك کە شایسـتەی ئـەو بێـت) دادەبەزێتـە ئاسمـانی دونیـا کاتێ کە سێ یەکی کۆتایی شەو دەمێنێت، دەفەرموێت: کێ لێم دەپاڕێتـەوە بـا وەڵامـی بدەمـەوە، کـێ داوام لێ دەکـات بـا پێـی ببەخشم، کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات تا لێی خۆشبم.**

---

(٥٦) صحيح البخاري برقم (١١٤٥) ومسلم٢/١٧٥ برقم(١٨٠٨).

**٦- وه دەفـەرموێت(ﷺ):** (( أقـرَبُ مـا يَكـونُ الـرَّبُّ مِـنَ العَبْـدِ فـي جَوْفِ اللَّيـلِ الآخِرِ. فَإنِ استَطَعْتَ أن تَكـونَ مِمَّـنْ يَـذكُرُاللهَ فـي تِلْـكَ السَّاعَةِ فَكُنْ)).(٥٧)

**واته: نزيك ترين كاتێك كه پەروەردگار له بەندەكەيەوه نزيك بێت لـه سـێ بەشـی كۆتـايی شـەودايه(ئەو كاتـەی خـوای گـەوره دادەبەزێته ئاسمانی دونيا). ئەگەر توانيـت لـەو كەسـانەبێت كـه يادی خوای گەوره دەكەن لەو كاتەدا ئەوا ببه.**

## داچڵەكين له خەودا و خەو لێ نەكەوتن و ترس و خەم

(( أعـوذُ بِكَلمـاتِ اللهِ التّامّـات مِـنْ غَضَـبِهِ وَعِقابِـهِ. وشَـرِّ عِبـادِهِ، وَمِـن هَمَزاتِ الشّياطينِ وأن يَحضُرونِ )).(٥٨)

**واته: پەنا ئەگرم بـه ووتـه تـەواوو بێ نوقسـانی (يـان بەسـوودو شيفادەر)ەكانی خوای گەوره (كه بريتييه لـه نـاوه جوانـەكانی و كتێبەكانی) لەخەشم و سزای و له خراپەی بەندەكانی و له شێتی شەيطانەكان و لەو كاتانەی كه له ژيانـدا دێنه لام بۆ گومڕاكردنم يان كاتێ لەسەر مەرگ دام دێنه لام .**

---

**(٥٧) أخرجه الترمذي برقم(٣٥٧٩) والنسائي١/٢٧٩ والحاكم وانظر صحيح الترمذي٣/١٨٣ وجامع الاصول بتحقيق الأرناؤوط ٤/١٤٤.**

**(٥٨) أبو داود ٤/ ١٢ برقم(٣٨٩٣) وأنظر صحيح الترمذي ٣/١٧١. وهو حديث حسن، حسّنَهُ الألباني في صحيح أبي داود برقم(٣٢٩٤) بلفظ متقارب. وفي صحيح الترغيب والترهيب (٢/١٢٠) برقم(١٦٠١).**

# ئەگەر خەونی ڕاست و خۆش و چاك( الرؤيا )
# یان خەونی ناخۆش ( الحُلم )ت بینی

**پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت:** (( الرُّؤيا ثَلاثٌ: فَالبُشرى مِنَ اللهِ، وَحَديثُ النَّفْسِ، وَتَخويفٌ مِنَ الشَّيطانِ. فَإذا رَأَى أَحدكم رؤيا تعجبه فليقصها إن شاء. وإذا رأَى شَيئاً يَكْرَهُهُ فَلا يَقُصَّهُ عَلى أَحَدٍ وَلْيَقُمْ يُصَلِّي)). (٥٩)

**واتە: خەون سێ جۆرە: مژدەیەکە لە خوای گەورەوە، وە هەیە ووتووێژی نەفسە(ئەوەی لەکاتی بەخەبەریدا پێوەی سەرقاڵ وبووە) ، وە هەیانە ترساندنێکە شەیطانەوەیە. ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەونێکی خۆشی بینی با ئەگەر ویستی لێیەتی بیگێڕێتەوە، وە ئەگەر خەونێکی بینی پێی ناخۆش بوو با لای کەس نەیگێڕێتەوەو هەستێت نوێژ بکات.**

**کەواتە: خەونی خۆش و چاك لە لایەن خواوەیەو خەونی ناخۆش لە شەیطانەوەیە. ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەونی خۆشی بینی با لە لای خۆشەویستی خۆی نەبێ باسی نەکات... فەرموودەکە...** (٦٠)

**وە لەفەرمودەی تردا هاتووە: با باسی بکات و تەفسیری بکات.** (٦١)

---

(٥٩) رواه أحمد٢/٣٩٥ و ابن أبي شيبة وابن ماجه وصححه الألباني أنظر السلسلة الصحيحة برقم(١٣٤١).

(٦٠) مسلم بلفظه ٤/١٧٧٢ برقم (٢٢٦١) والبخاري ٧/٢٤ برقم(٧٠٤٤) .

(٦١) صححه الألباني انظر السلسلة الصحيحة برقم (١٣٤٠).

بەڵام پێویستە تەنها بۆ کەسی شارەزا بگێڕدرێتەوە، پێغەمبەری خــوا(ﷺ) دەفــەرموێت: «لا تَقُصُّــوا الرُّؤْيــا إلاّ عَلَــى عَــالِمٍ أَوْ ناصِحٍ». [٦٢]

واتــە: خــەون تــەنها بــۆ زانــا یــان ئامۆژگاریکــارو دڵســۆز بگێڕنەوە.(چــونکە خــەون لەســەر ئــەو شــتە دەردەچــێت کــە لێکدەدرێتەوە)

وە کورتــەی ئــەو شــتانەی کــە دەیکــات لــەکاتی بینینــی خــەونی ناخۆش دا ئەمانەن:

١- سێ جار تف(فویــەك کــەمێك تــەڕی پێوەبێــت) دەکــات بــە لای چەپی دا. [٦٣]

٢- ســێ جــار پــەنا دەگــرێ بــەخوای گــەورە لــە شــەیطــان و لــە خراپەی ئەوەی کە بینوویەتی. [٦٤]

٣- لە لای کەس باسی ناکات و نایگێڕێتەوە. [٦٥]

٤- لەسەرئەو لایە وەردەگەڕێ کە لەسەری بووە. [٦٦]

٥- هەڵدەستێو نوێژ دەکات ئەگەر ویستی. [٦٧]

---

(٦٢) صححه الألباني انظر سلسلة الأحاديث الصحيحة١/٨ وبعض التاسع ١١٨/١ برقم(١١٩).

(٦٣) مسلم ١٧٧٢/٤ برقم (٢٢٦١) والبخاري برقم (٧٠٤٤) .

(٦٤) مسلم ٤/ ١٧٧٢، ١٧٧٣.

(٦٥) مســلم ١٧٧٢/٤ بــرقم(٢٢٦١) والبخــاري بــرقم(٧٠٤٤). ئەمــەش لەوانەیــە حیکمەتەکەی ئەوە بێت تا حەسوودی پێ نەبرێت.. والله اعلم .

(٦٦) مسلم ١٧٧٣/٤ برقم ( ٢٢٦٢) .

(٦٧) مسلم ١٧٧٣/٤ برقم (٢٢٦٢) .

# زیكری بەیانیان و ئێواران و كاتی خوێندنیان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكۡرٗا كَثِيرٗا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ ﴾. (الأحزاب: ٤١ ، ٤٢)

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە زیكری خوا بكەن بە زیكرێكی زۆرو تەسبیحاتی ئەو بكەن و بە پاك ڕایگرن لە بەیانیان و ئێواران دا.

(بُكرة): لە زمانی عەرەبیدا بە نێوان نوێژی بەیانی و خۆرهەڵاتن دەوترێ.[٦٨]

(أصیل): الجوهری دەڵێت: ئەو كاتەیە لە پاش نوێژی عەسرەوە تاوەكو نوێژی شێوان(مەغریب).[٦٩]

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ ٱلۡغُرُوبِ ﴿٣٩﴾ ﴾ ( ق: ٣٩)

واتە: تەسبیحات و ستایشی خوای پەروەردگارت بكە لە پێش خۆر كەوتن و پێش ئاوابوونی دا.

---

(٦٨) بڕوانە (مختار الصحاح) للرازي (ب ك ر) و هەروەها (غ د ا) .

(٦٩) بڕوانە (الصحاح) للجوهري (أ ص ل) هەروەها (مختار الصحاح) للرازي (أ ص ل). وأنظر لسان العرب ١١/١٧.

**ابن القيم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ئەمەش ڕاڤەی ئەو مانایەیە کە لە فەرموودەکاندا هاتووە: کە دەفەرموێ هەرکەسێ لە بەیانیان و ئێواراندا ئاوا و ئاوا بڵێ، مەبەست بە بەیانی و ئێوارە لە فەرموودەکاندا پێش هەڵهاتنی خۆرو پێش ئاوا بوونیەتی. وە ئەمە کاتی ووتنی زیکرەکانی دوای بەیانی و دوای عەسرە.**[70]

عن انس يرفعه: « لإنْ أقعُدَ مَعَ قَومٍ يَذكرونَ اللهَ تَعالى مِن صَلاةِ الغَداةِ حَتّى تَطلُعَ الشَّمسُ أحَبُّ إليّ مِنْ أنْ أعتِقَ أربعةً مِنْ وَلَدِ إسماعيل. ولأن أقعُدَ مَعَ قَومٍ يَذكرونَ اللهَ مِنْ صَلاةِ العَصْرِ إلى أنْ تَغْرُبَ الشَّمسَ أحبُّ إليّ مِن أنْ أعتِقَ أربعة ».[71]

**واتە: ئەگەر لەگەڵ کۆمەڵێك دا دانیشم کە زیکری خوای گەورە بکەن لەنوێژی بەیانییەوە تا خۆرهەڵاتن لام خۆشترە لەوەی کە چوارکەس لەنەوەکانی ئیسماعیل پێغەمبەر**(عليه الصلاة و السلام) **ئازاد بکەم، وەئەگەر لەگەڵ کۆمەڵێك دابنیشم کە زیکری خوای گەورە بکەن لەنوێژی عەسرەوە تا خۆرئاوا دەبێ لام خۆشترە لەوەی چوار کەس ئازاد بکەم.**

---

**(٧٠) الوابل الصيب لابن القيم ص ١٩٢.**

**(٧١) أبوداود برقم (٣٦٦٧) وحسَّنَهُ الألباني. صحيح أبوداود ٦٩٨/٢.**

# زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران

**١- ((هەر کەسێك بەیانیان**(آيَة الكُرسي) **بخوێنێت لە جنۆکە دەپارێزرێ هەتا ئێوارەی لێ دەبێتەوە.وە هەر کەس ئێوارە بیخوێنێ دەپارێزرێ لییان تا بەیانی)).**[72]

**٢- لە عبداللە ی کوڕی خوبەیبەوە فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:** (قُلْ) **واتە: بڵێ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا چی بڵێم؟ فەرمووی:** ﴿ قُلْ هوَ اللهُ أحَد ﴾ و ﴿ الفَلَق ﴾ و ﴿ النّاس ﴾ **بخوێنە ئێواران و بەیانیان سێجار بەستەو لە هەموو شتێك دەپارێزرێیت.**[73]

**٣- بەیانیان بڵێ:** ((أصبَحناَ وأصبَحَ المُلكَ للهِ[74]، وَالحمدُ للهِ لا إلاّ اللهُ وَحدَهُ لا شَريَكَ لَهُ. لهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ وَهُوَ عَلَى كُلّ شَيءٍ قَديرٌ. رَبِّ أسألُكَ خَيرَ ما في هذا اليَومِ وَخَيرَ ما بَعدَهُ.[75] وَأعوذ بكَ مِنْ شرِّ ما في هذا اليَوم وَشرِّ ما بَعْدَهُ. رَبِّ أعوذ بكَ مِنَ الكَسَلِ

---

(٧٢) أخرجه الحاكم ٥٦٢/١ وصححه الالباني في صحيح الترغيب والترهيب ٢٧٣/١ برقم(٦٥٥) وعزاه الى النسائي في عمل اليوم والليلة برقم(٩٦٠) والطبراني في الكبير برقم(٥٤١) وقال: إسناد الطبراني جيد.

(٧٣) أخرجه أبوداود ٣٢٢/٤ برقم(٥٠٨٢) والترمذي ٥٦٧/٥ برقم(٣٥٧٥) وانظر صحيح الترمذي ١٨٢/٣. وهو حديث حسن .

(٧٤) وە ئێواران بڵێ: ((أمسينا وأمسَى المُلكُ للهِ.......)).

(٧٥) وە ئێواران بڵێ: ((أمسينا وأمسَى المُلكُ للهِ.......)).

وَسُـوءِ الكِبَـر. رَبِّ أعـوذُ بِـكَ مِـنْ عَـذابٍ فـي النّـارِ وَعَـذابٍ فـي القَبرِ)). (٧٦)

**واته: (به نیعمـەتی خـوای گـەورەوە) بـەیانیمان بەسـەردا هـات و هەموو موڵك بەیانی بەسەردا هات بۆ خوای گەورە، وە ستایش بۆ خوایـەو هـیچ پەرسـتراوێك نییـە بـە هـەق جگـە لـە(الله) تەنهایـەو هاوبەشی نییە. هەموو موڵك و سوپاس بۆ ئەوەو بەسـەر هـەموو شـتێكدا بـە توانایـە. پـەروەردگارم داوای خێـری ئـەمڕۆو خێـرو چاكەی دوای ئەمڕۆت لێ دەكەم و پـەنات پـێ ئـەگرم لـە خراپـەی ئەوەی لەمڕۆدایەو لە دوای ئەمڕۆدایە. پەروەردگارم پـەنات پـێ ئەگرم لە تەمبەڵی و لەش قورسی و خراپەی حاڵی تەمەن پیری(لە نەمانی هـۆش و ژیـری و خراپـی حـاڵ). پـەروەردگار پـەنات پـێ ئـەگرم لـە سـزایەك لـە ئـاگری دۆزەخ و سـزایەك لـە گـۆڕدا توشـم ببێت.**

٤- (( أللهـمَّ بِـكَ أصبَحنا. وَبِـكَ أمسَينا.(٧٧) وَبِـكَ نَحيـا وَبِـكَ نَمـوتُ وَإلَيكَ النُّشور )).(٧٨)

---

**(٧٦) مسلم ٤/٢٠٨٨ برقم (٢٧٢٣).**

**(٧٧) وە ئێواران بڵـێ: (( اللهُمَ بِكَ أمْسَينا وَ بِكَ أصْبَحْنا وَ بِكَ نَحْيا وَ بِكَ نَمـوتُ وَ إليـك المـَصير )) واتـە: خوایـە بـەناوی تـۆوە ئێوارەمـان بەسـەردا هـات و بـە نـاوی تـۆوە بەیانیمان بەسەردا هات و بە ناوی تۆوە دەژیـم و دەمـرم وە گەڕانـەوەو چارەنوس بۆلای تۆیە.**

**(٧٨) الترمذي ٥/ ٤٦٦ برقم(٣٣٩١) وانظر صحيح الترمذي ١٤٢/٣.**

واتە: خوایە (بە نیعمەتی پاراستن و پشتیوانی و یارمەتی) تۆوە بەیانیمان بەسەردا هات و ئێوارەمان بەسەردا هاتوو بە(پشتیوانی و کۆمەکی) تۆوە دەژیم و دەمرم و زیندوو بوونەوەش بۆ لای تۆیە.

٥- (( اللهمَّ أنتَ رَبِّي لآ إلـهَ إلاّ أنتَ خَلَقْتَني وَأنا عَبدُكَ، وَأنا على عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ ما استَطَعْتُ. أعوذُ بِكَ مِنْ شرِّ ماصَنَعْتُ. أبوءُ لَكَ بِنِعمَتِكَ عَلَيَّ وَأبوءُ بَذنبي. فاغفِر لي فإنَّهُ لا يَغفِرُ الـذُّنوبَ إلاّ أنتَ)).[٧٩]

واتە: خوایە تۆ پەروەردگارمی هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە تۆ. بەدیت هێناوم و من بەندەی تۆم و من لەسەر ئەو پەیمان و بەڵێنەمم کە بە تۆم داوە (لە ئیمان و ئیخلاص) تا بتوانم.[٨٠] پەنات پێ دەگرم لەخراپەی ئەوەی ئەنجامم داوە لە گوناه. دان ئەنێم بە نیعمەتەکانتدا لەسەرم و دان ئەنێم بە گوناهەکانم دا. ساخوایە لێم خۆش بە ، چونکە بە ڕاستی کەس لە گوناه خۆش نابێ جگە لە تۆ.

---

(٧٩) هەرکەسێ ئێوارە بەیەقینەوە (بە موخلیصی و لە دڵەوە بڕوای بە پاداشتەکەی هەبێت وبەڕاستی دابنێت) بیڵێ و شەو بمرێ دەچێتە بەهەشتەوە. وە هەرکەسێ بەیانی بە یەقینەوە بیڵێ و ئەو ڕۆژە بمرێ دەچێتە بەهەشتەوە/ أخرجە البخاري ٧/١٥٠ برقم(٦٣٠٦)

(٨٠) (مەبەست پێی ئەو پەیمانەیە کە خوای گەورە لە نەوەکانی ئادەمی وەرگرت و لە سورەتی الأعراف ئایەتی(١٧٢)فەرمویەتی).

**٦-** (( **اللَّهُمَّ عافِني في بَدَني. اللَّهُمَّ عافِني في سَمعي. اللَّهُمَّ عافِني في بَصَري. لآ إلهَ إلا أنتَ. اللهمَّ إنّي أعوذُ بِكَ مِنَ الكُفرِ وَالفَقْرِ. وأعوذُ بِكَ مِن عَذابِ القَبرِ لآ إلهَ إلا أنتَ** )) **بەیانیان و ئێواران سێ جار**.[81]

**واتە: خوایە لەش و بیستن و بینینم پارێزراو بکە لە ئافات و نەخۆشی، هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لەتۆ. خوایە پەنات پێ ئەگرم لە بێ باوەڕی و هەژاری و پەنات پێ ئەگرم لە سزای گۆڕ، هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە تۆ.**

٧- (( **اللَّهُمَّ إنّي أسألُكَ العَفْوَ وَالعافيةَ في الدُّنيا وَالآخرة. اللَّهُمَّ إني أسألُكَ العَفوَ وَالعافِيَة في دِيني. وَدُنيايَ وَأهلي. وَمالي. اللَّهُمَّ استُر عَوراتي. وآمِن روعاتي. اللَّهُمَّ احفَظني مِنْ بَينِ يَدَيَّ وَمِنْ خَلفي. وَعنْ يميني وَعَن شِمالي. وَمِنْ فوقي. وَأعوذُ بعَظمَتِكَ أَنْ أُغتالَ مِن تحَتي** )) **بەیانیان و ئێواران**.[82]

---

(٨١) رواه أحمد (٤٢/٥) وأبوداود (٣٢٤/٤) برقم(٥٠٩٠) والنسائي في عمل اليوم والليلة (ص١٤٦) رقم (٢٢) وابن السني في عمل اليوم والليلة (ص٣٥) رقم (٦٩) والبخاري في(الأدب المفرد) رقم (٧٠١) وحسَّنَهُ سماحة الشيخ عبدالعزيز بن باز(رَحِمَهُ اللهُ) في تحفة الاخيار (ص٢٦) والعلامة الالباني في صحيح الجامع (٣٣٨٢). بعد أن ضعفه في ضعيف الجامع برقم (١٢١٠).

(٨٢) رواه أبوداود برقم(٥٠٧٤) وصحَّحَهُ الألباني في صحيح أبو داود برقم(٤٢٣٩) وابن ماجه وصحَّحه ووافقه الذهبي. وحَسَّنَهُ الحافظ في (آمالي الأذكار) أنظرصحيح ابن ماجه ٣٣٢/٢ وصحيح الكلم الطيب (ص٣٤) رقم (٢٣) للعلامة الألباني.

**واته: خوایه من داوای لێخۆش بوون و پارێزراویت لێ دەکەم لە نەخۆشی و بەلاَ لەدنیاو دواڕۆژدا. خوایە داوای لێ بووردن و پارێزراویت لێ دەکەم لە دین و دنیاو کەس و کارو ماڵ و سەروەتم دا. خوایە عەیبەکانم داپۆشەو ترسەکانم مەهێڵەو ئمینم بکە. خوایە بمپارێزە لەوەی کە (بەهۆی غافڵ بوونمەوە) لە بەردەممەوەو لە دوامەوەو لە ڕاستم و چەپم و سەرەوەم تووشی بەلاَو سزا ببم. وەپەنا ئەگرم بە گەورەیی تۆ کە لە ژێرەوە سزا بدرێم و پێ بکرێم(أبوداود فەرمویەتی: وەکیع فەرمویەتی: مەبەست ڕۆچوونە ) .**

**٨-** (( اللَّهُمَّ عالِمَ الغَيبِ وَالشَّهادةِ. فاطِرَ السّمواتِ وَالأرضِ. رَبَّ كُلِّ شَيءٍ وَمَليكَهُ. أشهَدُ أن لآ إله إلا أنتَ. أعوذُ بكَ مِنْ شَرِّ نفسي. وَمِنْ شَرِّ الشَّيطانِ وَشِركهِ.وَأن أقتَرِفَ على نَفسي سُوءاً أو أجُرَّهُ إلى مُسلمٍ))

**بەیانیان و ئێواران.**(٨٣)

**واتە: خوایە ئەی زانای نهێنی و ئاشکرا. بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی پەروەردگارو خاوەنی هەموو شتێك. شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لەتۆ. پەنا ئەگرم پێت لە خراپەی نەفسم و لە شەڕو خراپەو هاوبەش دانانی**

---

(٨٣) الترمذي برقم(٣٣٩٢) وأبوداود برقم (٥٠٦٧) وانظر(صحيح الترمذي) ١٤٢/٢. وصحيح الكلم الطيب(ص٣٢،٣٣) للعلامة الألباني. وە لە پێش نووستنیش دەووترێت.

**شەیطان(یان داوەکانی). وە لەوەی کە بەنەفسم خراپەیەك ئەنجام بدەم یان خراپەیەك تووشی موسڵمانێك بکەم.**

**٩-** (( بِسـمِ اللهِ الـَّذي لا يَضُـرُّ مَـعَ اسـمِهِ شَـيءٌ فـي الأرضِ وَلا فـي السّماءِ وَهَوَ السَّمِيعُ العَلِيم )) **بەیانیان و ئێواران سێجار.**(٨٤)

**واته: (خۆم پەنا ئەدەم) بە ناوی ئەو خوایەی لەگەڵ ناوی ئەودا هیچ شتێك زیانی پێ ناگات یان زیان ناگەیەنێ نە لە زەوی و نە لە ئاسماندا ئەو خوایە بیسەرە بە ووتەی بەندەکانی و زانایە بە کرداریان.**

---

(٨٤) **هەرکەسێ بەیانیان سێ جار و ئێواران سێجار بیڵێ هیچ زیانی پێ ناگەیەنێ/ أخرجه أبوداود٤/٣٢٣برقم(٥٠٨٨,٥٠٨٩) وصحّحَهُ الألباني في صحيح أبي داود برقم(٤٢٤٤) والترمذي ٥/٤٦٥ برقم(٣٣٨٨) وابن ماجه برقم(٣٨٦٩) وأحمد. انظر صحيح ابن ماجه ٢/ ٣٣٢ وصحيح الترمذي ٣/١٤١. وحَسَّن إسناده العلامة ابن باز في تحفة الاخيار (ص٣٩).**

**وە لە ریوایەتێکیدا: بە لەفزی: هەرکەسێك ئێواران (سێ جار) بیڵێت بەڵای لەناکاوی توش نابێت هەتا بەیانی لێ دەبێتەوە، وە هەرکەسێك بەیانیان (سێ جار) بیلێت بەڵای لەناکاوی توش نابێت هەتا بەیانی لێ دەبێتەوە. دەفەرموێت: (أبان بن عثمان) ڕاوی فەرمودەکە توشی (فالج) (شەلەل و ئیفلیجی) بوو ئەو پیاوەی فەرمودەکەی لێ بیست هەر تەماشای دەکرد، ئەویش فەرموی: چیتە ئاوا تەماشام دەکەیت، سوێند بە خوا من درۆم نەکردوە بە دەمی عوپمان(ی کوڕی عەففان)ەوە وە عوپمانیش درۆی نەکردووە(و فەرمودەکەی هەڵنەبەستووە) بە دەم پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، بەڵام ئەو ڕۆژەی ئەو دەردەم تووش بوو توڕە بووم و بیرم چوو بیڵێم. (لە ریوایەتی ابن ماجەدا: هەتا خوای گەورە ئەوەی قەدەری کردبوو ڕوویدا).صحيح ابي داود(٥٠٨٨) وأنظر صحيح ابن ماجة (٣٨٦٩).**

**١٠- بـەیانیان یـەك جـار بڵـێ**: (( رَضِـيتُ بـاللهِ رَبّاً.وَبالإسـلامِ دِينـاً وَبمحَمدٍ(ﷺ) نَبِيّاً )).[٨٥]

**واتە: ڕازیم بە (الله) کە پەروەردگارو خاوەن و پەرستراوی بە هەقم بێو ئیسلام دین و بەرنامەم بێت و موحەمەدیش(ﷺ) پێغەمبەرو پێشەوام بێت(و لەهەموو شتێکدا شوێنکەوتەی بم و تەنها لەو دینەکەم وەرگرم).**

**١١-** (( يا حَيُّ يا قَيّومُ بِرَحْمَتِكَ أستَغيثُ. أصلِح لي شأْنِي كُلَّهُ، وَلا تَكِلني إلى نَفْسي طَرْفَةَ عَينٍ )) **بەیانیان و ئێواران.**[٨٦]

**واتە: ئەی هەردەم زیندووی هەڵسوڕێنەری بوونەوەر، بە بەزەیت داوای فریاکەوتنت لێ دەکەم. هەموو کاروبارم چاك بکەو بۆ چاولێك نانێك مەمدەرە دەستی نەفسی خۆم .**

---

(٨٥) هەر کەسێ بەیانیانی هەموو ڕۆژێك بڵێ ......(فەرموودەکە)... من کەفیلو گرنتی دەدەمێ کە دەستی بگرم تا دەیبەمە بەهەشتەوە). أورده المنذري في الترغيب ٢٢٩/١ وقال: رواه الطَبَراني بإسنادٍ حَسَنٍ. انظر سلسلة الصحيحة ١٨٥/٦ برقم (٢٦٨٦). وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە هەر کەسێك بەیانیان و ئێواران سێ جار بیڵێ ئەوا مافە لەسەر خوای گەورە(کە خوای گەورە خۆی بە مافی داناوە) کە لە ڕۆژی دوایی دا ڕازی بکات / رواه أحمد ٣٣٧/٤ والنسائي وابن السني وأبوداود والترمذي وحسنه ابن باز في تحفة الأخيار/ص٣٩ بەڵام شێخی ئەلبانی(ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت) ئەم لەفزەی بە ضه عیف داناوە/ بڕوانە ضعيف الجامع(٥٧٣٥) و (٥٧٣٤)

(٨٦) رواه النسائي والبزار والحاكم وصححه و وافقه الذهبي ٥٤٥/١ ورواه ابن السني برقم (٤٨) وحَسّنَهُ الارنؤوط في الزاد ٢/ ٣٧٥ وصححه الالباني في صحيح الترغيب والترهيب ١/ ٢٧٣. وفي السلسلة الصحيحة ٤٤٩/١ برقم(٢٢٧) بلفظ:....طرفة عين أبداً).

**١٢-** (( أصبَحنا عَلى فِطرَةِ الإسلامِ[٨٧]وَعلى كَلِمَةِ الإخلاصِ. وَعلى دينِ نَبيّنا مُحَمّدٍ(ﷺ). وَعلى مِلّةِ أبينا إبراهيم حَنيفاً مُسْلِماً وَما كانَ مِنَ المُشْرِكينَ )).[٨٨]

**واتە: بەیانیمان بەسەردا هات لەسەر فیطرەتی دینی حەقی ئیسلام و ووشەی ئیخلاص کە بریتی یە لە** (أشهد أن لا إله إلا الله، وأن محمداً عبده ورسوله )، **وە دینی پێغەمبەرمان محمد(ﷺ)و لەسەر میللەتی باوکمان ئیبراهیم پێغەمبەر**(عليه الصلاة والسلام) **کە لای دابوو لە بەتاڵەوە بۆ دینی حەق و بەردەوام و دامەزراو بووە لەسەری و موسڵمان بووەو لە هاوبەش دانەران نەبووە.**

**١٣-** (( سُبحانَ اللهِ وَبِحَمدِهِ )) **سەد جار.**[٨٩]

**واتە: تەواوی و بێ کەم و کوڕی و سوپاس و ستایش بۆ خوایە.**

---

**(٨٧) بەلاَّم ئەوەیان کە لە ئێواراندا بڵێ: (( أمسَينا عَلَى فِطْرَةِ الإسلام...... )). ئەمە ضَعيفه.....بروانه السلسلة الصحيحة ١٢٣٠/٦برقم( ٢٩٨٩) .**

**(٨٨) رواه أحمد ٤٠٧،٤٠٦/٣ وأيضاً ١٢٣/٥ والدارمي ٢٦٢/٢ وابن السني في عمل اليوم والليلة ص ١٢ رقم (٣٤). وانظر صحيح الجامع الصغير ٢٠٩/٤. رقم (٤٦٧٤) للعلامة الالباني. وحَسَّنَهُ ابن حجر في نتائج الأفكار ٣٧٩/٢.**

**(٨٩) (هەرکەسێ بەیانیان(سەد)جارو ئێواران(سەد) جار بیڵێ لەرۆژێکدا کەس لە رۆژی دوایی دا بەکردەوەی لەم باشترەوە نایەت مەگەر کەسێك وەك ئەمی وتبێ یان ذیکری زیاتری وتبێ). مسلم ٢٠٧١/٤ برقم (٢٧٢٣) .**

١٤- «لآ إلهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ. لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ، وَهوَ على كُلِّ شَيءٍ قَدِيرٌ» **(دە)جار**[٩٠]. **یان (یەك جار لە كاتی بێ توانایی دا).**[٩١]

**واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە(الله) تاكی بێهاوبەشەو موڵك و سوپاس هەر بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێكدا بە توانایە.**

---

(٩٠) (هەركەسێك(دە)جار بەیانیان بیڵێ ئەوا(دە)چاكەی بۆ دەنووسرێ و(دە)خراپەی لەسەر لادەچێ. وە بەئەندازەی رزگاركردنی (١٠) كۆیلە چاكەی دەگات. وە خوای گەورە پەنای دەدات لە شەیطان. وە ئێوارانیش بیڵێ هەروەهایە). رواه أحمد، والنسائي في عمل اليوم والليلة برقم (٢٤)واللفظ له، وابن حبان في صحيحه، قال الألباني: {وتقدم لفظه فيما يقول بعد الصبح والعصر والمغرب. وزاد أحمد في روايته بعد قوله وله الحمد: (يحيي ويميت) وقال: (كتب الله له بكل واحدة قالها عشر حسنات، ومحا عنه عشر سيئات، ورفعه الله بها عشر درجات، وكن له كعشر رقاب، وكن له مسلحة من أول النهار إلى آخره، ولم يعمل يومئذ عملا يقهرهن، فإن قالها حين يمسي فمثل ذلك) ورواه الطبراني بنحو أحمد وإسنادهما جيد}. انظر: صحيح الترغيب والترهيب ٢٧٢/١ برقم(٦٥٠) وتحفة الاخيار لابن باز ص (٥٥) ورواه الخطيب في تأريخ (٤٧٢/١٢و٣٨٩) وقال العلامة الالباني في (سلسلة الصحيحة) رقم(١١٣): وهذا إسناد صحيح رجاله ثقات رجال مسلم غير قران هذا وهو ثقة. أ. هـ.

(٩١) (هەركەسێك بەیانیان(یەك)جار بیڵێ خوای گەورە بەئەندازەی ئەو كەسە خێری بۆدەنووسێ كە بەندەیەكی رزگاركردبێ لەنەوەكانی ئیسماعیل پێغەمبەر(علیه الصلاة و السلام). وە(دە)خراپەی لەسەر لادەبات و(دە)پلە بەرزی دەكاتەوەو پارێزراو دەبێ لە شەیطان هەتا ئێوارەی لێ دەبێتەوە. وە ئەگەر ئێوارە بیڵێ بەو جۆرەیە هەتا بەیانی لێ دەبێتەوە). أبوداود ٤/ ٣١٩ برقم(٥٠٧٧) وابن ماجه برقم(٣٨٦٧) وأحمد ٦٠/٤ وأنظر صحيح الترغيب والترهيب ٢٧٠/١ وصحيح أبوداود ٩٥٧/٣. وصحيح ابن ماجه ٢/ ٣٣١ وزاد المعاد ٣٧٧/٢وعنده بلفظ: (...عشر مرات..) .

١٥- (( سُبحانَ اللهِ وَبِحَمـدِهِ: عَـدَدَ خَلْقِـهِ. وَرِضـا نَفسِـهِ. وَزِنَـةَ عَرشِـهِ. وَمِدادَ كَلِماتِهِ )) **(تەنها بەیانیان سێ‌جار).**[٩٢]

**واتە: پاکی و بێ کەم و کورتی و گەورەیی سوپاس شایستەی خوای گەورەیە: بە ئەندازەی ژمارەی دروستکراوەکانی و ڕەزای خۆی و قورسایی و سەنگینی عەرشەکەی و زۆری وتەکانی.**

**١٦-** (( أعوذُ بِكَلِماتِ اللهِ التّامّات مِنْ شَرِّ ما خَلَقَ )) **سێ جار تەنها ئێواران.**[٩٣]

---

**(٩٢) مسلم ٤/٢٠٩٠ برقم(٢٧٢٦). وە شێخ ئەلبانی هێناویێتی و لە زیکری دوای نوێژدا دایناوە بەم لەفزە: (سبحان الله عدد خلقه، سبحان الله عدد خلقه، سبحان الله عدد خلقه، سبحان الله رضا نفسه، سبحان الله رضا نفسه، سبحان الله رضا نفسه، سبحان الله زنة عرشه، سبحان الله زنة عرشه، سبحان الله زنة عرشه، سبحان الله مداد كلماته، سبحان الله مداد كلماته، سبحان الله مداد كلماته). اخرجه النسائي (١٣٥٢) وابن ماجة(٣٨٠٨) وصححه الألباني.**

**(٩٣) (هەرکەسێ ئێواران سێ جار بیڵێ ئەوا ئەو شەوە ژەهرو پێوەدان زیانی پێ ناگەینێ). أخرجه أحمد ٢/ ٢٩٠. والنسائي في عمل اليوم والليلة برقم (٥٩٠) وابن السني برقم (٦٨) وانظرصحيح الترمذي١٨٧/٣. وصحيح ابن ماجه ٢٦٦/٢ وتحفة الاخيار ص(٤٥). ئەمەش لە دوایەوە هاتووە: سوهەیل (یەکێك لە ڕاویانی فەرمودەکە) فەرموویەتی: (کەسوکارمان لەبەریان کردو هەموو شەوێك دەیانخوێند، تا جارێکیان کەنیزەیەکمان دووپشك پێوەیدا هیچ هەستی بە ئازار نەکرد). رواه ابن حبان في صحيحه بنحو الترمذي./ صححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب (١٥٨/١) برقم(٦٥٢).**

**<u>تێبینی(١)/</u> ئیمامی القرطبي (رحمه الله) دەفەرموێت: ئەمە هەواڵێکی صەحیح و وتەیەکی ڕاستە بە بەڵگەو تەجرەبە دەرکەوتووە، من لەوەتەی بیستوومە کارم پێ کردووەو هیچ شتێکیش زیانی پێ نەگەیاندووم مەگەر ئەو جارە تەرکم کردبێت:**

**واتە: پەنا ئەگرم بە وتە تەواوو بێ نوقسانی یەكانی خوای گەورە (یان ناوە بەسودو شیفابەخشەكانی).(كە بریتی یە لە ناوەكانی و كتێبەكانی و قورئانەكەی) لە خراپەی دروست كراوەكانی.**

**١٧- ووتنی:** ((سُبحانَ اللهِ)) **سەد جار،** ((الحَمدُللهِ)) **سەد جار،** ((اللهُ أكبَر)) **سەد جار، وە وتنی:** ((لاَ إلهَ إلاّ اللهُ وَحدَهُ لاَ شَريكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ، وَهوَ عَلى كُلِّ شَيءٍ قَديرٌ)) **سەد جار.**(٩٤)

---

**جارێكیان دوپشكێك لە مەدینە پێوەی دام، بیرم كردەوە زانیم كە ئەو ئێوارەیە بیرم چوو بەو ووشانە خۆم پەنا بدەم./ انظر: الفتوحات الربانية لابن علان (١٠٠/٣).**

**تێبینی(٢)/ ئەم زیكرە بە لەفزی (یەك جار)یش هاتووە:**

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أنه قال: (( جاء رجل إلى النبي(ﷺ) فقال: يا رسول الله! ما لقيت من عقرب لدغتني البارحة، قال: أما لو قلت حين أمسيت: أعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق لم تضرك )). رواه مسلم ( ٢٧٠٩ ) .**

**واتە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)و فەرموی: دوێنێ شەو دووپشكێك پێوەیدام و ئازارم زۆر بوو، ئەویش فەرموی: ئەگەر ئێوارە بتوتایە: (أعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق) ئەوا زیانی پێ نەدەگەیاندیت.**

**(٩٤) (هەركەسێك پێش خۆركەوتن و پێش خۆر ئاوابوون سەد جار بڵێت (سبحان الله) چاكترە لە سەد حوشتر، وە هەركەسێك پێش خۆركەوتن و پێش خۆر ئاوابوون سەد جار بڵێت: (الحمد لله) باشترە لە سەد ئەسپ(فرس) كە لە ڕێگای خوادا سواری بن، وە هەركەسێك پێش خۆركەوتن و پێش خۆر ئاوابوون سەد جار بڵێت: (الله اكبر) باشترە لە ئازاد كردنی سەد كۆیلە، وە هەركەسێك پێش خۆركەوتن و پێش خۆر ئاوابوون سەد جار بڵێت: (لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير) لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ كەسێك بە كردەوەیەكی تری لەم باشترەوە نایەت مەگەر كەسێك وەك ئەمی ووتبێت، یان (زیكر)ی زیاتری ووتبێت). أخرجه النسائي في السنن الكبرى٢٠٥/٦ برقم (١٠٦٥٧) وحسنه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب١٦٠/١ برقم(٦٥٨).**

**١٨- ووتنى:** ((أستَغفِرُ اللّهَ)) **سەد جار بەيانيان.**(٩٥)

**١٩- بەيانيان (دە) جار بڵێ:** ((لاَ إِلَهَ إلاّ اللّهُ وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ، يُحيِي وَيُميتُ، وَهوَ عَلى كُلِّ شَيءٍ قَديرٌ)).(٩٦)

**٢٠- بەيانيان(يەك)جار بڵێت:** ((لاَ إِلَهَ إلاّ اللّهُ وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ، وَهوَ عَلى كُلِّ شَيءٍ قَديرٌ)).(٩٧)

---

(٩٥) پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (هەرگیز هیچ بەیانیەکم لێ نەبوەتەوە ئیلا سەد جار تیایدا داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکەم)./ رواه الطبراني وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة ٤/١٧٤ برقم(١٦٠٠) وأنظر صحيح الجامع (٥٥٣٤).

(٩٦) (هەرکەسێك کاتێ بەیانی لێ دەبێتەوە (دە) جار بڵێت: لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد يحيي ويميت وهو على كل شيء قدير. ئەوا خوای گەورە بە هەر دانەیەك کە ووتویەتی (دە) چاکەی بۆ دەنوسێت و بەهۆیەوە (دە)خراپەی لەسەر لادەبات و (دە) پلە بەرزی دەکاتەوەو بۆی دەبن وەك ئەوەی کە (دە) بەندەی ڕزگار کردبێت و بۆی دەبنە مایەی دابەزینی کۆمەڵە مەلائیکەتێکی پارێزەر هەر لە سەرەتای ڕۆژەوە هەتا کۆتایی یەکەی، وە هیچ کەسێك لەو ڕۆژەدا کردەوەیەکی ئەنجام نەداوە پێشی ئەمی دابێتەوە، خۆ ئەگەر ئێوارەش بیڵێت هەر بە هەمان شێوەیە(هەمان پاداشتی هەیە). صححه الألباني في السلسلة الصحيحة برقم(٢٥٦٣).

(٩٧) هەرکەسێك بەیانیان(یەك)جار بڵێت: ( لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير). خوای گەورە بەئەندازەی ئەو کەسە خێری بۆدەنووسێ کە بەندەیەکی ڕزگارکردبێ لەنەوەکانی ئیسماعیل پێغەمبەر(عليه الصلاة و السلام). وە (دە) چاکەی بۆ دەنوسێت و (دە)خراپەی لەسەر لادەبات و(دە)پلە بەرزی دەکاتەوەو پارێزراو دەبێ لە شەیطان هەتا ئێوارەی لێ دەبێتەوە. وە ئەگەر ئێوارە بیڵێ بەو جۆرەیە هەتا بەیانی لێ دەبێتەوە./ صححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب١/١٥٩ برقم(٦٥٦). قال حماد فرأى رجل رسول الله (ﷺ) فيما يرى النائم فقال يا رسول الله إن أبا عياش يحدث عنك بكذا وكذا قال صدق أبو عياش. رواه أبو داود وهذا لفظه والنسائي وابن ماجه واتفقوا كلهم على المنام.

**٢١- (سەد جار لە بەیانیان و سەد جار لە ئێواراندا) بڵێ:** ((لاَ إِلَهَ إلاّ اللّهُ وَحدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ، وَهوَ عَلى كُلِّ شَيءٍ قَديرٌ)).[٩٨]

**٢٢- بەیانیان سەد جار بڵێ:** ((سُبْحانَ اللهِ العَظيمِ وَبِحَمْدِهِ)).[٩٩]

# کاتی هەڵهاتنی خۆر

(( الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَقَالَنَا يَوْمَنَا هَذَا، وَلَمْ يُهْلِكْنَا بِذُنُوبِنَا)).[١٠٠]

**واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی یارمەتی داین لەمڕۆماندا و بە هۆی گوناهی خۆمانەوە بە هیلاکی نەبردین .**

---

(٩٨) هەرکەسێك لە ڕۆژێکدا (دوو سەد)جار (سەد جار لە بەیانیان و سەد جار لە ئێواراندا) بڵێت: ( لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير). هیچ کەسێك پێشی ناکەوێت کە لە پێشییەوە بووبێت، وە هیچ کەسێکیش لەوانەی لە دوای ئەمەوەن ناگەنەوە پییایدا، مەگەر کەسێك کردەوەیەکی لەم باشتری ئەنجام دابێت./ صححه الألباني في السلسلة الصحيحة برقم (٢٧٦٢).

(٩٩) (هەرکەسێك بەیانیان سەد جار بڵێت: (سبحان الله العظيم وبحمده) هەروەها ئێوارانیش، ئەوا هیچ کەسێك لە دروستکراوان لە بە کردەوەیەکی هاوێنەی ئەمەوە نایەن). أخرجه أبوداود(٥٠٩١) وصححه الألباني أنظر التعليق الرغيب ٢٢٦/١.

(١٠٠) صحيح مسلم (٥٦٤/١). برقم(٨٢٢). ووتەی عبدالله ی کوڕی مەسعودە ( ڕەزای خوای لێ بێت).

# نەخەوتنەوە دواى نوێژى بەيانى تا نوێژى چێشتەنگاو دەكات

**پێغەمبەرى خوا(ﷺ) دەفەرموێت:** ((مَنْ صَلَّى الْفَجْرَ فِي جَمَاعَةٍ ثُمَّ قَعَدَ يَذْكُرُ اللَّهَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَانَتْ لَهُ كَأَجْرِ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ)).[١٠١]

**واتە: هەركەسێك نوێژى بەيانى بكات بە جەماعەت و پاشان دابنيشێت زيكرى خواى گەورە بكات هەتا خۆر هەڵدێت و پاشان دوو ڕكات نوێژ بكات ئەوا بە ئەندازەى پاداشتى حەج و عومرەيەكى تەواو تەواو تەواوى هەيە.**

---

**(١٠١) رواه الترمذي وصححه الألباني في صحيح الجامع برقم (٦٣٤٦).**

# خواردن و خواردنەوە

**پێش خواردن بڵێ** (بِسْمِ اللهِ). **واتە: (خۆم پەنا ئەدەم )بە ناوی خوا. بەڵام ئەگەر بیرت چوو ئەوا هەرکاتێ بیرت کەوتەوە بڵێ:** ((بِسْـمِ اللهِ أَوَّلَـهُ وَآخِـرَهُ))[١٠٢] **یـان:** (( بِسْـمِ الله فـي أوَّلِـهِ وَآخِـرِهِ))[١٠٣] **چونکە ئەو خواردنێکی نوێ دەخوات و دەبێتە ڕێگر لەوەی شەیطانی پیس لێی خواردوە.**

**واتـە: (خـۆم پـەنا ئەدەم)بـە نـاوی خـوای گـەورە لـە سـەرەتاو کۆتاییدا.**

**یان پێش خواردن بڵێ:** (( اللَّهُمَّ بارِكْ لَنا فيهِ وَأطعِمْنا خَيراً مِنهُ )).

**واتە: خوایە بەرەکەت بڕژە بەسەرماندا لەمەداو(خێری زیادو زۆرو بـەردەوام بکـە) لـەم خواردنـە چـاکترمان بدەرێ(لـە خـواردنی بەهەشت).**

**بەڵام ئەگەر شیرت خواردەوە لە سەرەتادا بڵێ:** (( اللَّهُمَّ بارِك لَنا فيهِ وَزِدْنا مِنهُ )).[١٠٤]

---

**(١٠٢) صـحيح أبـي داودبـرقم(٣٧٦٧) وأنظـر صـحيح الترغيـب والترهيـب (٢/٢٣٧) برقم(٢١٠٧).**

**(١٠٣) رواه ابن حبان في صحيحه وابن السني والطبراني وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة١/٣٣٥ برقم(١٩٨)**

**(١٠٤) الترمذي ٥/ ٥٠٦ برقم(٣٤٥٥) وأنظر صحيح الترمذي ٢/ ١٥٨. وحسنه الألباني. چونکە هیچ شتێك نىيە جێگای شیر بگرێتەوەو بری خواردن و خواردنەوە بکەوێت و برسێتی و تینویەتیش نەهێڵێت جگە لە شیر.**

واتە: خوایە بەرەکەت بڕژە بە سەرمان دا لەمەداو لەمەمان بۆ زیاد بکە.

وە (خوای گەورە لە بەندەی خۆی ڕازی دەبێت کاتێ خواردنێك دەخوات یان خواردنەوەیەك دەخوات حەمدو سوپاسی خوای گەورەی لەسەر بکات).[(١٠٥)]

( وە بە دەستی ڕاستت و لەبەردەمی خۆتەوە بخۆ ).[(١٠٦)]

(وە بەسێ پەنجەی گەورەو شایەتمان و ناوەڕاست بخۆو دوایی پێش دەست سڕین هەرسێکیان بلێسەرەوە).[(١٠٧)]

وە (قاپەکەش بلێسەرەوەو هەرچییەکت لەدەست کەوتە خوارەوە لە پارو هەڵی بگرەوەو پاکی بکەرەوەو بیخۆو فڕێی مەدە بۆ شەیطان ).[(١٠٨)]

وە ( بە پێوە  خواردنەوەو خواردن نەخۆیت ).[(١٠٩)]

---

(١٠٥) صحيح مسلم برقم(٢٧٣٤).

(١٠٦) البخاري ٩/٤٥٨ ومسلم (٢٠٢٢).

(١٠٧) مسلم (٢٠٣٢). چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێش دەست سڕین هەرسێ پەنجەکانی دەلێسایەوە.

(١٠٨) مسلم (٢٠٣٤) .

(١٠٩) مسلم (٢٠٢٤) – (١١٣). بەڵام شت خواردن بەدەم ڕێگاوەو بە ڕۆیشتنەوە دروستەو هاوەڵەکان (ڕەزای خوای گەورەیان لێ بێت) کردویانە/ رواه الترمذي(١٨٨١) وقال: حديث حسن صحيح عن إبن عمر( رضي الله عنهما) هەرچەندە لەوانەیە(عورفەن) هەندێ ناوچە بە جوانی نەزانن.

**وه (به ڕاكشانيشه‌وه خواردن مه‌خۆ).[110]**

**وه (پێغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ) به سێ قوم و هه‌ناسه ئاوی ده‌خوارده‌وه، به جۆرێك كه ده‌فره‌كه‌ی ده‌برد بۆ ده‌می (بسم الله)ی ده‌كردو كه ده‌می لێ به‌رده‌دا (الحمدلله)ی ده‌كرد، وه به‌م شێوه‌یه سێ باره‌ی ده‌كرده‌وه).[111]**

**وه كه ته‌واو بوویت و لێ بوویته‌وه بڵێ:** (( أَلحَمدُ للهِ الّذي أطعَمَني هذا وَرَزَقَنيهِ مِنْ غَيرِ حَولٍ مِنّي وَلا قُوَّةٍ )).[112]

**واته: سوپاس و ستایش بۆ ئه‌و خوایه‌ی كه ئه‌م خواردنه‌ی دامێ‌و ڕزق و ڕۆزی دام به بێ گۆڕان و توانای خۆم.**

---

(110) چونكه پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌فه‌رموێت: (( لا آكُلُ مُتَّكِئاً )) رواه البخاري (472/9).
ئیمامی الخطابي ده‌فه‌رموێت: مه‌به‌ست به‌(المُتَّكِيء) لێره‌دا بریتی‌یه له دانیشتن له‌سه‌ر پارچه دۆشه‌ك و شتی نه‌رم. وه مه‌به‌ستی ئه‌وه‌یه كه‌وا له‌سه‌ر ئه‌و پارچه قوماشانه دانانیشێ وه‌كو كه‌سێك بیه‌وێ زۆر بخوات به ئیسراحه‌ت، به‌ڵكو به شێوه‌یه‌كی له‌سه‌ر پاڵه‌یی دائه‌نیشێ و به پێی پێویست ده‌خوات. ئه‌مه ووته‌ی(الخطابی)یه. وه غه‌یری ئه‌ویش ئاماژه ده‌كه‌ن به‌وه‌ی كه‌(المُتَّكِيء): ئه‌و كه‌سه‌یه كه ڕاكشاوه‌و له‌سه‌ر ته‌نیشتی كه‌وتووه. والله أعلم/ بڕوانه ریاض الصالحين(ص/265).

(111) أخرجه الخرائطي والطبراني في المعجم الأوسط، صححه الألباني في السلسلة الصحيحة 272/3برقم(1277).

(112) هه‌ركه‌سێ ئه‌مه بڵێ خوا له گوناهه‌كانی له‌وه پێشی خۆش ده‌بێ/ أخرجه أصحاب السنن الأربع إلا النسائي وانظر صحيح الترمذي 159/3. وصحيح سنن أبي داود 760/2 وهو حديث حسن.
به‌ڵام وه‌ك تێبینی‌یه‌ك فه‌رمووده‌ی: (( الحَمدُ للهِ الّذي أَطعَمَنا وَسَقانا وَجَعَلَنا مُسلِمينَ )) فه‌رمووده‌یه‌كی ضه‌عیفه‌( بڕوانه تخريج الكلم الطيب لاپه‌ڕه 188).

**یان بڵێ:** (( ألحمدُ للهِ حَمْداً كَثيراً طَيِّباً مُبارَكاً فيهِ، غَير{ مَكفيّ وَلا} مُوَدَّعٍ، وَلا مُستَغنىً عَنهُ رَبَّنا )).(١١٣)

**واتە: سوپاس و ستایش بۆ خوا، ستایشێکی زۆری پاك و خالصی پیرۆز بێ، خوای پەروەردگار پێویستی بەکەس نییەو بێ نیازە بە کەس، وە هەرگیز داوا لێ کردن و پێویستی بوون بەوەی لای ئەوە واز لێ ناهێنرێت و هەردەم نیازمان بەوە. وە بێ نیازیش نین لە سوپاس کردنی خوای گەورە.**

**یان بڵێ:** (( ألحَمدُ للهِ الّذي أطعَمَ وَسَقَى وَسَوَّغَهُ وَجَعَلَ لَهُ مَخْرَجاً)).(١١٤)

**واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە خواردنی داینێو تێرئاوی کردین و دابەزاندنی خواردنەکەی ئاسان کردووە لە گەرووداو دەرچەی بۆ داناوە.**

**یان بڵێ:** (( اللَّهُمَّ أطعَمْتَ وَأسقَيتَ{وأغنيت} وَأقنَيتَ. وَهَدَيتَ وَأحيَيْتَ. فلَكَ الحَمدُ على ما أعطَيتَ )).(١١٥)

---

**(١١٣) البخاري ٢١٤/٦ برقم(٥٤٥٨) والترمذي بلفظه ٥/ ٥٠٧ برقم(٣٤٥٦). وفي روايةٍ: (ألحَمدُ للهِ الّذي كَفانا وَأروانا غيرَ مكفيّ ولا مَكفور ).رواه البخاري (٥٤٥٩).**

**(١١٤) رواه أبو داود(٣٨٥١) وصححه الألباني انظر(صحيح سنن أبي داود ٧٣٠/٢).**

**(١١٥) رواه أحمد وصححه الالباني: سلسلة الأحاديث الصحيحة ١١١/١برقم (٧١). وما بين المعكوفين في الكلم الطيب ١٥٢/١ برقم(١٩٠) واسناده صحيح. واخرجه أحمد وفيه: اللهم إنك....وفيه (واجتبيت) بدل: (وأحييت).وصححه الألباني في صحيح الجامع(٤٧٦٨).**

واتە: خوایە تۆ خواردن و خواردنەت داوەو ماڵ و هەموو شتێکی ترت بە بەندەکانت بەخشیوەو هیدایەتت داوەو ژیاندووتە.سا ستایش و سوپاس بۆ تۆیە لەسەر ئەوەی کە بەخشیوتە .

( وە ئەگەر ئاو یان شیرت خواردەوە بە دانیشتنەوە بیخۆرەوە).(١١٦)

وە(هەناسەی لەسەر مەدەو فووی لێ مەکە).(١١٧)

وە (سێ هەناسە بدە لە دەرەوەی جامەکە لە کاتی خواردنەوەدا).(١١٨)

وە ئەگەر یەکێك ویستی ئاوت بداتێ(یان ئاوی دایتێ) بڵێ:

((اللَّهُمَّ أطعِمْ مَن أطعَمَني وَاسقِ مَن سَقاني )).(١١٩)

واتە: خوایە خواردن بدە بەو کەسەی خواردنم دەداتی و ئەو کەسە تێر ئاو بکە کە دەیەوێت ئاوم بداتێ.

وە( ئەو کەسەی کە ئاو دەگێڕێت با خۆی کۆتا کەس بیخواتەوە).(١٢٠)

---

(١١٦) مسلم (٢٠٢٤) – (١١٣).

(١١٧) الترمذي (١٨٨٩) وقال: حديث حسن صحيح، وأخرجه أبو داود (٣٧٢٨) وابن ماجه (٣٤٢٨) وإسناده صحيح عن ابن عباس (رضى الله عنهما) .

(١١٨) البخاري ٨١/١٠ ومسلم (٢٠٢٨).

(١١٩) مسلم ١٢٦/٣ برقم (٢٠٥٥)

(١٢٠) الترمذي (١٨٩٥) وقال: حديث حسن صحيح. وأخرجه مسلم (٦٨١) في حديث مُطَوَّل.

وه( ئەگەر حەزت لە خواردنێك نەبوو عەیبی لێ مەگرەو یان بیخۆ یان وازی لێ بێنە).[(١٢١)]

(لە كاتی ئاوو شیر گێڕاندا لە لای ڕاستەوەی خۆتەوە دەست پێ بكە).[(١٢٢)]

( ئادەمیزاد هیچ دەفرێكی پڕ نەكردووە لە وورگی خراپتر بێت، وە چەند پارووییەك بەسە بۆ مرۆڤ كە پشتی ڕاگیر بكات ئەگەر نا با سێ یەكی گەدەی دابنێ بۆ خواردن و سێ یەكی بۆ خواردنەوەو سێ یەكی بۆ هەناسە ).[(١٢٣)]

( وە ئەگەر مێشكێك كەوتە ناو خواردنەوەی یەكێكتانەوە با هەمووی نوقم بكات و دەری بهێنێتەوە تیادا. چونكە لە باڵێكی دا دەردو لە باڵەكەی تری دا دەرمان هەیە).[(١٢٤)]

تێبینی: دەست نوێژگرتن پێش نان خواردن سوننەتە بۆ كەسی لەش گران.[(١٢٥)]

---

(١٢١) چونكە پێغەمبەر(ﷺ) هەرگیز عەیبی لە خواردن نەگرتووە/ البخاري ٤٧٧/٩ ومسلم (٢٠٦٤).

(١٢٢) البخاري ٥/ ١٤٨ و ١٠/ ٦٦ ومسلم (٢٠٢٩).

(١٢٣) رواه الامام أحمد والترمذي(٢٣٨١) والنسائي وابن ماجه وقال الترمذي: حديث حسن صحيح، وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة٣٣٦/٥ برقم(٢٢٦٥).

(١٢٤) أخرجه البخاري والدارمي وابن ماجه واخرون والزيادة للبخاري. انظر سلسلة الاحاديث الصحيحة رقم (٣٨).

(١٢٥) رواه أبوداود ٢٢٢/٣٧٥/١ وانظر سلسلة الأحاديث الصحيحة(٦٧٤/١) رقم الحديث (٣٩٠).

# نزا و پاڕانەوەی میوان بۆ خاوەن ماڵ

(( اللَّهُمَّ بارِكْ لَهُمْ فِيما رَزَقْتَهُم، وَاغفِرْ لَهُم وَارحَمْهُم )).(١٢٦)

**واتـه: خوایـه بەرەکـەت بخـەرە ئـەو ڕۆزییـەی داوتنـەتیو لێ یـان خۆش بەو بەزەیت پێیان دا بێتەوە.**

# لە کاتی بینینی نۆبەرەی میوەدا

(( اللَّهُمَّ بارِكْ لَنا في ثَمَرِنا. وَبارِكْ لَنا في مَدينَتِنا، وَبارِك لَنا في صاعِنا، وَبارِك لَنا في مُدِّنا )).(١٢٧)

**واتە: خوایە بەرەکەت بخەیتە ناو میوەمانـەوەو بەرەکـەت بخـەرە شارەکەمانەوەو بەرەکـەت بخـەرە دەفـری(صاع) مانەوە(کـە چوار مشتی هەردوو دەست بۆ کەسێکی مامناوەند دەگرێت)و بەرەکەت بخەرە ناو(مُدّ) واتە مشتمانەوە.**

**یـان بڵـێ:** ((اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا، وَفِي ثِمَارِنَا، وَفِي مُدِّنَا، وَفِي صَاعِنَا، بَرَكَةً مَعَ بَرَكَةٍ )).(١٢٨)

---

(١٢٦) مسلم ١٦١٥/٣ برقم(٢٠٤٢).

(١٢٧) وە پاشان دەیدات بە بچوکترین منداڵ لەو شوێنەدا/ مسلم ١٠٠٠/٢ برقم(١٣٧٣).

(١٢٨) وە پاشان دەیدات بە بچوکترین منداڵ لەو شوێنەدا/ صحیح مسلم(١٣٧٣). وانظر صحيح وضعيف سنن ابن ماجة ٣٢٩/٧ برقم (٣٣٢٩).

# داماڵین و داکەندنی پۆشاك و جل

**( پـەردەی نێـوان چـاوی جنۆکـەو داوێن(عـەورەتی) ئـادەمیزاد ئەوەیە کە کاتێ یەکێکیان پۆشاکی دانا بڵێ(بِسمِ اللّٰه).[129]**

# چوونە سەر ئاو

**لە پێش چوونە ژوورەوە بڵێ:** (( {بِسمِ اللّٰه} اللَّهُمَّ إنَي أعوذُ بِكَ مِنَ الخُبُثِ وَالخَبائِثِ )).[130]

**واتە: (خۆم پەنا ئەدەم)بەناوی خوا، خوایە پەنات پێ ئەگرم لە شەیطانە نێرەو مێیەکان.**

**لە ڕیوایەتێکی تریدا:** ((أَعُوْذُ بِاللّٰهِ مِنَ الخُبْثِ وَالخَبائِثِ )).[131]

---

(١٢٩) الترمذي٢/٥٠٥ برقم(٦٠٦) وغيره وانظر الأرواء برقم(٥٠) وصحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع ٣/٢٠٣ برقم(٣٦١٠).

(١٣٠) أخرجه البخاري ١/٤٥ برقم(١٤٢) ومسلم ١/٢٨٣ برقم(٣٧٥). (الخُبْث) بە سکونی سەر (باء)ەکەو بە ضەممەش دەخوێندرێتەوە. وە زیادەی (بسم اللّٰه) لەو فەرموودەیەدا نیيە بەڵکو أخرجها سعيد بن منصور، (انظر الفتح الباري ١/٢٤٤) وەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (پەردەی نێوان چاوی جنۆکەو داوێنی ئادەمیزاد ئەوەیە کە کاتێ چووە سەر ئاو بڵێ (بسم اللّٰه). رواه الطبراني في الاوسط وصححه الالباني (صحيح الجامع ٣/٢٠٣)

(١٣١) أخرجه أبوداود وصححه الألباني، أنظرصحيح وضعيف سنن أبي داود١/٢ برقم(٦) وأنظر صحيح الجامع برقم (٢٢٦٣).

**وه كه هاتيته دەرەوه بڵێ: (( غُفرانَكَ )).(١٣٢)**

**واته: خوايه لێم خۆشبه.**

---

تێبینی/ شێخ ئەلبانی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی کاتی ووتنەکەی فەرمویەتی: (زانایـان یەکـدەنگن لەسـەر ئـەوەی مەبەسـت پێـی ئەوەیـە: کـاتێ ویسـتی بچـێتە سەرئاوەکە(واتە لە دەرەوە) ئەمە دەڵێت). سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة وأثرها السيئ في الأمة ٣/١١٦.

وه هەروەها فەرمویەتی: (پاشان بزانە لە هیچ یەکێك لـەم فەرمودانـەو غـەیری ئەمانـەدا نەهاتووە کە دەنگ هەڵبڕێت). تمام المنة ١/٥٨.

(١٣٢) ابوداود ١/٣٠ رقم (٣٠) والترمذي ١/١٢ رقم (٧) وقال: حديث حسن غريب، وابـن ماجه ١/١١٠ رقم (٣٠٠). وصحّحَهُ الألباني في صحيح أبي داود برقم(٢٣) .

تێبینی/ دەربارەی حیکمەت و هۆکاری ووتنی ئەم زیکرە:

(ووتراوە لەبەر ئەوەیە ترسی ئەوەی هەیە کەمتەرخەم بێت لە بە جێگەیاندنی شوکرو سوپاسی خوای گەورە لەسەر ئەو نیعمەتـە گەورەیـە کە بریتیـیە لـە خواردن پێدان و پاشان هەرس کردن و ئاسان کردنی دەرچوونی پاشەڕۆی، بۆیە پێی وایە سوپاسکردن کەمە لە حەقی ئەم نیعمەتەدا بۆیە داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکات). الفتوحات الربانية لابن علاّن ١/٤٠١.

وه ووتراوە: (لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) وای فەرمووە چونکە ئەو ماوەیـە یـادی خـوای نـەکردووە. بـەڵام ڕای یەکـەم بـەهێزترە). بڕوانـە تحفـة الأحـوذي بشـرح جـامع الترمذي١/٤٢.

(لەوانەشە لەبەر هەردوو هۆکارەکەو هۆکـاری تـریش بێـت کـە ئێمـە نـایزانین. وه ئەمـە تایبەت نییە بە ئاودەستەوە بەڵکو ئەگەر لە چۆڵەوانیشدا بێت هەر دەیڵێت). بڕوانە سبل السلام ١/٢٥٣.

ابن القيم فەرمویەتی: (لەمەشدا نهێنییەك هەیە-والله أعلم- کە بریتییە لەوەی مانەوەی پاشەڕۆ لاشە قورس دەکات ئازاری دەدات، هەروەها گوناهیش بە مانـەوەی دڵ قورس دەکات و ئازاری دەدات، کەواتە هەردوکیان ئازاربەخش و زیانبەخشن بۆ لاشەو دڵ، جا سوپاسی خوا کردن لەکاتی دەرچوونیدا لەسەر ڕزگاربونێتی لـەم ئازارارە بۆ لاشـەیو ئاسودە بوونی، بۆیە داوا لە خوا دەکات کە ڕزگاری بکات لە ئازارەکـەی تـریش و دڵـی ئاسودە بکات و سوکی بکات). إغاثة اللهفان١/٥٨-٥٩

**تێبینی: زانایان پێیان وایە چاك وایە لە پێشدا قاچی چەپ پێش بخرێت بۆ چوونە ژوورەوەو قاچی ڕاستیش پێش بخرێت بۆ هاتنە دەرەوە.**

# جل و بەرگ لەبەر کردن

**لە پێش دا لای ڕاست لەبەر بکە،**[133] **وە بڵێ** (( ألحَمدُ للهِ الّذي كَساني هذا وَرَزَقَنيهِ مِن غَيرِ حَولٍ مِنّي وَلا قُوّةٍ )).[134]

**واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەم پۆشاکەی پۆشیم و پێی بەخشیم بە بێ هیچ گۆڕان و توانای خۆم.**

# لەبەر کردن و پۆشینی جل و بەرگی نوێ

(( اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ. أنتَ كَسَوتَنيهِ. أسأُلُكَ مِنْ خَيرِهِ وَخَيرِ ما صُنِعَ لَهُ. وَأعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ ما صُنِعَ لَهُ )).[135]

**واتە: خوایە ستایش بۆ تۆیە تۆ پۆشیمت و پۆشتەت کردم، داوای چاکەی ئەم پۆشاکەت لێ ئەکەم( کە بریتی یە لە پاکێتی و**

---

**(١٣٣) أبوداود (٤١٤١) وسنده صحيح وأخرجه الترمذي (١٧٦٦) وصحَّحَه ابن حبان(١٤٧). وهو حديث صحيح. انظر زاد المعاد ٣٨٧/٢ وصحيح الترمذي ٥/١.**

**(١٣٤) (هەرکەسێك ئەمە بڵێ خوای گەورە لە تاوانەکانی پێشووی خۆش دەبێ). أخرجه أهل السنن الا النسائي انظر إرواء الغليل ٤٧/٧ هذا حديث حسن. وانظر(صحيح أبي داود ٧٦٠/٢) .**

**(١٣٥) أبو داود برقم(٤٠٢٠) والترمذي برقم(١٧٦٧) والبغوي. وأنظر صحيح الترمذي١٧١/٣. وهو حديث حسن. وانظر مختصر شمائل الترمذي للألباني ص/٤٧.**

مانەوە لـە ژیانـداو لەبـەرکردنی بۆ پێویسـتی و ئـیش و کـار) وە داوای ئەو خێرو چاکەیەت لێ دەکەم کە بۆی دروست کراوە( ئەو پێویستیانەی پۆشاکی بۆ دروستکراوە وەك پاراستن لەگەرماو سەرماو عەورەت پۆشین)، وە پەنات پێ ئەگرم لە خراپەی و ئەو خراپەیەی بۆی دروست کـراوە( کـە بریتـی یـە لـە لادانـی بـە لای ئەوەی بە خۆ بەزل زانین و فیزەوە لەبەری بکات ).

# ئەگەر یەكێك بەرگی نوێی لەبەركردبوو

١- پێی بڵێ: (( تُبلِي وَيُخلِفُ اللهُ تَعالى )).(١٣٦)

واتە: یاخوا بیڕزێنیت (ئەوەندە لەش ساغ و تەمەن درێـژ ببـی و بیدڕێنیت) وە خوای گەورە پۆشاکی چاکتر بخاتەوە شوێنی.

٢- (( إلبِس جَديداً. وَعِشْ حَميداً. وَمُتْ شهيداً )).(١٣٧)

---

(١٣٦) اخرجـه ابـوداود (٤١/٤)رقـم(٤٠٢٠) وانظـر صـحيح أبـي داود٢/٧٦٠ وسـنده صـحيح، ئەمـە ووتـەی هاوەڵـەکانی پێغەمبـەرە(ﷺ) کـە بـە یـەکتریان فـەرمووەو هەروەها لە وتەی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە بە لەفزی: (أبلي و أخلِقي) ڕیوایەت کراوە وە بە(وأخلِفي) بە(فاء) دوو یان سێ جار بیڵـێ/ واخرجـه البخـاري كتـاب الجهـاد ١٨٨ واللبـاس ٢٢ والادب ١٧. بـەم جـۆرە: (أَبْلِـي وَأَخْلِقِـي، ثُـمَّ أَبْلِـي وَأَخْلِقِـي، ثُـمَّ أَبْلِـي وَأَخْلِقِي).صحيح البخاري برقم (٥٩٩٣).

(١٣٧) پێغەمبەری خوا(ﷺ) پۆشاکێکی سپی بینی لەبـەری عومـەردا(رضـي الله عنـه) فەرموی: ئەمە نوێیە یان شۆردراوە؟ فەرمووی: بەڵکو شۆردراوە (لە ڕیوایەتێکی دا: نوێ یە) ئەویش فەرموی:........./ابن ماجه ١١٧٨/٢ برقم(٣٥٥٨) والبغوي ٤١/١٢ وانظر صحيح ابن ماجه ٢٧٥/٢. وهو صحيح. زاد الدبري: (... ويرزقك الله قرة عين في الدنيا والآخرة). قال: وإياك يارسول الله./ أنظر السلسلة الصحيحة٦٢٠/١ برقم(٣٥٢).

واتـه: یـاخوا پۆشـاكی تـازه لەبـەر بكـەیت و بـه سوپاسـكاری سوپاس كراوی بژیت (بەوەی ژیانت لەسەر گوێڕایەڵی خوا بەیتە سـەر سوپاسـكاری خوابیـت و سوپاسـكراوی لای خـوای گـەورە پاشان لای خەڵكی بیت)، وه به شەهیدی سەربنێیتەوه و بمریت.

# له پێكردنی نەعل و پێڵاو

له پێشدا لای ڕاست لـه پـێ بكـەو لـه كـاتی داكەندنـدا لای چـەپ دابكەنه.[(١٣٨)]

وه پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) نـەهی كـردووه لـه لـەپێ كردنـی نـەعل بـــه پێـــوه.[(١٣٩)] وه بـــه یـــەك تاكـــەوه مـــەڕۆ بـــه ڕێدا. یان هەردووكی له پێ بكه یان هەردووكیان دابكەنه.[(١٤٠)]

---

(١٣٨) البخاري ٢٦٣/١٠ ومسلم (٢٠٩٧).

(١٣٩) أبوداود (٤١٣٥) بإسـنادٍ حَسَـن عـن جـابر ورجالـه ثقـات وهـو حـديث صـحيح بشواهده عن أبي هريرة وعبدالله بن عمر وأنس(رضي اللهُ عنهم).

تێبینی:

ئیمامی (المناوي) دەفەرموێت: فەرمودەكه بۆ ڕێ نیشاندان و ئیرشاده. چونكه بـه دانیشـتنەوه لـه پـێ كردنـی ئاسـان تـره. بۆیـه ئیمـامی(الطَـيِّبي) وه غـەیری ئـەو نەهییەكەیان تایبەت كردووه به لەپێ كردنی ئەو پێڵاوەی كه له پێ كردنی به پێوه نارەحەتەوەو ماندووت دەكات وەكو( ناسومه و خـوف) ( كه قـەیتانی هەیـە) نـەك( قابقـاب و سـرموزه ) وه خـوای گـەورەش زانـاتره بـه حیكمـەتی تەشـریع و نـەهی یەكانی/بڕوانه سلسلة الصحيحة للألباني(٣٥٠/٢).

(١٤٠) البخاري ١٠/ ٢٦٢،١٦١ ومسلم (٢٠٩٧).

# چوونە دەرەوە لەماڵ[7]

١- (( بِسمِ الله، تَوَكَّلْتُ عَلَى اللهِ. لا حَوْلَ وَلا قُوةَ إلاّ باللهِ )).(١٤١)

**واتە: (خۆم پەنا ئەدەم)بە ناوی خوا پشتم بەخوای گەورە بەست (وە هەموو کارەکانم تەسلیمی ئەو کرد)، هیچ گۆڕان و توانایـەك نییە مەگەر بەخوای گەورەوە .**

٢- (( اللَّهُمَّ إنّي أعوذُ بِكَ أن أضِلَّ أو أُضَلّ. أو أَزِلّ أو أُزَلَّ. أو أَظلِمَ أو أُظلَمَ. أو أجهَلَ أو يُجْهَلَ عَلَيَّ )).(١٤٢)

---

**(١٤١) (ئەگـەر لـە مـاڵ دەرچـێت و ئەمـە بڵـێ ئەوا(لـە لایـەن خـوای گـەورەوە یـان مەلائیکەتەوە) پێی دەوترێت: هیدایەت درایت (بۆ سەر ڕێگای حەق و ڕاست ) و کیفایەت کرایت (و دوورخرایتەوە لە خراپە و خەمی دونیاو قیامەت) و پارێزرایت (لەشـتە پـەنهان و خراپـەکان و دوژمنـەکانت لـە شـەیاتین و غـەیری ئـەوان)، وە شەیطانی لێ دوور دەخرێتەوە. وە شەیطانێکی تر دەڵێ: تۆ چ دەستەڵاتێکت هەیە بەسەر کەسێك دا کە هیدایەت درابێت و کیفایەت کرابێت و پارێزرابێت/ رواه أبوداود ٣٢٥/٤ رقم(٥٠٩٤) و الترمذي٥/٤٩٠ برقم(٣٤٢٧) وصحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع برقم(٦٤١٩) وانظر صحيح الترمذي٣/١٥١.**

**(١٤٢) أخرجَهُ أهل السنن. وصححه الألباني انظر صحيح الترمذي ٣/١٥٢ وصحيح ابن ماجه ٢/٣٣٦ برقم (٣١٣٤) لـە ام سلمەوە (رضـي الله عنهـا) فەرمویـەتی: هـەرگیز پێغەمبەری خـوا(ﷺ) لـەماڵ دەرنەدەچوو ئیلا سـەری بـەرز دەکـردەوەو تەماشـای ئاسمانی دەکردوو دەیفەرموو:......) وأخرجه النسائي بلفظ: (بسم الله، رب أعوذ بك من أن أزل، أو أضل، أو أظلم، أو أظلم، أو أجهل، أو يجهل علـي) عـن أم سـلمة زاد (ابـن عساكر) : أو أن أبغي أو يبغى علي./صححه الألباني أنظر صحيح وضعيف الجـامع الصغير(٤٨٥/١٨)برقم(٨٨٣٨).**

**<u>تێبینـی/</u> بـەڵام شـێخی ئـەلبانی لـە الكلـم الطيـب (٥٩) ط٣. وفي ط: المعـارف (٦٠) دەفەرموێت: (لكن رفع الطرف شاذ!) واتە: تەماشا کردنی ئاسمان لە فەرمودەکەدا شازە. تراجعات العلامة الألباني في التصحيح والتضعيف (٢١/١).**

واتـه: خوایـه پـەنات پێئـەگرم لـەوەی گـومڕا ببم و( بـه هـۆی ئەنجامـدانی کارێکـەوە لـه ڕێگـای هیدایـەت لابـدەم) یـان گـومڕا بکرێم(لـه لایـەن شـەیطـانـەکانی مـرۆڤ و جنۆکـه). یـان (بـەبێ ئەنقەست)بترازێم و گوناه وتاوان بکەم (بەخۆم یـان خـەڵکی)یان بترازێنـرێم و غـەیری خـۆم گونـاهم پـێ بکـات، یـان سـتەم بکەم(لەخۆم یان خەڵکی) یان ستەمم لێ بکرێ(له خۆم یان سامانم یان ناموسم). یان نەفامی بکەم و کاری نەفامان وئەنجام بدەم یان نەفامیم لەگەڵ دا بکرێ.

# گەڕانەوە بۆ ماڵ

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ تَحِيَّةً مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةً طَيِّبَةً ......﴾ (النور:٦١)

واته: ئەگـەر چوونه ماڵێکـەوە سلاو لـه یـەکتری و خۆتـان بکـەن بەسلاوێکی خوایی پیرۆزو بەفەڕو پاك.(١٤٣)

پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەفـەرموێت: (( سـێ کـەس هـەموویان مسۆگەر زامنن له ژێر چاودێری خوای گەورەدان...)) وه لەوانه:

(١٤٣) تفسير القرآن العظيم ٣/ ٢٧٠ –٢٧١.

(( رَجُلٌ دَخَلَ بَيتَهُ بِسَلامٍ فَهوَ ضامِنٌ على الله عزَّ وَجلَّ )).(١٤٤)

**واتە: پیاوێك بگەڕێتەوە ماڵەوە بە سڵاو كردن زامنە لەلایەن خواوە.**

**وە عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر بگەڕایەتەوە ماڵەوە بە سیواك دەستی پێ دەكرد- واتە: یەكەم شت سیواكی دەكرد-.(١٤٥)**

# پێش ئەوەی لە ماڵ دەرچیت( بۆ سەفەر )

**پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت:** (( إذا خَرَجتَ مِن منزِلِكَ فَصَلِّ رَكعَتَينِ يَمنعانِكَ مِن مَخرجَ السُّوءِ وإذا دخلتَ إلى منزِلِكَ فصلِّ رَكعَتَينِ يَمنعانِك مِن مَدخَل السُّوءِ )).(١٤٦)

---

(١٤٤) صحيح (صحيح سنن أبي داود ٢/٤٧٣) وە لەفەرموودەی صەحیح دا هاتووە: (ئەگەر پیاوێك گەڕایەوە ماڵەوەو یادی خوای گەورە كرد لەكاتی چوونە ژوورەوەو نان خواردنیدا. ئەوا شەیطان بەهاوەڵەكانی دەڵێت: لێرە نەجێگەو نەشێوو خواردنتان نییە) مسلم ژمارە (٢٠١٨).

(١٤٥) صحيح مسلم / كتاب الطهارة باب ١٥/ رقم (٤٤).

(١٤٦) رواه المخلص و البزار والديلمي، وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة(٣/٣١٥) برقم(١٣٢٣).

تێبینی/ شێخ ئەلبانی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (سێ فەرمودە هەیە لەسەر ئەنجامدانی نوێژ لە كاتی ویستی چون بۆ سەفەردا، جا ئایا ئەتوانرێت بكرێتە بەڵگە بۆ دروستی ئەم نوێژە؟ لە وەڵامدا: بەڵێ..). سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة وأثرها السيئ في الأمة١٣/٥١١.

**واتە: ئەگەر نیازت هەبوو لە ماڵ دەرچیت دوو ڕکات نوێژ بکە دەبێتە هۆی پاراستنت لە دەرچوونی خراپ، وە کاتێ دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵ و چویتەوە ژوورەوە دوو ڕکات نوێژ بکە دەبێتە هۆی پاراستنت لە گەڕانەوەو چوونە ژوورەوەی خراپ.**

## ئەگەر چوونە ماڵێکی چۆڵ کە کەسی تێدا نەبوو

عن عبد الله بن عمر قال: ((إذا دخلَ البَيْتُ غَيرُ المَسكونِ، فَلْيَقُلْ: السَّلامُ عَلَينا، وَعَلَى عِبادِ اللهِ الصَّالِحِينَ)).[١٤٧]

**واتە: ئەگەر چویتە ماڵێکەوە کەسی تێدا نەدەژیا بڵێ: سەلامی خوای گەورە لە ئێمەش و لە بەندە چاکەکانی خوا بێت.**

## لە کاتی ڕۆیشتن دا بەرەو مزگەوت

(( اللَّهُمَّ اجعلْ في قَلبي نُوراً. وَفي لِساني نوراً. وَفي سَمعي نُوراً. وَفي بَصَري نوراً. وَمِنْ فَوقي نُوراً. وَمِنْ تَحتِي نُوراً. وعنْ يَميني نُوراً. وَعَنْ شِمالي نُوراً. وَمِنْ أمامي نوراً. وَمِنْ خَلفي نوراً. وَاجعل في نفسي نوراً. وأعظِمْ لي نوراً. وَعَظِّم لي نوراً. واجعَلْ لي نوراً. وَاجعلني نوراً. اللَّهُمَّ أعطِني نوراً. وَاجعَلْ في عَصَبِي نُوراً. وَفي لَحمِي نُوراً. وفي دَمي نوراً.

(١٤٧) **قال الألباني: (حسن الإسناد) أنظر صحيح الأدب المفرد (٤١٧/١) ١٠٥٥/٨١٠- باب إذا دخل بيتاً غير مسكون.**

وفـي شَـعرِي نـوراً وفـي بَشَـرِي نـوراً ))[148]((وَزِدْنـي نُـوراً. وَزدنـي نُـوراً. وَزِدْني نُوراً )).[149] (( وَهَبْ لي نوراً على نور )).[150]

**واته: خوايه لەدڵم دا نور بەرپابكەی(نوری ڕاستەقینه لە ڕۆژی دواییدا-یان-ڕووناكی زانست و هیدایەت)، وە لە زوبانمو بیستن‌و بینین‌و سەرەوەو خوارەوەم و ڕاست‌و چەپم‌و پێشەوەو پاشەوەم‌و لەدەرونمدا، وە نورم بۆ گەورەو (زۆرو پڕ بەرەكەت) بكەیت‌و نورم تیا گەورەبكەیت‌و نورم بۆ بكەیت‌و بمكەیتە نور. خوایە نورم پێ ببەخشی‌و لەدەمارمدا نورم بدەیتێ. وە لە گۆشت‌و خوێن‌و موو پێستمدا. وەنورم بۆ زیاد بكە - سێ جار - وەنور لەسەر نورم پێ ببەخشە.**

**یان بە كورتی بڵێ:**

(( اللَّهُمَّ اجعَلْ في قَلبي نُوراً، وَفي لِساني نوراً، وَاجعَلْ في سَمعي نُوراً. وَاجعَلْ في بَصَري نوراً. وَاجعَلْ مِنْ خَلفي نُوراً. وَمِنْ أمامي نُوراً. وَاجعَلْ مِنْ فوقِي نوراً وِمِنْ تَحتي نوراً. اللَّهُمَّ أعطِني نوراً )).[151]

---

**(١٤٨) هەموو ئەم خاڵانە هاتووە لە البخاري ١١٦/١١ رقم ٦٣١٦ ومسلم ٥٢٦/١ ، ٥٢٩، ٥٣٠ برقم ٧٦٣.**

**(١٤٩) أخرجه البخاري في الادب المفرد برقم ٦٩٥. ص ٢٥٨ وصَحَّحَ إسنادَهُ الألب في صحيح الأدب المفرد برقم ٥٣٦.**

**(١٥٠) ابن حجر هێناویەتی لە(فتح الباري) دا و داویەتە پاڵ ابن أبي عاصم لە(كتاب الدعاء). بڕوانە(الفتح ١١٨/١١). وە فەرموویەتی: لە كۆی جیاوازی ڕیوایەتەكانەوە بیست و پێنج خاڵ هاتووە.**

**(١٥١) رواه مسلم ٥١/٦ وابن خزيمة في صحيحه(٤٤٨).**

واتــه: خوایــه نور(نــوری ڕاســتەقینه لــه ڕۆژی دواییــدا-یــان- ڕووناکی زانست و هیدایەت)بخەیته دڵ و زوبان و بیستن و بینین وپاش و پێش و سەرو خوارەوەم.  سا خوایه نورم پێ ببەخشی.

# چوونه نـاو مزگەوت

(( أعـوذُ بـاللهِ العَظيم وَبوَجهِـهِ الكَريم. وَسُلطانهِ القَديم. مِنَ الشَّيطانِ الـرَّجيم))(١٥٢) (( بســمِ الله والصَّــلاةُ ))(١٥٣) (( والسَّــلامُ عَلَـى رَسُـولِ اللهِ))(١٥٤) (( اللَّهُمَّ افتَحْ لي أبوابَ رَحمَتِكَ )).(١٥٥)

---

تێبینی/ الطيبي دەفەرموێت: داواکردنی نورو ڕۆشنایی یه بۆ هەموو ئەندامەکانی لاشه ئەندام به ئەندام به مانای ئەوەی ئەو ئەندامانه به نوری مەعریفەت و گوێڕایەڵی بڕازێتەوەو له غەیری ئەو دوانەش به دوور بێت، چونکه شەیتانەکان له هەر شەش لاکەوە دەورەی مرۆڤ دەدەن به وەسوەسه دروست کردن، جا ڕزگار بوون لێیـان بـه ڕونـاکیەو نـوره بـۆ ئـەو لایانـه../ تحفـة الأحـوذي (٢٦٢/٩) وفـتح البـاري لابـن حجر(٧٨/١٨).

(١٥٢) ئەگـەر ئەمــه بڵــێ شــەیطـان دەڵــێ: بەدرێــژایی هــەموو ڕۆژەکــه پــارێزراوە لێم / حديث صحيح اخرجه ابوداود برقم(٤٦٦). أنظر صحيح سنن أبي داود ٩٣/١) وانظر صحيح الجامع برقم ٤٥٩١.

(١٥٣) رواه ابن السني برقم (٨٨) وحَسّنَهُ الألباني. بەڵام دواتـر ووتنـی لـەفزی ( بسم الله)ی له فەرمودەکەدا به مونکەرو مەغفیرەی به زەعیف داناوە بڕوانه: مختصر كتاب (تراجع العلامة الألباني فيما نص عليه تصحيحا وتضعيفا) (٢/٣)و مختصركتاب (الإعلام بآخر أحكام الألباني الإمام) (٣/١٠) صفحة ١٩٥. وأنظر السلسلة الضعيفة (١٠٤٦/١٤) برقم(٦٩٥٣)، و انظر ضعيف الجامع رقم : ٤٣٩٤.

(١٥٤) أبوداود ١٢٦/١ برقم(٤٦٥). وانظر صحيح الجامع ٥٢٨/١ برقم(٥١٤).

(١٥٥) مسلم ٤٩٤/١ برقم(٧١٤).

**واته: پەنا ئەگرم بەخوای مەزنو بە ڕووی بەڕێزیو دەستەڵاتی هەربووی بەردەوامی لە شەیطانی نەفرەت لێ کراوی لە ڕەحمەت دەرکراو. (خۆم پەنا ئەدەم)بەناوی خوای گەورەو صەلأت و سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا(ﷺ). خوایە جۆرو دەرگاکانی رەحمەتی خۆتم لێ بکەرەوە.**

# هاتنە دەرەوە لە مزگەوت

(( بسمِ الله. والصَّلاة والسَّلامُ عَلَى رَسولِ الله. اللَّهُـمَّ إنيّ أسألُكَ مِنْ فَضلِكَ. اللَّهُمَّ أعصِمْني مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيمِ )).(١٥٦)

**واته: (خۆم پەنا ئەدەم) بەناوی خوا، صەلات و سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا(ﷺ)، خوایە من داوای فەزڵی خۆتت لێ دەکەم. خوایە بمپارێزە لە شەیطانی نەفرەت لێ کراو.**

---

(١٥٦) بڕوانە تەخریجی ڕیوایەتەکانی فەرموودەی چوونە ناو مزگەوت لە پێشتر. وە زیادەی: (( اللَّهُمَّ أعصِمْني مِنْ الشَّيطانِ الرّجيمِ )) لإبن ماجه برقم(٧٧٣). وهو صحيح . انظر صحيح ابن ماجه ١٢٩/١. وفي رواية الحاكم والبيهقي: (أجرني) وفي رواية لابن السني: (أعذني). الثمر المستطاب (ص: ٦٢٩)

تێبینی: سوننەتە بۆ چوونە مزگەوت قاچی ڕاست پێش بخەیت و بۆ هاتنە دەرەوە قاچی چەپ پێش بخەیت./ أخرجه الحاكم وعنه البيهقي عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) أنه كان يقول: فذكره.../وحسنه الألباني في السلسلة الصحيحة٦٢٤/٥ برقم(٢٤٧٨).

# بینینی ئەو کردەوانەی کە لە مزگەوتدا دروست نین

ئەگەر بینیت کڕین و فرۆشتن دەکرا لە مزگەوتدا پێی بڵێ: (( لا أَربَحَ اللّهُ تِجارَتَكَ )).

واتە: خوای گەورە قازانج نەخاتە ناو ئەو بازرگانییەتەوە.

وە ئەگەر کەسێك لە مزگەوتدا جاڕی بۆ شتێکی وون بوو ئەدا پێی بڵێ: (( لا رَدَّها اللّهُ عَلَيكَ )).[١٥٧]

واتە: خوا بۆت نەگەڕێنێتەوە .چونکە مزگەوت بۆ ئەوە نەکراوە. وەدروست نییە تف و بەڵغەم و چڵم و شتی پیس ڕۆبکرێتە ناو مزگەوت چونکە تاوانەو کەفارەتەکەشی پاك کردنەوەیەتی[١٥٨]

---

(١٥٧) الترمذي (١٣٢١) وقال حديث حسن. والدارمي ٣٢٦/١ وصحَّحَهُ ابن حَبان (٤١٣) والحاكم ٥٦/٢ ووافقه الذهبي. وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب ٧١/١ برقم(٢٩١). وصحيح الجامع برقم(٥٧٣) .

تێبینی/ لە فەرموودەدا هاتووە: (دوای نوێژی بەیانی ئەعرابیەیەك هەستاو ووتی: کێ حوشترە سوورەکەمی دۆزیوەتەوەو بانگەوازی بۆ کردووەو بانگی کردم بۆی؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویی: ((لَا وَجَدْتَهُ، لَا وَجَدْتَهُ، لَا وَجَدْتَهُ، إِنَّمَا بُنِيَتْ هَذِهِ الْمَسَاجِدُ لِمَا بُنِيَتْ لَـهُ )). أخرجه مسلم وأحمد وابن ماجه وصححه الألباني أنظر صحيح وضعيف الجامع الصغير (٩٨/٢٨) برقم(١٣٥٢٦) و صحيح الجامع (٧٥٦٨).

شێخی ئەلبانی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: لەم فەرمودەیەدا بەڵگەیە لەسەر حەرامێتی بانگەوازو پرسیارکردن لە ئاژەڵێکی وون بوو لە مزگەوتدا بە مەرجێك بە دەنگی بەرز بێت، ئەمەش بۆچوونی ابن حزم٢٤٦/٤ والصنعاني في (سبل السلام)٢١٧/١، وە ان شاء الله ڕاستیشە چونکە ڕووکەشی نەهیەکە وایە، وە لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی کردووە ئەم ووتەیە بە کەسی جاڕدەر بوترێت وەك سزایەك بۆی./ الثمر المستطاب (٦٨٦/١).

(١٥٨) البخاري ٤٢٨/١ ومسلم (٥٢٢) .

وه نەهی کراوه لەوەی کە شیعری ناجائیزی تێدا بووترێت.[١٥٩]
وه هەروەها دروست نییە دەنگ بەرز کردنەوه تیایدا.[١٦٠]
وه هەر کەسێك پیاز یان سیر یان کەوەر (یان توور یان شتی بۆن ناخۆشی تری خوارد) با نزیکی مزگەوت نەکەوێتەوه. چونکە مەلائیەکەتەکان ئەزێت ئەچێژن بەو شتەی کە مرۆڤ ئەزێتی پێ دەگا.[١٦١]

## پێش دەست نوێژ

**بڵێ:** (( بِسِم الله )).[١٦٢]

**<u>تێبینی</u>: ئەو ویردو زیکرانەی خەڵکی عەوام دەیڵێن لە کاتی شۆردنی هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی دەست نوێژدا هیچ بنچینەیەکی نییەو لە فەرموودەدا نەهاتووه.[١٦٣] وه هیچ دوعاو نزایەکی تایبەتیش نییە بە کاتی دەست نوێژ شتنەوه.**

---

(١٥٩) أبوداود(١٠٧٩) والترمذي (٣٢٢) وقال حديث حسن. واخرجه النسائي ٢/٤٧-٤٨ وسنده حَسَن، وحسنه الألباني في صحيح وضعيف سنن الترمذي ٣٢٢/١ برقم(٣٢٢).

(١٦٠) البخاري ٤٦٥/٧.

(١٦١) البخاري ٤٩٨/٩ ومسلم (٥٦٤).

(١٦٢) أبوداود ٧٥/١ رقم (١٠١) وابن ماجه ١٤٠/١ رقم (٣٩٩) وغيرهم والحديث حسن بمجموع طرقه. انظر ارواء الغليل ١٢٢/١. وصحيح الترمذي ١٠١/١.

(١٦٣) انظر الوابل الصيب ص(٣١٦) والأذكار للنووي ١١٦/١.

# نزای دوای دەست نوێژ

١- (( أشـهَدُ أن لآ إلـهَ إلاّ اللّهُ وَحْـدَهُ لا شَـريكَ لـه. وَأشـهَدُ أنَّ محُمَّـداً عَبدُهُ وَرَسولُهُ.. )).(١٦٤)

**واته: شایەتی دەدەم (بەدڵ ئیقرار ئەكەم و بە زمان دانی پێدا دەنێم)كە هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە (الله) تاكی بێ هاوبەشە. وە شایەتی دەدەم كە محمد(ﷺ) بەندەو نێردراوو پەیامهێنەری خوایە.**

٢- (( أللهـمّ اجعَلنـي مِـنَ التّـوّابِينَ. واجعَلنـي مِـنَ المُتَطَهِّـرينَ )).(١٦٥)

**واتە: خوایە بمگێڕی لەوانەی بەردەوام تەوبەكارن‌و بمگێڕی لەوانەی بەردەوام خۆیان پاك ڕادەگرن.**

٣- (( سُـبحانَكَ اللَّهُـمَّ وَبِحَمْـدِكَ أشـهَدُ أن لا إلـهَ إلاّ أنـتَ أسـتَغْفِرُكَ وَأتوُبُ إليكَ )).(١٦٦)

---

(١٦٤)(هەركەسێك دەست نوێژی تەواو بشۆرێ و ئەمە بڵێ هەر هەشت دەرگاكەی بەهەشتی بۆ دەكرێتەوە لەكامیانەوە ئارەزوو بكات دەچێتە ناوی) مسلم١/٢٠٩ برقم(٢٣٤).

(١٦٥) الترمذي ١/٧٨ رقم(٥٥) وانظر صحيح الترمذي ١/١٨ وهو صحيح. صَحَّحَهُ الألباني في سنن الترمذي رقم(٤٨).

(١٦٦)( هەركەس دەست نویژ بگرێ و پاشان ئەمە بڵێ لەلاپەڕەیەكدا بۆی دەنوسرێتەوە، پاشان مۆر دەكرێت بە مۆرێك ناشكێت تا ڕۆژی قیامەت). رواه الحاكم١/٥٦٤ وهو صحيح وانظر النسائي في عمل اليوم والليلة ص ١٧٣ برقم(٨١) وانظر إرواء الغليل ١/١٣٥و ٣/٩٤ ورواه الحاكم ١/٥٦٤ انظر صحيح الترغيب والترهيب(٢٢٠).

**واته: پاکیو بێعەیب و ناتەواوی و سوپاس بۆ تۆیە خوایە، شایەتی دەدەم کەهیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لەتۆ، داوای لێخۆشبوونت لێدەکەمو دەگەڕێمەوە بۆ لات.**

## وەڵام دانەوەی بانگ بێژ

**١-بانگ بێژ هەرچییەکی ووت تۆش دەیڵێیتەوە جگە لە ووتنی:** (( حيَّ على الصَّلاة ــ حيَّ على الفَلاح )) **کە دەبێ بڵێی:** (( لا حَولَ وَلا قوةَ إلاّ بالله )).(١٦٧)

**٢- وە بڵێ:** (( وَأنـا أشـهَدُ أن لا إلـه إلا اللهُ وَحـدَهُ لا شَـريكَ لـهُ. وَأنَّ مُحَمَّداً عَبدُهُ وَرَسولُهُ. رَضيتُ باللهِ ربّاً. وَبِمُحمّدٍ رَسولاً. وَبِالإسلامِ ديناً )).(١٦٨)

**ئەمە دوای شایەتمانی بانگ بێژ دەوترێت.(١٦٩)**

---

**(١٦٧) (هەر کەس ئاوا بە خالص و بێ ڕیایی لە دڵییەوە بیڵێ دەچێتە بەهەشتەوە). البخاري ١/١٥٢ برقم(٦١١) ومسلم ١/٢٨٨ برقم(٣٨٣).**

**(١٦٨) (هەرکەسێ کە گوێی لە بانگ بێژبوو بیڵێ خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش دەبێ). مسلم ١/٢٩٠ برقم(٣٨٦).**

**(١٦٩) ابن خزيمة ١/٢٢٠ برقم(٤٢٢). ورواه أبو عوانة في مستخرجه، انظر تصحيح الدعاء للشيخ بكر أبو زيد.ص٣٧١.**

**تێبینی/ شێخی ئەلبانی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (دروست نییە هیچ ووشەیەك زیاد بکرێت لە بانگەکەدا تەنها لە دوو کاتدا نەبێت:**

# دوای بانگ

**١- دوای وەڵام دانەوەی بانگ بێژ صەڵاوات بدە لەسەر پێغەمبەر (ﷺ).[١٧٠]**

**٢- پاشان بڵێ** « اللَّهُمَّ رَبَّ هذهِ الدَّعوَةِ التّامّة. وَالصّلاةِ القائِمَة. آتِ مُحَمَّداً الوَسِيلَةَ وَالفَضِيلَةَ. وَابْعَثهُ مَقاماً مَحْمُوداً الَّذي وَعَدْتَهُ ».[١٧١]

**واتە: خوایە پەروەردگاری ئەم بانگەوازی یەکخواپەرستییە تەواوو نوێژە دامەزراوو بەردەوامە. ببەخشە بە پێغەمبەرمان محمد(ﷺ) پلەی بەرزی** (الوسيلة) **(کە شوێنێکە لەبەهەشت دایە بۆ کەس نابێ جگە لەبەندەیەك لەبەندەکانی خوای گەورە، وە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئومێدم وایە کە ئەو کەسە من بم) وە**

---

**یەکەم: تەنهاو بە تایبەت لە بانگی یەکەمی بەیانیاندا دوای وتنی(حي على الفلاح) دەڵێت: (الصلاة خير من النوم الصلاة خير من النوم)دوو جار.........**

**وە جێگای دووەمیش: ئەگەر زۆر سەرما بوو یان باران بوو دوای (حي على الفلاح) یان دوای تەواو بوون لە بانگەکە ئەمەی بۆ زیاد دەکات: (صلوا في الرحال) یان دەڵێت: (ومن قعد فلا حرج عليه)../ الثمر المستطاب (١/١٢٩-١٣٣)**

**(١٧٠) مسلم ١/ ٢٨٨ برقم(٣٨٤).**

**(١٧١) هەر کەسێك ئەم پاڕانەوەیە بڵێ کاتێ بانگ دەبیستێ بەر شەفاعەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەکەوێت البخاري/ ١/١٥٢ برقم(٦١٤).وە زیادەی: (( إنّكَ لا تُخْلِفُ المِيعادَ)) للبيهقي ١/٤١٠ ، وە(العلامة ابن باز) لە(تحفة الاخيار) ص ٣٨ ئیسنادەکەی بەحەسەن داناوە. بەڵام ئەم زیادەیە شازە هەروەك هاتووە لە الإرواء ١/٢٦٠ وە (الفتح)دا.**

(الفضيلة) كه پلەیەكی زیادەیە بەسەر دروست كراواندا. وە بیبەرە ئەو شوێنە سوپاس كراوەی كە بەڵێنت پێ داوە ( كە پلەی شەفاعەتی گەورەیە لە ڕۆژی دواییدا).

٣- بپاڕێرەوە بۆ خۆت لەنێوان بانگ و قامەت دا. چونكە پاڕانەوەی ئەو كاتە ڕەت ناكرێتەوە.(١٧٢)

# فەزڵی بانگ وتن

١- بانگ بێژ لە ڕۆژی دواییدا لە هەموو كەسێك گەردن و ملی بەرزو درێژترە.(١٧٣)

٢- وە هەموو شتێك لە مرۆڤ و جنۆكەو شتی تر شایەتی بۆ دەدەن لە ڕۆژی دواییدا.(١٧٤)

٣- وە هەر موسڵمانێك (١٢) ساڵ بانگ بدات( بە بێ بەرانبەر) ئەوا بەهەشتی بۆ واجب دەبێ‌و بە هەموو بانگێك لە ڕۆژێكدا(٦٠) چاكەو بە هەموو قامەتێك(٣٠) چاكەی دەست گیر دەبێ.(١٧٥)

---

(١٧٢) الترمذي برقم(٢١٢) وأبوداود برقم(٥٢١) وأحمد١١٩/٣ وأنظر إرواء الغليل٢٦٢/١. وصححه الألباني في صحيح أبي داود١٤/٣ برقم(٥٣٤).

(١٧٣) مسلم ٣٨٧ عن معاوية (رضي الله عنه).

(١٧٤) البخاري ٧٢/٢، ٧٣.

(١٧٥) حديث حسن. أخرجه ابن ماجه رقم(٧٢٨) والدارقطني والحاكم والبيهقي عن ابن عمر (رضي الله عنه)، انظر (تخريج الاذكار) لابن حجر العسقلاني جزء/١. وصحّحَهُ الألباني في السلسلة الصحيحة ٦٦/١.

# وتەی پێش نوێژ( إمام ) بۆ نوێژکەران

**پێش دەست پێکردنی نوێژو لە کاتی چاك کردنی ڕیزەکانیان دا دەڵێت:** (( سَوّوُا صفُوفَكُم فإنَّ تَسوِيةَ الصَّفِّ مِنْ تَمامِ الصَّلاةِ)).[176]

**واتە: ڕیزەکانتان ڕێك بخەن چونكە بە ڕاستی ڕێك و پێكی ڕیز لە تەواوی نوێژەوەیە.**

---

**تێبینی/**

**١- وتنی (أقامها الله وأدامها) لە لایەن ئیمامەوە کاتێ بانگبێژ لە قامەتدا دەگاتە (قد قامت الصلاة، قد قامت الصلاة) دروست نیيەو فەرمودەکەی لاوازە./ بڕوانە المشكاة برقم(٦٧٠)، والإرواء برقم(٢٤١) وتمام المنة ص,٣٥**

**٢- نوێژ خوێنان ئەو کاتە هەڵدەستن بۆ نوێژ کە بانگبێژ لە قامەتدا دەگاتە (قد قامت الصلاة، قد قامت الصلاة)، کە ئەمەش ووتەی عبدالله ی کوڕی موبارەك و ئیمامی ئەحمەدە./ بڕوانە (الثمر المستطاب) ص٢٣١.**

**(١٧٦) البخاري ١٧٤/٢ ومسلم (٤٣٣) عن أنس. وە لەریوایەتی البخاریدا: (( فَإنَّ تَسويَةِ الصّفُوفِ مِنْ إقامَةِ الصَّلاةِ )) . واتە: ریكو پێكی ریزەکان لە تەواوی و دامەزراوی نوێژەکەوەیە.**

**تێبینی: ڕیز ڕێکخستن بەم جۆرەیە: شان دەدەن لە شانی یەك و پێو تەنیشتی ئەژنۆ دەدەن لە یەك، چونكە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئاوایان دەکرد. أنظر(سلسلة الصحيحة ٤٠١/١) والحديث رواه أبو داود(٦٦٢) وإبن حبان وأحمد وسندهُ صحيح كما قال الألباني). وە پێویستە ڕیزی یەکەم تەواو بێت ئەوجا ڕیزی دووەم دروست بکرێت. وە هەروەها بۆ ڕیزەکانی تریش بەهەمان شێوە چونكە مەلائیکەتەکانیش بەم شێوازە دەوەستن لەلای پەروەردگار.**

## - له نوێژ و دوای نوێژدا -

## سوننەتی دەست پێکردنی نوێژ( الإستفتاح )

**١-** (( اللَّهُمَّ باعِدْ بَيني وَبَينَ خَطايايَ كَما باعَدْتُ بَينَ المَشْرِقِ وَالمَغْرِب. اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنْ خَطايايَ كَما يُنَقّى الثَّوبُ الأبيَضُ مِنَ الدَّنَسِ. اللَّهُمَّ اغسِلْنِي مِنْ خَطاياي بِالثَلْج وَالماءِ وَالبَرَدِ )).(١٧٧)

**واتە: خوایە نێوان منو گوناهەکانم دوور بخەرەوە وەك چۆن رۆژهەڵاتو رۆژئاوات لەیەك دوورخستۆتەوە. خوایە لەگوناهەکانم پاکم بکەرەوە هەروەکو چۆن کراسی سپی لەچڵك پاك دەبێتەوە. خوایە لە گوناهەکانم بمشۆرەوە بە بەفرو بارانو تەرزە.(١٧٨)**

**٢-** (( سُبحانَكَ اللَّهُمَّ وبِحَمْدِكَ. وتَبارَكَ اسمُكَ. وَتَعالى جَدُّكَ. وَلا إلَه غَيرُكَ )).(١٧٩)

**واتە: خوایە پاکیو بێگەردیو ستایش بۆتۆیە، وە ناوی تۆ گەورەو پیرۆزەو فەڕو بەرەکەتی زۆرو فراوانەو گەورەییت بەرزو بڵندەو هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە تۆ.**

---

(١٧٧) البخاري ١/١٨١ و مسلم ١/٤١٩.

(١٧٨) الكرماني فەرمويەتی: ئەگونجێت لەو سێ پاڕانەوەیەدا ئاماژە بێت بۆ هەر سێ کاتەکە: (المباعدة) دوورکەوتنەوە بۆ داهاتوو، وە (التنقية) پاککردنەوە بۆ ئێستا، وە (الغسل) شۆردن بۆ ڕابووردوو./ بڕوانە فتح الباري بشرح صحيح البخاري٢/٢٦٩.

(١٧٩) أخرجه أصحاب السنن الاربعة وانظر صحيح الترمذي ١/٧٧. وصحيح إبن ماجه١/١٣٥.

تێبینی: ابن القيم(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەم دوعایەی تەرجیح داوە بەسەر دوعاکانی تری استفتاحی نوێژدابەستن ئەویش لە(دە) ڕووەوە./ بڕوانە زاد المعاد١/١٩٨-١٩٩.

٣-(( وَجَّهْتُ وَجهيَ لِلّذي فَطَرَ السَّمَواتِ وَالأرضَ حَنيفاً مُسلماً وَما أنـا مِـنَ المُشـركينَ.إنّ صَـلاتي وَنُسُـكي وَمَحيـايَ وَمَمـاتي لله رَبِّ العالمينَ، لا شريكَ لَهُ وَبِذلكَ أُمِرتُ وَأنا مِنَ المُسلمينَ، اللَّهُمَّ أنتَ المَلِكُ لا إلهَ إلاّ أنتَ، أنْتَ رَبّي وَأنا عَبْدُكَ. ظَلَمْتُ نَفْسِي، وَاعترفْتُ بِذَنبي، فاغفِرْ لي ذنوبي جَميعاً، إنَّهُ لا يَغفِرُ الذُّنوبَ إلاّ أنتَ. وَاهدِني لأَحسَنِ الأخْلاقِ لا يَهدي لأَحْسَنِها إلاّ أنتَ وَاصرفْ عَنّى سَيِّئَها لايَصْرِفُ عَنّي سَيِّئَها إلاّ أنتَ، لَبَّيكَ وسَعْدَيكَ، وَالخيرُ كُلُّهُ بِيَدَيكَ، والشَّرُّ لَيسَ إلَيكَ، أنا بِكَ وَإلَيكَ، تبارَكْتَ وَتَعالَيْتَ، أستغفِرُكَ وأتوبُ إليكَ )).(١٨٠)

واتـه: بـه نيـهت و مهبهسـتى پاكـهوه ڕووم كـرده ئـهو خوايـهى ئاسمانهكانو زهوى بهديهێناوهو من لامداوه بهلاى دينى حهقداو موسـڵمانم و لههاوبـهش دانـهران نـيم. بهڕاسـتى پهرسـتش و داواكـردن و نوێـژو سـهربڕينو كـارى ژيـان و كـاتى مـردنم كـه لهسهرى دهمرم تهنها بۆ پهروهردگارى جيهانيانهو بهوه فـهرمانم پـىٚ كـراوهو مـن لهموسـڵمانانم. خوايـه تـۆ پادشـايت هـيچ پهرستراوێك نييـه بهحـهق جگـه لـه تـۆ، تـۆ پـهروهردگارمىو مـن بهندهى تۆم، ستهمم لهنهفسم كردوه(به ئهنجامدانى تاوان)و دان ئـهنێم بـه گوناهمـدا سـاخوايه لهھـهموو گوناهـهكانم خـۆش بـه، بهڕاستى جگه له تۆ كهس له گوناه خۆش نابىٚ. وهڕێنمويم بكهو تـهوفيقم بـده بـۆ چـاكترين ڕهوشـت، كـهس ڕێنمـويى ناكـات بـۆ

(١٨٠) أخرجه مسلم١/٥٣٤ برقم(٧٧١).

**چاكترینی ڕەوشت و ئاكار جگە لەتۆ. وە كردەوەی ناشیاوو قێزەون و خراپم لیدوور بخەرەوە كەس كردار خراپیم لێ دوور ناخاتەوە جگە لەتۆ. خوایە**(لَبَّيكَ) **(ووشەیەكە بۆ وەلأمدانەوەی بانگكارێك بەكار دەهێنرێت) واتە: خوایە بەردەوام و دامەزراوم لەسەر گوێڕایەڵیت لە جێبەجێكردنی فەرمانەكانتداو**(سَعدَيكَ)**(ووشەیەكە لەگەڵ لبیك بەكاردەهێنرێت و لە ماناوە نزیكە لێی) واتە: گوێڕایەڵی دوای گوێڕایەڵی و وەلأمدەرەوەی جێبەجێكاری فەرمانەكانتم، چاكە هەمووی بەدەستی تۆیەو خراپەش نادەمە پاڵ تۆ(چونكە بێ حیكمەت نییە)، وە من بەتۆ خۆم پەنا دەدەم و دەژیم و دەمرمو بە تۆوە وەستاوم و بۆلای تۆ دەگەڕێمەوە. شایستەی ستایشی گەورەو بەردەوامی و گەورەو بڵندی لە هەموو عەیبێك. داوای لێخۆشبوونت لێ دەكەمو دەگەڕێمەوە بۆلات.**

٤- (( اللهُمَ رَبَّ جبرائيلَ. وَميكائيلَ، وَإسرافيلَ. فاطِرَ السَّمواتِ وَالأرضِ. عالِمَ الغَيبِ والشَّهادَةِ. أنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبادِكَ فِيما كانُوا فيه يَختلِفونَ. إهدِني لِما اختُلِفَ فيهِ مِنَ الحَقِّ بإذنِكَ إنّكَ تَهدي مَنْ تَشاءُ إلى صِراطٍ مُستَقيم )).(١٨١)

**واتە: خوایە، پەروەردگاری جبرائیلو میكائیلو ئیسرافیل. بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوی، ئەی زانای غەیبو ئاشكرا،**

---

**(١٨١) أخرجه مسلم ٥٣٤/١ برقم(٧٧٠). پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی شەونوێژی بەمە دەست پێ دەكرد...**

**تۆ حوكم دەكەیت لەنێوان بەندەكانت دا لەو شتەدا كەجیاوازن تیایدا. سارێنمویم بكەو تەوفیقم بدە بۆ ئەو حەقەی كەخەڵكی تیایدا جیاوازن بەئیزن و فەزڵ و ئاسانكاری خۆت واتە (دامەزراوم بكە لەسەری). بەڕاستی تۆ ڕێنمویی هەركەسێك بتەوێ دەیكەیت بۆ سەر ڕێگای ڕاست.**

**٥-** (( ألحَمْدُلله حَمْداً كَثيراً طَيِّباً مُبارَكاً فيه )).(١٨٢)

**واتە: سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە سوپاسێكی زۆری پاكی پیرۆزبێ.**

**٦-**(( اللهُ أكبرُ كَبيراً.وَالحَمدُللهِ كَثيراً. وَسُبحانَ اللهِ بُكْرَةً وَأصِيلاً)).(١٨٣)

**واتە: بەگەورەیی دەڵێم خوا گەورەترە لە هەموو شتێك. زۆر سوپاس و ستایشێكی زۆر بۆ خوا، وە پاكی و بێگەردی بۆ خوا لەبەیانیان و ئێواران دا.**

---

(١٨٢) پیاوێك بەم دوعایە دەستی پێكرد. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بینیم دوازدە مەلائیكەت هەڵپەیان بۆكرد تا كامیان بەرزی بكەنەوە/رواه مسلم ٤١٩/١. برقم(٦٠٠)، واللفظ له ، والنسائي (٩٠٠)، وأبو داود (٧٦٣).وأحمد بلفظ: (( الله أكبر، الحمد لله حمدا كثيرا طيبا مباركا فيه )). وصححه الألباني صحيح سنن أبي داود٢/١ برقم(٧٦٣) و أنظر أصل صفة صلاة النبي ص٢٦١.

(١٨٣) له ابن عمرەوە (رضی الله عنهما) فەرموویەتی: ( لەكاتێكدا ئێمە نوێژمان دەكرد لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) لەكۆمەڵەكەدا پیاوێك ئەمەی فەرموو...پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی كێبوو ئاواو ئاوای ووت؟ پیاوێك لەكۆمەڵەكەفەرموی: من بووم ئەی پێغەمبەری خوا. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: سەرم سووڕما لێی دەرگاكانی ئاسمانی بۆ كرانەوە). مسلم ٤٢٠/١ برقم(٦٠١).

٧- پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر هەڵبسایەو شەونوێژی بکردایە دەیفـەرموو: ((اللَّهُـمَّ لَـكَ الحَمْـدُ أنْـتَ نُـور السَّـمواتِ والأرضِ ومَـنْ فيهنَّ. ولَكَ الحَمْدُ أنْتَ قَـيِّمُ السَّمواتِ والأرضِ وَمَنْ فِيهنَّ. {وَلَكَ الحَمْدُ أنْتَ رَبُّ السّمواتِ وَالأرضِ وَمَنْ فيهنَّ} {وَلَكَ الحَمْدُ لَكَ مُلْـك السّـمواتِ وَالأرضِ وَمَـنْ فـيهنَّ} { وَلَـكَ الحَمْـدُ أنْـتَ مَلِـكُ السّـمواتِ وَالأرضِ} {وَلَـكَ الحَمْـدُ} {أنـتَ الحَـقُّ. وَوعْـدُكَ الحَـقُّ. وَقَولُكَ الحَقُّ. ولِقاؤُكَ الحقّ. وَالجَنّةُ حَقٌّ. وَالنّارُ حَقٌّ. وَالنَّبيّونَ حَقٌّ. وَمُحَمّدٌ (ﷺ) حَقٌّ. وَالسّـاعَةُ حَـقٌّ} {اللَّهُـمَّ لَـكَ أسْـلَمْتُ. وَعَليـكَ تَوَكّلْتُ. وَبِكَ آمَنْتُ. وَإليكَ أَنبْتُ. وَبِكَ خاصَمْتُ. وَإليكَ حاكَمْتُ. فـاغفِرلي ماقَـدَّمْتُ. وَمـا أخَّـرْتُ. وَمـا أسـرَرتُ. وَمـا أعلَنْـتُ} {أنْـتَ المُقَـدِّمُ. وَأنْــتَ المُــؤَخِّرُ لا إلــهَ إلاّ أنــتَ} {أنــتَ إلهــي لا إلــه إلاّ أنْتَ})).(١٨٤)

واتە: خوایە ستایش بۆ تۆیە. تۆ ڕووناك كەرەوەی ئاسمانەكان و زەوی‌و هەموو ئەو شتانەی كەتیایدان بە دەستەڵاتی خۆت، وە ستایش بـۆ تۆیـە تـۆ هەڵسـوڕێنەرو پـارێزەری ئاسمانـەكان و زەوی‌و هـەموو ئـەو شـتانەی كەتیایـدان، سـتایش بـۆ تۆیـە تـۆ خـاوەن و پـەروەردگاری ئاسمانـەكان و زەوی‌و ئـەو شـتانەی

(١٨٤) البخاري مع الفتح ٣/٣و ١١٦/١١و ٣٧١/١٣، ٤٢٣، ٤٦٥ برقم(١١٢٠) ومسلم مختصراً بنحوه ٥٣٢/١ برقم(٧٦٩). پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی شەونوێژی بەمە دەست پێ دەكرد...

کەتیایدان. ستایش بۆ تۆیە موڵکی ئاسمانەکان و زەوی‌و چی تێدایە هی تۆیە. ستایش بۆ تۆیە تۆ پادشای ئاسمانەکان و زەویت. ستایش بۆ تۆیە. تۆ بە بوون و هەبوونت ڕەواو ڕاستی‌و بەڵێنەکەت ڕاستەو ووتەکەت ڕاستەو بینین و گەیشتن پێت لە قیامەتدا ڕاستەو بەهەشت ڕاستەو ئاگری دۆزەخ ڕاستەو پێغەمبەران(علیهم الصّلاةُ والسّلام) ڕاستن و محمد (ﷺ) ڕاستەو ڕۆژی دوایی ڕاستە. خوایە گوێڕایەڵ و تەسلیمی تۆبووم و پشتم بەتۆبەست‌و کاروبارم تەسلیمی تۆ کردو ئیمانم بەتۆ هێناوەو گەڕامەوە بۆلای تۆو بە پشتیوانی تۆوە بەپەرچی دوژمنانم دەدەمەوە وە حوکمی کێشەی خۆم و ئەو کەسەی مل نادات بۆ هەق تەنها دێنمەوە بۆلای تۆ. سا لەو گوناهانەم خۆش بە کەپێشم خستوەو لەوانەش کەدوام خستووەو ئەوەی بەپەنهانی ئەنجامم داوەو ئەوەی ئاشکرام کردووە. تۆ پێشخەری و تۆ دواخەری‌و هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لەتۆ. تۆ پەرستراوی منی هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لەتۆ.

٨- (سُبحانَ اللّهِ) دە جار، (لا الـهَ الاّ اللّه) دە جار، (الحَمدُللّهِ) دە جار، (أللّهُ أكبَر) دە جار، (أستَغفِرُ اللّهِ) دە جار.(١٨٥)

---

(١٨٥) پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: (...ئەی ام رافع کە هەستایت بۆ نوێژ ئەمە بڵێ.....ئەگەر تۆ دە جار ووتت: سبحان الله خوای گەورە دەفەرموێت ئەمە بۆ منە، وە ئەگەر ووتت: (لا اله الا الله) دەفەرموێت: ئەمە بۆ منە، ئەگەر ووتت: (الحمدلله) دەفەرموێت: ئەمە بۆ منە، ئەگەر ووتت: (الله اکبر) دەفەرموێت: ئەمە بۆ منە، وە کاتێ

**٩-** (اللهُ أكبَر) **ده جار،** (الحَمدُلله) **ده جار،** (سُبحانَ اللهِ) **ده جار،** (لا الهَ الاّ الله) **ده جار،** (أستَغفِرُ الله) **ده جار، وه دهڵێت:** ((اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَاهْدِنِي، وَارْزُقْنِي، {وَعَافِنِي} )) **ده جار، وه دهڵێت:** ((اللَّهُمَّ إنِّي أعوذُ بِكَ مِن الضّيقِ يَومَ الحِساب)) **ده جار.**(١٨٦)

**١٠-** ((سُبحانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ وَتَبارَكَ اسمُكَ وَتَعالى جَدُّكَ وَلا إلهَ غَيرُكَ)) **ئينجا دهڵێت:** ((لا إلهَ إلاّ الله)) **سێ جار، پاشان دهڵێت:** ((اللهُ أكبَرُ كَبيراً)) **سێ جار، وه دهڵێت:** ((أعوذُ بِاللهِ السَّميعِ العَليمِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيمِ مِن هَمزِهِ وَنَفخِهِ وَنَفثِهِ)).(١٨٧)

---

**ووتت: (استغفر الله) دهفهرموێت: ئهوه لێت خۆش بووم). وحسنه الألباني أنظر السلسلة الصحيحة٩/١١٨ برقم(٣٣٣٨) وقال في الضعيفة١٤/٢٨٧: إسناده حسن.**

**(١٨٦) رواه أحمد والطبراني وقال الألباني في أصل صفة صلاة النبي١/٢٦٧: وهذا إسناد صحيح. و قال في زيادة (وعافني): رواه أبو داود(١/١٢٢) ، والنسائي(١/٢٤٠)، وابن ماجه وسنده حسن. له ڕیوایهتێكی تردا: دوای (ده) جارهكان، یهكجار دهڵێت: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَاهْدِنِي، وَارْزُقْنِي، وَعَافِنِي، أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ ضِيقِ الْمَقَامِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)رواه النسائي وابن ماجه(١٣٥٦) وقال الألباني في صحيح وضعيف سنن النسائي (٤/٢٦١) برقم(١٦١٧): حسن صحيح.**

**<u>تێبینی/</u> پێغهمبهری خوا(ﷺ) نوێژی شهونوێژی بهمه دهست پێ دهكرد...**

**(١٨٧) رواه أبوداود أنظر صحيح وضعيف سنن أبي داود١/٢ برقم(٧٧٥) وصححه الألباني، وأنظر أصل صفة صلاة النبي(ﷺ) ص٢٥٢. پێغهمبهری خوا(ﷺ) نوێژی شهونوێژی بهمه دهست پێ دهكرد...**

**١١- ((سُبحانَ رَبِّ العالَمين)) ماوەیەکی زۆر ئەوەستا، پاشان دەیفەرموو: ((سُبحانَ اللهِ وَبِحَمدِهِ)) ماوەیەکی زۆر دەوەستا.[(١٨٨)]**

# نزای چەمینەوەکان( الرُّكوع )

**١- (( سُبحانَ رَبِّيَ العَظيم )) سێ جار.[(١٨٩)]**

**واتە: پاکی و بێ کەم و کورتی و گەورەیی بۆ پەروەردگاری مەزنمە.**

**٢- (( سُبحانكَ اللَّهُمَّ رَبَّنا وَبِحَمدِكَ اللَّهُمَّ اغفِر لي )).[(١٩٠)]**

**واتە: پاکی و بێ کەم و کورتی و گەورەیی بۆ تۆیە پەروەردگارم سوپاس و ستایش لایەقی تۆیە. ساخوایە لێم خۆش بە.**

**٣- (( سُبّوحٌ قُدُّوسٌ رَبُّ المَلائِكَةِ وَالرُّوحِ )).[(١٩١)]**

---

**(١٨٨) رواه النسائي وللترمذي نحوه وقال: هذا حديث حسن صحيح، وصححه الألباني في مشكاة المصابيح١/٢٧٠ برقم(١٢١٨).**

**تێبینی: وا باشە هەر جارەو یەکێك لەم دوعایانە بخوێنرێت چونکە پرسیار کرا لە شێخ محمد العثیمین(ڕەحمەتی خوای لێ بێت): ئایا ئەکرێت چەند دانەیەك لەم زیکرانەی (استفتاح) بەیەکەوە لە یەك نوێژدا بخوێنرێت؟ فەرموی: نەخێر بەیەکەوە کۆناکرێنەوە..../ الشرح الممتع على زاد المستقنع: ٦٧/٣.**

**(١٨٩) أخرجه أهل السنن وأحمد. وانظر صحيح الترمذي ٨٣/١. وە زیادەی: (وبِحَمدِهِ) صەحیحە بڕوانە (صفة صلاة النبي(ﷺ) ص/١٣٣) الطبعة الثانية من الجديدة١٤١٧هـ- ١٩٩٦ م .**

**(١٩٠) البخاري ٩٩/١ برقم(٧٩٤) ومسلم ٣٥٠/١ برقم(٤٨٤).**

**(١٩١) مسلم ٣٥٣/١ برقم(٤٨٧) وأبوداود ٢٣٠/١ برقم(٨٧٢).**

**واتە: خوایە و پاك و گەورەیی لە هەموو پاكڕاگیراوی لە هەموو ناتەواوی و عەیبێك ناشیرینییەك بۆ تۆیە پەروەردگاری مەلائیكەتان و ڕۆح( كە بریتییە لە جبریل یان جۆرێك لە مەلائیكەتەكان یان بریتییە لە ڕۆح).**

**٤-** « اللَّهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ. وَبِكَ آمَنتُ. وَلَكَ أسلَمتُ. خَشَعَ لَكَ سَمعي وَبَصَري. وَمُخِّي. وَعَظْمي. وَعَصَبي. {وَما استَقَلَّتْ بِهِ قَدَمي}». (١٩٢)

**واتە: خوایە بۆ تۆ چەمیمەوەو ئیمانم بەتۆ هێناو تەسلیمی تۆ بووم و بیستن و بینینم و مۆخ و ئێسقان و دەمارو هەموو ئەم لاشەیەم كە قاچەكانم هەڵیان گرتووەو گوێڕایەڵ و مل كەچی تۆ بوو.**

**٥-** « سُبحانَ ذي الجَبَروتِ. وَالمَلَكوتِ. والكِبرياَءِ. والعَظَمَةِ ». (١٩٣)

---

(١٩٢) مسلم ١/٥٣٤ والأربعة إلاّ ابن ماجه. ومابين المعكوفين عند ابن بلفظها، انظر صحيح ابن حبان برقم(١٩٠١). وصحيح ابن خزيمة برقم(٦٠٧).

(١٩٣) أبوداود ١/٢٣٠ برقم(٨٧٣) والنسائي٢/١٩١ وأحمد٦/٢٤ وإسناده حَسَن.

تێبینی/ دەربارەی ئەوەی كە ئایا دروستە لە یەك ڕكوعدا چەند دوعایەك لەمانە بخوێنرێت: زانایان جیاوازن. شێخی ئەلبانی دەفەرموێت: (ئەگونجێت پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەیەكەوە وتبنی یان هەندێكیانی بە یەكەوە وتنبێت، یان یەك دانەیانی خوێندبێت و دەقێكمان نی‌یە تەرجیحی یەكێك لەم گریمانانە بكات..... ابن القیم لە (زاد)دا هەردوكی هێناوە، وە النووی لە (الأذكار)دا پێی وایە لێرەو لە هەموو بابەتەكانی تریشدا دروستە ئەگەر گونجا، وە صدیق حسن خان پێی وایە هەرجارەو دانەیەكیان بخوێنرێت چونكە هیچ بەڵگەیەك لەسەر كۆكردنەوەی نی‌یەو پێغەمبەری خواش(ﷺ) بەیەكەوە نەیفەرموە، شێخی ئەلبانیش لەگەڵ ئەم ڕایەدایەو دەفەرموێت مەگەر بیەوێت ركوعەكەی درێژ بكاتەوەو نزیكی بكاتەوە لە وەستانی چونكە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمەی كردووە ئەو كاتیش ناتوانێت ئەمە بكات مەگەر بەو

**واتـه: پـاكی و بێ عـەيبی بـۆ تۆيـە ئـەی خـاوەنی قـەهرو تەصـەروفی بێسنوورو موڵك و گەورەيی و مەزنی.**

# نزای هەستانەوە لە چەمینەوەكان

**١-** (( سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ )).[194]

**واتـه: خوای گەورە ستايشی ئەو كەسە وەردەگرێت و قبولٚ دەكاو پێـی خۆشـە كـە ستايشـی دەكـات و سـوپاس و پێزانينـی بـۆ دەردەبڕێت.**

**٢-** (( رَبَّنا لَكَ الحَمْدُ [195] حَمْداً كَثيراً، طَيِّباً مُبارَكاً فيهِ )).[196]

---

**شێوەی كە نەوەوی فەرمويەتی، يان بـە دووبـارە كردنـەوەی زيكرەكـە كـە ئەمـەيان نزيكترە لە سوننەتەوە. والله اعلم). أصل صفة صلاة النبي (٢/٦٤٩-٦٥٠)**

**(١٩٤) البخاري مع الفتح ٢/٢٨٢.**

**(١٩٥) وە هەندێ جار دەڵـێ: (ربّنـا لَـكَ الحَمْـدُ) رواه البخـاري بـرقم(٧٩٦) ( كـە هـەر كەسێك لە دوای ئيمامەوە بيڵێو ووتنی ئەم لەگەڵ وتنـی مەلائيكەتەكانـدا يـەكگير ببێ، ئەوا خوای گەورە لە گوناهەكانی پێشووی خۆش دەبێ)، يان دەڵێت: (ربّنا ولَكَ الحَمْدُ) وە هەندێ جار بۆ ئەم دووانە ووشەی (اللّهُـمَّ) لـە پێشـیيەوە زيـاد دەكـات/ مسلم١/٣٤٦.**

**(١٩٦) كابرايەك ئەمەی فەرموو: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( كێ ئەمەی ووت؟ فەرمووی: من. فەرمووی: بينيم سیو ئەوەندە مەلائيكەت هەڵپەيان بۆ كرد تا كاميان بينوسن). البخـاري مـع الفـتح ٢/٢٨٤. وە يـان بڵـێ: (..... مُبارَكـاً عَلَيـهِ كَمـا يُحِـبُّ رَبُّنـا وَ يَرضَى) البخاري ١/٣١٧ ومالك وأبوداود. وە هەندێ جار لەشەو نوێژدا دەڵێ (لِرَبّيَ الحَمْـدُ. لِرَبّـيَ الحَمْـدُ) ئەمـە دووبـارە دەكاتـەوە/ رواه النسـائي بسـندٍ صـحيح (الارواء٣٣٥).**

**واتــه: پــەروەردگارمان هــەموو ستایشــی پــڕ لەخۆشەویسـتی و بەگەورەدانان بۆ تۆیە. ستایشێکی زۆری پاك و خالصی زیادبوو.**

**٣-** (( مِلءَ السّمواتِ وَالأرضِ، وَما بَينَهُما، وَمِلءَ ما شِئتَ مِنْ شَيءٍ بَعْدُ. أهلَ الثَّناءِ والمَجدِ. أحَقُّ ما قالَ العَبْدُ. وَكُلُّنا لَكَ عَبْدٌ، اللَّهُمَّ لا مـانعَ لِمـا أعطيـتَ، وَلا مُعطـيَ لِمـا مَنَعْـتَ، وَلا يَنفَـعُ ذا الجـدِّ مِنـكَ الجَدُّ)). (١٩٧)

**واته: پڕ بەئاسمانـەکانو پڕ بەزەویو پڕ بـەنێوانیانو پڕ بـەو شـتەی کەجگـە لـەمان بتـەوێ. ئـەی خـاوەنی وەسـف و مـەدحی جوان و گەورەیی و ڕێز، (ئەم ستایشە) ڕەواترین وتەیەکە بەندە دەیڵێت لەو وتانەدا کە بەندە دەیڵـێ(١٩٨) و هـەمووشمان بەنـدەی تـۆین. خوایـە ڕێگـر نییـە بـۆ ئـەو شـتەی کـە تـۆ دەیبەخشـیو بەخشەر نییە بۆ ئەو شتەی تۆ دەیگریتەوەو هیچ خاوەن سامان و دەوڵەمەنـدی و پلـەو پایەیـەك مـاڵ و منـداڵ و پلـەو پایەکـەی سوودی پێناگەیەنی و ڕزگاری ناکا لە تۆ( واتە: بەڵکو کردەوەی چاکی سوودی پێدەگەیەنێو ڕزگاری دەکات ).(١٩٩)**

---

(١٩٧) مسلم ٣٤٦/١ برقم(٤٧٧).

(١٩٨) وەك ابن تیمیە مانای کردووە: الفتاوی (٣١٢/١٤)

(١٩٩) انظر شرح مسلم ٩٠/٥.

# نزای کوڕنوشەکان( السّجود )

**١–** (( سُبحانَ ربّيَ الأعلى )) **سێ جار.**(٢٠٠)

**واتە: پاکی و بێ کەم و کورتی و گەورەیی بۆ پەروەردگاری زۆر بەرزم.**

**٢–** (( سُبحانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنا وَبِحَمدِكَ اللَّهُمَّ اغفِر لي )).(٢٠١)

**واتە: خوایە پاکی و بێ کەم و کورتی و گەورەیی بۆ تۆیە پەروەردگارمان ستایش لایەقی تۆیە. سا خوایە لێم خۆش بە.**

**٣–** (( سُبّوحٌ قُدّوسٌ رَبُّ الملآئِكَةِ وَالرُّوحِ )).(٢٠٢)

**واتە: ئەی خوایە پاکی و بێ کەم و کورتی و گەورەیی و پیرۆزی لایەقی تۆیە پەروەردگاری مەلائیکەتەکان و ڕۆح.**

**٤–** (( اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ. وَبِكَ آمَنْتُ. وَلَكَ أسلَمتُ، سَجَدَ وَجهي للّـذي خَلَقَـهُ. وَصَـوّرهُ. وَشَـقَّ سَـمْعَهُ وبَصَـرَهُ. تَبـارَكَ اللهُ أحسَـنُ الخالِقينَ)).(٢٠٣)

**واتە: خوایە تەنها کوڕنووشم بۆ تۆ بردو باوەڕم تەنها بە تۆ هێناوەو تەسلیمی تۆ بووم، ڕووم کوڕنوشی برد بۆ ئەو خوایەی کە بەدی هێناوەو وێنەی کێشاوەو بیستن و بینینی بۆ کردۆتەوە.**

---

(٢٠٠) أخرجه أهل السنن وأحمد وانظر صحيح الترمذي ٨٣/١. وە زیادەی: ( وَبِحَمدِهِ ) صەحیحە. بروانە ( صفة صلاة النبي(ﷺ) ص١٤٦) .

(٢٠١) البخاري ٩٩/١ ومسلم ٣٥٠/١.

(٢٠٢) مسلم ٣٥٣/١ وأبوداود ٢٣٠/١.

(٢٠٣ )مسلم ٥٣٤/١ برقم(٧٧١) وغيره.

**پـاكی و بـێ كـەم و كـورتی و گـەورەیی بـۆ(ﷲ)ی چـاكترینی شێوەكێشان.**

**٥-** (( سُبحانَ ذي الجَبَروتِ.وَالمَلَكُوتِ. والكِبرِيآءِ. وَالعَظَمَةِ )).[٢٠٤]

**واتە: پاكی و بێ كەم و كورتی و گەورەیی بۆ تۆیە ئەی خاوەنی قەهرو تەصەروفی بێ سنوورو موڵك و گەورەیی و مەزنی.**

**٦-** (( اللَّهُمَّ اغفِر لي ذَنبي كُلَّهُ، دِقَّهُ وَجِلَّهُ، وَأَوَّلَهُ وَآخِرهُ، وَعَلانِيَتَهُ وَسِرَّهُ )).[٢٠٥]

**واتـە: خوایـە لەهـەموو گوناهـەكانم خـۆش ببـە: كـەم و زۆری. سەرەتاو كۆتایی و ئاشكراو پەنهانی.**

**٧-** (( اللَّهُمَّ إنّي أعوذ بِرضاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَبِمُعافاتِكَ مِنْ عُقوبَتِكَ، وَأعوذ بِكَ مِنْكَ، لآ أُحصي ثَناءً عَلَيكَ، أنتَ كَما أثْنَيتَ عَلَى نَفسِكَ)).[٢٠٦]

---

(٢٠٤) أبوداود ٢٣٠/١ برقم(٨٧٣) وأحمد٢٤/٦. والنسائي١٩١/٢ وصححه الألباني في صحيح أبي داود ١٦٦/١.

(٢٠٥) مسلم ٣٥٠/١ برقم(٤٨٣).

(٢٠٦) مسلم ٣٥٢/١ برقم(٤٨٦).

**تێبینی/ كامیان باشترە سەجدە یان وەستان؟**

**ابن القيم فەرمویەتی: (شێخمان (واتە ابن تيميه) فەرمویەتی: ڕاسترین ووتە ئەوەیە وەك یەك وان، وەستان چاكترە بە زیكرەكەی كە بریتیەیە لە قورئان خوێندن، وە سەجدەش باشترە بە شێوەكەی چونكە شێوەی سەجدە باشترە لە شێوەی وەستان، وەزیكری وەستانیش باشترە لە زیكری سوجدەكان). انظر: زاد المعاد: ٢٢٨/١.**

**واتە: خوایە: پەنا ئەگرم بە ڕەزای تۆ لە ناڕازی بوونت. وە پەنا ئەگرم بە لێبووردەیت لە سزادانت، وە پەنا ئەگرم پێت(لەوەی لێم ناڕازی بیت یان سزام بدەیت). ناتوانم ستایشی تۆ بژمێرم، تۆ بەو جۆرەی کە خۆت ستایشی خۆتت کردووە.**

## نزای دانیشتنی نێوان دوو کوڕنوشەکە

**١-** (( رَبِّ اغفِر لي، رَبِّ اغفِر لي )).(٢٠٧)

**واتە: پەروەردگارم لێم خۆش بە. پەروەردگارم لێم خۆش بە.**

**٢-** (( اللَّهُمَّ اغفِرْ لي، وَارحَمْني، وَاهدِني، وَاجبُرنِي، وَعافِني، وَارزُقْني، وَارفَعْني )).(٢٠٨)

**واتە: خوایە (لە گوناهو کەمتەرخەمیم لە گوێڕایەڵیتدا) خۆش ببەو ڕەحمم پێ بکەو ڕێنمایم بکە (و تەوفیقم بدە بۆ ووتەو کردەوەی چاك)و نوقسانیم پڕبکەرەوەو بێ نیازم بکەو پارێزراوو لەش ساغم بکەو ڕۆزیم بدەو پلەم بەرز بکەرەوە(لەهەردوو دونیا بە زانستی بەسوودو کردەوەی چاك).**

---

(٢٠٧) أبوداود ٢٣١/١ رقم(٨٧٤) والنسائي ١٩٩/٢ وابن ماجه(٨٩٧) وصحَّحَهُ الألباني في إرواء الغليل برقم (٣٣٥) وانظر صحيح ابن ماجه ١٤٨/١.

(٢٠٨) أخرجه اصحاب السنن الا النسائي وانظر صحيح الترمذي ٩٠/١ وصحيح ابن ماجه ١٤٨/١

# نزای کوڕنوشی قورئان خوێندن
# ( سُجودُ التِّلاوة )

١- (( سَـجَدَ وَجهـيَ لِلّـذي خَلَقَـهُ، وَشَـقَّ سَـمْعَهُ وَبَصَـرَهُ بِحَولـهِ وَقُوّتهِ)). (٢٠٩)

**واته: ڕووم کوڕنوشی بردبۆ ئەوخوایەی بەدی هێناوە وبیستن و بینینی بۆ داڕشتووە (وە توانای ئیدراکی پێ بەخشیون) بە گۆڕین و لادانی بەلا لییان و بەتوانای خۆی. پاکی و بێ کەم و کورتی و گەورەیی بۆ ئەو(ﷻ)ی کە چاکترینی بەدی هێنەرانە.**

٢- (( اللَّهُمَّ اكتُبْ لي بها عِندَكَ أجراً، وَضَعْ عَنّي بِها وِزراً، وَاجْعَلْها لي عِندَكَ ذُخراً، وتَقَبَّلها مِنّي كما تَقَبَّلْتَها منْ عَبدِكَ داودَ )). (٢١٠)

---

**(٢٠٩) الترمذي ٤٧٤/٢ برقم(٥٨٠) وأحمد ٣٠/٦ والحاكم وصححه ووافقه الذهبي٢٢٠/١ وفيه زيادة: {فتبارَكَ اللهُ أحسنُ الخالِقِينَ} لكن قال الألباني: وهي زيادة شاذة عندي...صحيح أبي داوده١٥٨/٥ برقم(١٢٧٣). وە ئایەتەکەش سورەتی (المؤمنين)ە ئایەتی(١٤).**

**(٢١٠) الترمذي ٤٧٣/٢ برقم(٥٧٩) والحاكم وصَحَّحَهُ ووافقه الذهبي ٢١٩/١.**

**<u>تێبینی/</u> دەربارەی سەجدەی تیلاوە: لە قورئانی پیرۆزدا لە پانزە(١٥) شوێندا سەجدەی تێدایە، بەلای جمهورەوە سوننەتی موستەحەبەو بەلای شێخی ئیسلامەوە سەجدەی تیلاوە واجبە، بەلای ڕاسترین بۆچوونەوە بۆ سەجدەی تیلاوە ئەو مەرجانەی ناوێت کە نوێژی سوننەت دەیەوێت: لە دەستنوێژو پاکێتی و داپۆشینی عەورەت و ڕووکردنە قیبلە، بەلام موستەحەبەو باشترە ئەگەر ئەوانەی تێدا بێت، هەروەك شیخ الإسلام ابن تیمیه وابن القیم ی قوتابی و الشیخ ابن باز، وابن عثیمین (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) تەرجیحی ئەمەیان داوە. بەلام لەشکران نابێت هیچ**

**واتـه: خوايـه بـەهۆی ئـەم كوڕنوشـەوه لـەلای خـۆت پاداشـتم بـۆ بنوسەو بچەسپێنەو بەهۆیەوە گوناهم لەسەر لاببەو لە لای خۆت پاداشتەكەیم بۆ هەڵگرە. وە لێم وەربگرە هەروەك چۆن لە بەندەی خۆت(داود) پێغەمبەرت وەرگرت(علیه الصلاة و السلام).**

# ئەگەر كەسێك ئایەتێكی بیرخستیتەوە

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: سَمِعَ النَّبِيُّ(ﷺ) قَارِئًا يَقْرَأُ مِنْ اللَّيْلِ فِي الْمَسْجِدِ فَقَالَ: (( يَرْحَمُهُ اللَّهُ لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذَا وَكَذَا آيَةً أَسْقَطْتُهَا مِنْ سُورَةِ كَذَا وَكَذَا)). (٢١١)

**واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) شەوێك لە مزگەوتدا گوێی لە كەسێك بوو قورئانی دەخوێند، فەرموی: ڕەحمەتی خوای لێ بێت فلانـە**

---

**قورئـان بخوێنێـت هـەتا خـۆی دەشـوات./ انظـر: مجمـوع فتـاوی شـيخ الإسـلام (١٦٥/٢٣–١٧٠) ، وتهذيب السنن لابن القيم(٥٣/١٤ – ٥٦)، ومجموع فتاوی ابن باز(٤٠٦/١١ – ٤١٥)، والشرح الممتع على زاد المستقنع لابن عثيمين(١٢٦/٤)، وتمام المنة في التعليق على فقه السنة للألباني (ص٢٧٠).**

**هەرچەند لەمەشدا زۆربەی زانایان دەستنوێژ بە مەرج دادەنێن.**

**ئەم سەجدەیەش یەك سەجدەیە بەبێ تەكبیری دابەستن، تەنها یەك تەكبیر دەكات بۆ چونە سەجدەكە یان هەستانەوەكەی، وە بەبێ سەلامیشە. بەڵام ئەگەر لە نوێژدا بوو تەكبیری چوون و هەستانەوەشی لەگەڵ دەكات.**

**(٢١١) صحيح البخاري ٥٠٠/٢١برقم(٥٠٤٢) واللفظ له، ومسلم(٧٨٨).**

**<u>تێبینی/</u> وتنی (صَدَقَ اللهُ العَظيم) لە كۆتایی قورئان خوێندندا بەوەی بكرێتە عادەت دروست نییەو داهێنراوە وەك زانایان فەرمویانە./ بڕوانە جلسات رمضانية(١٦١/٢) و مجموع فتاوی ابن باز(٣٠)جزءا (٣٢٩/٧).**

**ئایەت و فلأنە ئایەتی لە فلأنە سورەتدا بیرهێنامەوە کە من بیرم کردبوو(لە بیرم چووبویەوە).**

## لە چەند رۆژدا خەتمی بکرێت

عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو أَنَّ النَّبِيَّ(ﷺ) قَالَ: ((لَمْ يَفْقَهْ مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلَاثٍ)).(٢١٢)

**واتە: لە مانا ڕواڵەتییەکانی تێ نەگەیشتووە(و شارەزا نەبووە وەك داواکراوە لە قورئان خوێندندا هەبێت) کەسێك لە کەمتر لە سێ ڕۆژدا هەموو قورئان بخوێنێتەوە.**

## تەحییات( التّشَهُّد )

(( التَّحيّاتُ للهِ، والصَّلَواتُ، والطيّباتُ، السَّلامُ عَلَيكَ أيُّها النَّبيُّ(٢١٣) وَرَحمةُ اللهِ وَبَركاتُهُ، السّلامُ عَلَينا وَعَلَى عِبادِ اللهِ الصّالِحين، أشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلاّ الله، وَأشهَدُ أنَّ مُحَمّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ )).(٢١٤)

---

(٢١٢) رواه الترمذي(٢٩٤٩) وقال: هذا حديث حسن صحيح. وصححه الألباني أنظر صحيح أبي داود (١٢٦٠) والمشكاة (٢٢٠١)، والصحيحة (١٥١٣).

(٢١٣) ئەمە دەقی فەرمودەیەکی پێغەمبەرە(ﷺ)، بەڵام دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵەکان( ڕەزای خوایان لێ بێت) دەیان فەرموو: ((... السّلامُ على النَّبيّ وَ رَحْمَةُ الله وَ بَركاتُهُ )) رواه البخاري. فتح الباري (٣٩٩/٢) رقم الحديث (٣٩٩) وانظر صفة صلاة النبي(ﷺ) ص ١٦٢.

(٢١٤) البخاري مع الفتح٣١١/٢ ومسلم ٣٠١/١ برقم(٤٠٢).

**واتـە: (هەرچی گـەورەیی و مەزنایەتیـە تـەنها بۆ (الله)یـە نـەك بـۆ غـەیری ئـەو) و (هـەموو پاڕانـەوەو نوێـژ و پەرسـتش)و (ووتـەو کردەوە پاکەکانە) تەنها بۆ (الله)یـە نـەك بـۆ غـەیری ئـەو، سـڵاوو سەلامەتی و ڕەحمەتو بەرەکەت(زیادەی لە هـەموو چاکەیەك)ی خـوات لەسـەربێ ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ). سـڵاو لەسـەر ئێمەش(لە ئیمام و مەئموم و مەلائیکەتەکان و غەیری ئەوانیش)و لەسەر هەموو بەندە چاکەکانی خوای گەورە. شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە(الله). وە شایەتی دەدەم کە محمد (ﷺ) بەندەو نێردراوی خوایە.**

## صڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر( ﷺ )
## لە دوای تەحییات

**١-**(( اللَّهُـمَّ صَـلِّ عَلَـى مُحَمَّـدٍ وَعَلَـى آلِ مُحَمَّـدٍ، كَمـا صَـلَّيتَ عَلَـى إبراهيمَ، وَعَلَى آلِ إبراهيمَ، إنّكَ حَميدٌ مَجيدٌ، اللَّهُمَّ بارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَما بارَكْتَ عَلَى إبراهيمَ، وَعَلَى آلِ إبراهيمَ، إنّكَ حَميدٌ مَجيدٌ )).(٢١٥)

**واتە: خوایە صڵاوات بڕێژە بەسەر محمد(ﷺ)(واتە: پلـەی بـەرز بکـەرەوە لـە دونیـادا بـە بـەرز کۆدنـەوەی نـاوی و سەرخسـتنی**

---

(٢١٥) البخاري مع الفتح ٦/٤٠٨ برقم(٣٣٧٠).

بانگەوازەکەی و مانەوەی شەریعەتەکەی، وە لە قیامەتیشدا بە شەفاعەتی بۆ ئوممەتەکەی و چەند قاتکردنی پاداشت بۆی، یان واتە: باسی بکە لە ناو مەلائیکەتە پلە بەرزەکاندا)و خانەوادەو کەس‌وکارو شوێنکەوتووانی محمد(ﷺ). هەروەك صەلەواتت ڕژان بەسەر ئیبراهیم‌و کەس‌وکاری ئیبراهیم دا(علیه الصلاة والسلام). بەڕاستی تۆ سوپاس کراوو خاوەن شکۆو بەرزیت. خوایە بەرەکەت (واتە: زیادەیەك لە خێرو ڕێز، یان: پاککردنەوەو تەزکیە) بڕژە بەسەر محمد(ﷺ)و کەس‌وکاری محمد(ﷺ)دا. هەروەك فەڕو پیرۆزیت ڕژاندوە بەسەر ئیبراهیم‌و کەس‌وکارەکەیدا(علیه الصلاة والسلام). بە ڕاستی تۆ سوپاس کراوو خاوەنی شکۆو بەرزیت.

٢. (( اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمّدٍ وَعَلَى أزواجِهِ وَذُرِيّتِهِ، كَمَا صَلّيْتَ عَلَى آلِ إبراهيمَ، وَبارِكْ عَلَى مُحَمّدٍ وَعَلَى أزواجِهِ وَذُرِيتِهِ، كَمَا بارَكْتَ عَلَى آلِ إبراهيم، إنّكَ حَميدٌ مَجيدٌ )).(٢١٦)

واتە: خوایە صەلەوات بدە لەسەر محمد(ﷺ)و خێزان‌و نەوەکانی هەروەك صەلەواتت داوە لەسەر کەس‌وکاری ئیبراهیم(علیه الصلاة

(٢١٦) البخاري مع الفتح ٦/٤٠٧ برقم(٣٣٦٩) ومسلم ١/٣٠٦ برقم(٤٠٧) واللفظ له. تێبینی/ زیاد کردنی ووشەی(سیدنا) بۆ صەڵەوات لە کاتی تەحییاتدا بیدعەیە، چونکە زیادکردنی ووشەیەکە بۆ سەر صیغەکە، وە داهێنانی جۆری تری صەڵەوات و ووتنی لە کاتی نوێژەکاندا بە هەمان شێوە داهێنراوەو دروست نی‌یە./ بڕوانە فتاوی نور علی الدرب (١٨/٤٤٨).

**والسلام). وەبەرەکەت بڕژە(ڕێزو گەورەبی بەردەوام و زیاد بکە) بەسەر محمد(ﷺ)و خێزانو نەوەکانیدا. هەروەك ڕژاندوتە بەسەر کەسوکاری ئیبراهیم دا (علیه الصلاة والسلام). بەڕاستی تۆ شایستەی هەموو سوپاسێکی و گەورەو بەخشندەیت.**

# نزای پاش تەحیياتی کۆتایی و پێش سڵاودانەوە

١- (( اللَّهُمَّ إنّي أعوذ بِكَ مَنْ عَذابِ القبرِ. وَمنْ عَذابِ جَهَنَّم، وَمِنْ فِتنَةِ المَحْيا وَالمَماتِ. وَمِنْ شَرِّ فِتنةِ المَسيحِ الدَّجّالِ )).[٢١٧]

**واتە: خوایە پەنات پێئەگرم لە سزای گۆڕو سزای دۆزەخ و فیتنەو تاقیکردنەوەی ژیان و مردن(کاتی سەرەمەرگ یان ناو گۆڕ)و خراپەی تاقیکردنەوەی** (المَسيح الدَّجال)**سڕاوە لە خێر یان چاو سڕاوەی فێڵبازو درۆزن یان هەق داپۆشەر.**

٢- (( اللَّهُمَّ إنّي أعوذُ بِكَ مِنْ عَذابِ جَهَنَّم. وَمِنْ عَذابِ القَبْرِ. وَمِنْ فتْنَة المَحْيا وَالمَمات. وَمِنْ شَرِّ فِتنةِ المَسيحِ الدَّجّال )).[٢١٨]

**واتە: خوایە پەنات پێئەگرم لە سزای دۆزەخ و سزای گۆڕو فیتنەو تاقیکردنەوەی ژیان و مردن(کاتی سەرەمەرگ یان ناو گۆڕ)و خراپەی تاقیکردنەوەی** (المَسيح الدَّجال)**سڕاوە لە خێر یان چاو سڕاوەی فێڵبازو درۆزن یان هەق داپۆشەر.**

---

**(٢١٧) البخاري ١٠٢/٢ برقم(١٣٧٧)ومسلم ٤١٢/١ برقم(٥٨٨) واللفظ لمسلم.**

**(٢١٨) أخرجه مسلم ٤١٢/١ رقم ٥٨٨/١٢٨ وغيره عن أبي هريرة(رضي الله عنه).**

٣- (( اللَّهُـمَّ إنّـي أعـوذُ بِـكَ مِـنْ عَـذابِ القَبْـر. وأعـوذُ بِـكَ مِـنْ فِتنـةِ المَسيحِ الـدَّجّال. وأعـوذُ بِـكَ مِـنْ فِتنـةِ المَحيـا وَالـمَمات. اللَّهُـمَّ إنـّي أعوذُ بِكَ مِنَ الـمَأثَمِ والمَغرَم )).(٢١٩)

**واته: خوايه پەنات پێئەگرم لەسزای گۆڕو پەنات پێئەگرم لە ئاشوبەی مەسیحی دەجالو پەنات پێئەگرم لە ئاشوبەی ژیانو مردن. خوایه پەنات پێئەگرم لە گوناهو قەرزاری.**

٤- (( اللَّهُمَّ إنّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْماً كَثيراً، وَلا يَغْفِرُ الذُّنوبَ إلاّأنْتَ، فاغفِرْلي مَغْفِرةً مِنْ عِنْدِكَ وَارحَمني، إنّك أنْتَ الغَفُورُ الرَّحيم )).(٢٢٠)

**واته: خوایه من ستەمم لەنەفسی خۆم کردووە ستەمێکی زۆرو کەس لە گوناهو تاوان خۆش نابێ جگە لە زاتی تۆ. ساخوایه لێم خۆش ببە بە لێخۆشبوونی خۆتو ڕەحمم پێبکە، بە ڕاستی خۆت لێبووردەو بەڕەحمیت.**

٥- (( اللَّهُـمَّ اغفِرلي ماقَدَّمْتُ، وَما أخّرْتُ، وَما أسرَرْتُ، وما أعْلَنْتُ، وَما أسْرَفْتُ، وما أنتَ أعلَمُ بهِ مِنّي، أنتَ الـمُقَدِّمُ، وأنتَ الـمُؤَخِّرُ، لا إلهَ إلاّ أنتَ )).(٢٢١)

**واته: خوایه لەو گوناهانەم خۆش بە کەپێشم خستوەو پاشم خستوە( ئەگەر ئەنجامم دا) و ئەوانەش کە پەنهانم کردوەو**

---

(٢١٩) البخاري٢/١٠٢ برقم(٨٣٢) ومسلم ١/٤١٢ برقم(٥٨٩) واللفظ له.

(٢٢٠) البخاري ٨/١٦٨ برقم(٧٣٨٧) ومسلم ٤/٢٠٧٨ برقم(٢٧٠٥).

(٢٢١) مسلم ١/٥٣٤.

ئەوانەش کە ئاشکرام کردووەو زۆرو زیادەڕۆیم تێداکردوە. وە لەهەموو ئەوانەی کە تۆ زاناتری پێی لەمن. بەڕاستی تۆ پێشخەری پاداشتو سزایو تۆ پاشخەری، هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لەتۆ.

٦- (( اللَّهُمَّ أعِنّي عَلَى ذِكْرِكَ. وَشُكْرِكَ. وَحُسْنِ عِبادَتِكَ )).(٢٢٢)

واتە: خودایە کۆمەکیم بکەو یارمەتیم بدە لەسەر یادکردنتو سوپاس کردنتو چاك و بە نییەتی پاکەوە پەرستنت.

٧- (( اللَّهُمَّ إنّي أعوذُ بِكَ مِنَ البُخْلِ، وأعوذُ بِكَ مِنَ الجُبْنِ، وَأعوذُ بِكَ مِنْ أنْ أُرَدَّ إلي أرذَلِ العُمْرِ، وأعوذُ بِكَ مِنَ فِتْنَةِ الدُّنْيا وَعَذابِ القَبْرِ)).(٢٢٣)

واتە: خوایە پەنات پێئەگرم لە بەخیلیو نەبەخشین و پەنات پێ ئەگرم

لەترسنۆکی. وەپەنات پێئەگرم لەوەی کەبکەومە تەمەنێکی پیری و خراپیو پەنات پێ ئەگرم لەتاقیکردنەوەی دونیا، وە پەنات پێ ئەگرم لە سزای گۆڕ.

---

(٢٢٢) أبوداود ٨٦/٢ برقم(١٥٢٢) والنسائي ٥٣/٣ وصحَّحَهُ الالباني في صحيح أبوداود٢٨٤/١.

تێبینی: ئەم زیکرە لێرەدا یان لە دوای سلاودانەوەی نوێژدا دەوترێ. بڕوانە زیکرەکانی دوای سلاودانەوەی نوێژ.

(٢٢٣) البخاري مع الفتح ٣٥/٦ برقم(٢٨٢٢).

٨- (( اللَّهُـمَّ إنّـي أسـأَلُكَ الجَنّـةَ وَأعـوذُ بِـكَ مِـنَ النّـارِ )).(٢٢٤)

**واتـه: خوايـه داوای بەهەشـتت لـێدەکەمو پـەنات پێئـەگرم لـە ئاگری دۆزەخ.**

٩- (( اللَّهُـمَّ بِعِلْمِـكَ الغَيـبَ وَقُـدرتِكَ عَلَـى الخَلْـقِ أحيِنـي ماعَلِمْـتَ الحَياةَ خَيْراً لي، وَتَوفَّني إذا عَلِمْتَ الوَفاة خَيراً لي. اللَّهُمَّ إنّي أسأَلُكَ خَشْـيَتَكَ فـي الغَيـبِ والشَّـهادَةِ. وأسـأَلُكَ كَلِمَـةَ الحَـقِّ فـي الرِّضـا والغَضَبِ. وَأسأَلُكَ القَصْدُ في الغِنَى وَالفَقْرِ. وَأسأَلُكَ نَعِيماً لا يَنْفَذُ. وَأسأَلُكَ قُرَّةَ عَينٍ لا تَنقَطِع. وَأسأَلُكَ الرِّضا بعدَ القَضاءِ. وَأسأَلُكَ بَـرْدَ العَيشِ بَعْدَ المَوتِ. وَأسـأَلُكَ لَـذَّةَ النَّظَـرِ إلـى وَجْهِـكَ وَالشَّـوقَ إلـى لِقائِكَ في غَيرِ ضَرّآءَ مُضِرَّةٍ وَلا فِتْنَةٍ مُضِلّةٍ. اللَّهُمَّ زَيِّنا بِزينةِ الإيمانِ وَاجعَلْنا هُداةً مُهْتدِينَ )).(٢٢٥)

**واتـه: خوایـه بـه زانینـت بەغـەیب و نهێنـی و نادیارەکـان و بـەتوانای خـۆت بەسـەر دروسـت کراوانتـدا بمژێنـه تـا ئەوکاتـەی خـۆت ئـەزانیت ژیـان چـاکه بـۆمو بممرێنـه هـەر کـات مـردن چـاك بـوو بـۆم. خوایـه داوای ترسـانت لـێدەکەم لـەتۆ لـەوەی لـێم نادیـارەو لـەوەدا کـه ئـەیبینم لـه هـەموو کاتێکـدا، وه داوای وتنـی ووتـەی هـەق ورەوات لـێدەکەم**

---

(٢٢٤) أبوداود برقم(٧٩٢) وابن ماجه، وانظر صحيح ابن ماجه ٣٢٨/٢.

(٢٢٥) النسائي ٥٤/٤، ٥٥ وأحمد ٣٦٤/٤ وصححه الألباني في صحيح النسائي ٢٨١/١.

لـــەكاتی ڕازی بـــوون و تووڕەیمـــدا. وەداوای مامناوەنـــدیت لـــێ دەكەم لەدەوڵەمەنـــدیو هـــەژاریم دا. وەداوای نیعمـــەتێكت لـێ دەكـەم كـە نەبڕێتەوە(كـە نیعمـەتی بەهەشـتە)و خۆشـی و شـادییەك و گەشـتن بـە ئاواتێـك كـە نـەفس ڕازی بكـات كـە نەپچـڕێو لەبـەر چـاو وننـەبێت. وە داوای ڕازی بونـت لـــێ دەكەم لـــەدوای قـــەزاو بڕیـــارت بەســـەرم دا. وە داوای ژیـــانێكی خـــۆش و فێنكـــت لـــێ دەكەم لـــەدوای مـــردن. وە داوای چـــێژی تێڕوانینـــت لـــێ دەكەم بـــۆ ڕووی پـــیرۆزت و تامـەزرۆیی بینینـت بمژیەنـەو بمرێنـە بـەبێ ناڕەحەتییـەكی زیـان گەیـەن و تاقیكردنەوەیـەكی گومڕاكـەر. خوایـە بمـان ڕازێنـــەرەوە بـــەجوانی ئیمـــان و شـــەریعەت و بمانكـــە بـــە ڕێنمونیكارانی ڕێنمونی كراوان.

١٠- (( اللَّهُــمَّ إنّــي أســألُكَ يــاأللهُ بأنّــكَ الواحــدُ الأحَــدُ الصَّــمَدُ. الّـذي لَـمْ يَلِـدْ وَلَـمْ يُولَـد. ولَـمْ يَكُـنْ لَـهُ كُفُـواً أحَـدٌ. أنْ تَغْفِـرَ لـي ذُنوبي إنّكَ أنْتَ الغَفُورُ الرَّحِيم )).(٢٢٦)

واتـە: خوایـە مـن داوات لـێ دەكەم ئـەی خوایـە بـە هـۆی ئـەوەی كـــە تـــۆ تـــاك و تـــەنیای بـــێ وێنـــەو جێـــی نیـــازی

---

(٢٢٦) (وەپێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتـە مزگـەوت پیاوێكی بینـی لـە تەحییاتدایـەو ئـەم دوعایە دەخوێنێ، پێی فەرموو: خوا لێی خۆشبوو.. سێ جار). أخرجه النسائي بلفظه٣/٥٢ وأحمد ٤/٣٣٨ وصحَّحَهُ الألباني في صحيح النسائي ١/٢٨٠.

**پێویستییەکانییت و دەوڵەمەندی، ئەو خوایەی نەکەست لێ بووەو نە لەکەس بوویتو کەس لە هاوویێنەو هاوتای تۆ نییە. داوات لێ ئەکەم لە گوناهەکانم خۆش بیت بەڕاستی تۆ لێبوردەو بەخشندەیت .**

**١١-** (( اللَّهُمَّ إنّي أسألُكَ بأنَّ لَكَ الحَمْدُ لا إلهَ إلاّ أنْتَ وَحدَكَ لاشَريكَ لَكَ. المَنّانُ. يا بَديعَ السَّمواتِ وَالأَرضِ. ياذا الجَلالِ والإكْرام. ياحَيُّ ياقَيّومُ إنّي أسألُكَ الجَنّةَ وَأعوذُ بِكَ مِنَ النّار )).(٢٢٧)

**واتە: خوایە من لێت دەپاڕێمەوە بەوەی کە هەموو ستایشێك بۆتۆیە هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە تۆ، تەنیای بێ هاوەڵی تۆ خاوەنی بەخششی زۆری. ئەی داهێنەری ئاسمانەکانو زەوی لەسەر شێوەیەکی پێشتر نەبوو ئەی خاوەنی گەورەیی و شکۆو نیعمەت و چاکە. ئەی زیندوی مشورگێڕو هەڵسوڕێنەری بوونەوەر من داوای بەهەشتت لێدەکەمو پەنات پێئەگرم لە ئاگر.**

**١٢-** (( اللَّهُمَّ إنّي أسألُكَ بأنّي أشهَدُ أنّكَ أنْتَ اللهُ لا إلهَ إلاّ أنْتَ. الأَحَدُ الصَّمَدُ. الّذي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَد. وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أحَد )).(٢٢٨)

---

(٢٢٧) (پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: بە ناوە گەورەکەی خوا پاڕایەوە کە هەر کەس پێی بپاڕێتەوە وەڵام دەدرێتەوەو پێی داوابکرێت پێی دەبەخشرێت). رواه أهل السنن وانظر صحيح ابن ماجه ٣٢٩/٢.

(٢٢٨) أبوداود ٦٢/٢ برقم(١٤٩٣) والترمذي ٥١٥/٥ برقم(٣٤٧٥) وابن ماجه ١٢٦٧/٢ برقم(٣٨٥٧) وأحمد٣٦٠/٥ وانظر صحيح ابن ماجه /٣٢٩ وصحيح الترمذي١٦٣/٣.

واتە: خوایە من ئەپاڕێمەوە لێت بەوەی کەمن شایەتی دەدەم کەتۆ (الله)یت هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە تۆ، تاکی جێی نیازی کەست لێ نەبوەو لەکەسیش نەبویتو کەس هاوشێوەو هاوتای تۆ نییە.

١٣- (( اللَّهُمَّ حاسِبْني حِساباً يَسيراً )).(٢٢٩)

واتە: خوایە (لە رۆژی دواییدا) بە لێپرسینەوەیەکی ئاسان.(٢٣٠) لێپرسینەوەم لەگەڵ بکە.

١٤- (( اللَّهُمَّ إنِّي أعوذُ بَكَ مِنَ شَرِّ ما عَمِلْتُ وَمِنْ شَرِّ ما لَم أعمَلْ {بَعْدُ} )).(٢٣١)

خوایە: من پەنات پێدەگرم لە خراپەی ئەوەی کە ئەنجامم داوەو کردومە لە تاوان و خراپە. وە لە خراپەی ئەوەی کە نەمکردووەو هێشتا ئەنجامم نەداوە لە چاکە.

١٥- (( اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ الْخَيْرِ كُلِّهِ، {عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ}، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمْ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ الشَّرِّ كُلِّهِ، {عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ}، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمْ، وَأَسْأَلُكَ(وفي رواية: اللهم إني أسألك) الْجَنَّةَ، وَمَا قَرَّبَ إِلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ النَّارِ، وَمَا

(٢٢٩) رواه أحمد والحاكم وصححه و وافقه الذهبي (صفة صلاة النبي للألباني).

(٢٣٠) لێ پرسینەوەی ئاسان ئەوەیە کە موناقەشەی کردەوەکانی لەگەڵا نەکرێ. بەڵکو پیشان بدرێو بەس.

(٢٣١)أخرجه النسائي١٩٢/١ وأخرجه ابن أبي عاصم والزيادة له، وصححه الألباني أنظر أصل صفة صلاة النبي(ﷺ)١٠٠٧/٣.

قَرَّبَ إِلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ، وَأَسْأَلُكَ(وفي رواية: اللهم إني أسألك) مِنْ {الـ}خَيْرِ مَا سَأَلَكَ عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ {مُحَمَّدٌ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ}، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ ما اسْتَعَاذَكَ مِنْهُ عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ {مُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ}، {وَأَسْأَلُكَ} مَا قَضَيْتَ لِي مِنْ أَمْرٍ أَنْ تَجْعَلَ عَاقِبَتَهُ {لِي} رَشَداً )).(٢٣٢)

**واتە: خوایە من داوات لێ ئەکەم لە هەموو خێرێك نزیك و دوورەکەی، ئەوەی من زانیاریم لێی هەیەو ئەوەشی نیمە، وە پەنات پێ ئەگرم لە هەموو خراپەیەك، نزیك و دووری، ئەوەی من زانیاریم لێی هەیەو ئەوەشی نیمە، وە داوای بەهەشتت لێ ئەکەم و داوای هەر ووتەو کردەوەیەکت لێ ئەکەم کە لەبەهەشت نزیکم بکاتەوە، وە پەنات پێ ئەگرم لە ئاگری دۆزەخ و هەر ووتەو کردەوەیەك کە لە ئاگرم نزیك بکاتەوە، خوایە من لەو خێرانەت داوا لێ ئەکەم کە بەندەو نیردراوەکەت محمد(ﷺ) داوای لێ کردویت و پەنات پێ ئەگرم لە هەموو ئەو شتانەی بەندەو نێردراوەکەت محمد(ﷺ) پەنای پێ گرتویت لێی، خوایە لێت دەپاڕێمە هەر بڕیارێکت داوە بۆم کۆتاییەکەی بە خێر کۆتایی پێ بهێنیت.**

---

**(٢٣٢) پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی بە عائشە(ڕەزای خوای لێ بێت) کرد کە ئەمە بڵێت.رواه أحمد في مسنده، وصححه الألباني في صفة الصلاة، ص: ١٨٥. وانظر أصل صفة صلاة النبي(ﷺ) (١٠١٢/٣). وانظر صحيح الجامع برقم(٤٠٤٧). وصحيح الأدب المفرد (٢٤٣/١) برقم(٦٣٩/٤٩٨).**

## ١٦- وه ئەتوانێ بپاڕێتەوه لەم نێوانەدا تا سلاّوی نوێژ دەداتەوه بە هەر پاڕانەوەیەك كە خۆی پێی باش بێت.[٢٣٣]

(٢٣٣) البخاري(٢/٣٢٠) رقم(٨٣٥) و مسلم(١/٣٠١) رقم(٤٠٢) بلفظ: (( ثمّ يَتَخَيَّر مِنَ المسألَةِ ما شاءَ )) واته: پاشان كام دووعایەی دەوێ هەڵی ببژێرێت وئیختیاری بكات و پێی بپاڕێتەوه.

زانایانی سەلەف دەفەرموون: بەلاّم باشتر وایە چی(وارد) بووه لەم كاتەدا ئەوه بخوێنێ بەتایبەت لە نوێژە فەرزەكاندا.

تێبینی/ئەم پاڕانەوەیە موستەحەبەو واجب نی‌یە، وه موستەحەبە درێژ بكرێتەوەو زۆر بپارێیتەوه مەگەر ئیمام بێت، ئەتوانێت بە پاڕانەوه مەئثورەكان بپارێتەوەو ئەشتوانێت بە دوعای تری خۆی بپاڕێتەوه، بەلاّم مەئثورەكە باشترە بەتایبەت ئەوانەی تایبەتە بەم كاتەوه./ كتاب الأذكار، للإمام النووي، ص: ٩٥. وه شێخی ئەلبانیش فەرمویەتی أصل صفة صلاة ٣/١٠٠٢.

(پاڕانەوەكە پێش سلاّودانەوەیە، چونكە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاماژەی ئەمەی پێ داوین و لەبەر ئەوەش كە نوێژ موناجاتە و پاڕانەوەی ئەو كاتە باشترە). الشرح الممتع على زاد المستقنع: ٣/٢٧٩.

(بەلاّم پاڕانەوەی دوای نوێژو ڕوو بە قیبلە یان مەئمومەكان، هەرگیز پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەیكردووەو لێوەی ڕیوایەت نەكراوه نە بە فەرمودەی صەحیح نە حەسەن). زاد المعاد: ١/٢٤٩.

# ویردی دواى سڵاودانەوەى نوێژ[٢٣٤]

**١- سێ جار بڵێ** (( أستغفِرُ الله )). **ئینجا بڵێ:** (( اللَّهُـمَّ أنتَ السَّـلامُ وَمِنْكَ السَّلامُ. تَبارَكْتَ يا ذا الجَلالِ وَالإكرام )).[٢٣٥]

**واتە: خوا گەورەیە، داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم.. خوایە تۆ سەلامی(واتە: بێ عەیب و گۆڕنت بەسەردا نایەت و سەلامەتی بەخشیت) وە ئاشتی و سەلامەتیش لە تۆوەیە. بەرزو گەورەیی و خێر زۆری و فراوانی بۆ تۆیە ئەی خاوەنی دەستەڵات و گەورەیی و ڕێز.**

**٢-** (( لا إلَه إلاّ الله وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ. لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهَوَ عَلَى كُلّ شَيءٍ قَديرٌ. اللَّهُمَّ لا مانِعَ لِما أعْطَيْتَ. ولا مُعطيَ لِما مَنَعْتَ. وَلا يَنْفَعُ ذا الجَدِّ مِنْكَ الجَدّ )).[٢٣٦]

**واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە(الله) تاکی بێ هاوبەشە، هەموو موڵكو ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێك دا بەتوانایە. خوایە ڕێگر نییە بۆ ئەو شتەی تۆ دەیبەخشی و**

---

(٢٣٤) ابن حجر(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە شەرحی ئەو فەرمودەیەدا کە باس لە دەنگ هەڵبڕین دەکات بە زیکر لە دوای نوێژەکانەوە فەرمویەتی: (نەوەوی فەرمویەتی: شافیعی ئەم فەرمودەیەی حەمل کردۆتە سەر ئەوەی هاوەڵان ماوەیەکی کەم بە دەنگی بەرز وتویانە تا شێوەی زیکرەکە فێر بن، نەك ئەوەی بەدەوام بە دەنگی بەرز کردبێتیان، وە ڕای هەڵبژاردەش ئەوەیە کە ئیمام و مەئومەکان بە نهێنی زیکرەکە دەکەن مەگەر پێویست بکات بە فێر کردنی خەڵك).فتح الباری٢٤٨/٣

(٢٣٥) مسلم ٤١٤/١ برقم(٥٩١).

(٢٣٦) البخاري ٢٥٥/١ برقم(٨٤٤) ومسلم ٤١٤ برقم(٥٩٣).

بەخشەر نییە بۆ ئەو شتەی تۆ دەیگریتەوەو هیچ خاوەن پایەو دەستەلأتێك دەستەلأتەکەی سوودی نییە بۆی  لە ڕۆژی دواییدا لە سزای تۆ.

٣- (( لا إلـهَ  إلاّ الله وَحْدَهُ لا شَريكَ لَه. لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهَوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدير. لاحَوْلَ وَلا قُوةَ إلاّ بالله. لا إله إلاّ الله. وَلا نَعْبُد إلاّ إيـّاهُ. لـهُ النّعْمَـةُ وَلَـهُ الفَضْـلُ وَلَـهُ الثّنـاءُ الحَسَـنُ. لا إلـهَ إلاّ الله مُخلصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوكَرِهَ الكافِرونَ )).(٢٣٧)

**واتـە: هـیچ پەرسـتراوێك نییـە بەهـەق جگـە لـە(الله) تـاكو بـێ هاوبەشە. هەموو موڵكو ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هـەموو شـتێك دا بەتوانایـە. هـیچ گـۆڕانو هێزێـك نییـە مەگـەر بـەخواوە. هـیچ پەرسـتراوێك نییــە بەهــەق جگــە لــە(الله) وەجگــە لــەو كــەس ناپەرستین. هەموو نیعمەتێك تەنها هـی ئـەوەو فـەزڵو ستایشـی چاك لە هەموو شتێكدا بـۆ ئـەوە. هـیچ پەرسـتراوێك نییـە بەهـەق جگـە لـە(الله). ئێمـە بـەردەوام لەسـەر ئـیخلاص و تەوحیـدین لـە هــەموو پەرستشــەكانماندا ئەگــەر چــی بێبـاوەڕانیش پێیـان ناخۆش بێ.**

٤- (( سُبحانَ الله )) **٣٣جـار** (( الحَمْـدُ للهِ )) **٣٣جـار**(( اللهُ أكبَـر )) **٣٣جار ئینجا بڵێ**: (( لا إلهَ إلاّ الله وَحدَهُ لا شريَكَ لَهُ. لَهُ المُلْكُ لَهُ الحَمْدُ وَهوَ على كُلِّ شيءٍ قَدير )).(٢٣٨)

---

**(٢٣٧) مسلم ١/٤١٥ برقم(٥٩٤).**

**(٢٣٨) (هەركەسێك ئەمە بڵێت لـەدوای هـەموو نوێـژێكی فـەرز ئـەوا خـوای گـەورە لـە گوناهەكانی خۆش دەبێ ئەگەر چی بەوێنەی كەفی دەریا بێت) مسلم (٥٩٧).**

**<u>تێبینی</u>: بەم جۆرەی یەکەمەوە شەش جۆر تەسبیحات هەیە، چونکە لە فەرموودەی تردا ئەم زیکرانە بە بێ زیادەی: ((لا إلهَ إلاّ الله وَحدَهُ ...)) بەم جۆرانە هاتووە:**

**أ- یەکی(١٠)جار دەیڵێت.**(٢٣٩)

**ب- یەکی(١١) جار دەیڵێت.**(٢٤٠)

---

(٢٣٩) پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (ئایا هەواڵتان بدەمێ بە شتێك کە بە هۆیەوە دەگەنەوە بەوانەدا کە پێشتان کەوتوون لە چاکەداو پێشی ئەوانەش دەکەون کە دوای ئێوە دێن و کەس بە کردەوەی چاکی هاووێنەی ئێوەوە نایەت مەگەر کەسێك وەك ئێوە بکات: دوای هەموو نوێژێك (١٠) جار سبحان الله و (١٠) جار الحمدلله، وە(١٠) جار الله اکبر بکەن). البخاري برقم(٦٣٢٩).

وە لە فەرمودەیەکی تردا هاتووە: (دوو سیفەت هەن هیچ بەندەیەکی موسڵمان نییە کە پارێزگاریان لێ بکات ئیلا دەچێتە بەهەشتەوە، ئەوانیش زۆر ئاسانن و ئەوانەشی بە (بەردەوامی) ئەنجامی دەگەیەنن کەمن: دوای هەموو نوێژێك (١٠) جار سبحان الله و (١٠)جار(الحمدلله) و (١٠) جار (الله اکبر) بکات، ئەمە (لە ڕۆژێکدا) لەسەر زوبان دەکاتە (١٥٠) بەڵام لە تەرازوی چاکەکاندا دەکاتە (١٥٠٠) وە من پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی بە دەستی(ڕاستی) دەیژماردن. وە کە چووە ناو جێگای نوستنی (٣٣) جار سبحان الله و (٣٣) الحمدلله و (٣٤) الله اکبر دەکات، ئەمە بە زوبان (١٠٠) دەکات و لە کێشانەشدا (١٠٠٠) ، جا کێ هەیە لە ئێوە لە ڕۆژو شەوێکدا (٢٥٠٠) گوناه ئەنجام بدات، ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) باشە ئێمە چۆن نایانخوێنین؟ فەرموی: شەیتان لە کاتی نوێژدا دێتە لای یەکێکتان و پێی دەڵێ بیر لەوەو لەوە بکەرەوەو لە کاتی خەوتنیشیدا دێت وە خەوی لێ دەخات تا نەیڵێت). رواه الترمذي (٣٤١٠)، والنسائي (١٣٤٧) واللفظ لـه، وأبـو داود (٥٠٦٥)، وابـن ماجـه(٩٢٦). وصححه الألباني انظرصحيح الترغيب والترهيب١/١٤٧ برقم (٦٠٦).

(٢٤٠) مسلم رقم (٥٩٥- ١٤٣). هەر لە هەمان فەرمودەدا هاتووە کە یەکی (٣٣) جار دەوترێت.

**ج- یەکی(٢٥) جار دەیڵێت و لەگەڵ زیادەی(٢٥)جار وتنی:** ( لا إلهَ إلاّ الله )**دا.**(٢٤١)

**د-**(سُبحانَ الله)**(٣٣) جار و** (الحَمدُ لله)**(٣٣) جار و**(الله أكبر)**(٣٤) جار.**(٢٤٢)

**هـ-** (سُبحانَ الله، وَالحَمدُ للهِ، وَاللهُ أكبرَ) **(٣٣ جار) واتە بەیەکەوە یەکی دەبنە ٩٩جار.**(٢٤٣)

---

**(٢٤١) رواه النسائي برقم (١٣٥٠ و١٣٥١)، والترمذي برقم (٣٤١٣)، وصححه الألباني في صحيح النسائي (١٩١/١) والمشكاة برقم (٩٧٣). لە فەرمودەکەی (٣٣)بە (٣٣) بە(٣٤)جار وتنیاندا هاتووە. ئەمەیان لە خەودا بە پیاوێك لە هاوەڵانی ئەنصاری ووتراو پێغەمبەری خواش(ﷺ) ئیقراری کرد.**

**(٢٤٢) هەرکەس ئەمە بڵێت نائومێد نابێت. أخرجه مسلم برقم (٥٩٦). والنسائي(صحيح سنن النسائي) رقم(١٢٧٨) والترمذي(٣٦٥٣) ومسلم(١٣٤٨) انظر سلسلة الصحيحة برقم(١٠٢).**

**تێبینی/ فەرمودەکە ووشەی (معقبات)ی تێدا هاتووە.**

**شێخی ئەلبانی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (مُعَقِّبات)واتە چەند ووشەیەك دوای نوێژەکە دەوترێت. وە(المعقب) ئەوەیە کە لە پێش شتی ترەوە هاتووە.**

**منیش دەڵێم: فەرمودەکە ئەو دەقەی تێدایە کە ئەم زیکرە ڕاستەوخۆ دوای نوێژە فەرزەکە دەوترێت. هەروەها ئەو زیکرانەی تریش کە لە پێشتر باسکران و غەیری ئەوانیش، جا ئیتر ئەو نوێژە فەرزە نوێژی سوننەتی لە دواوە هەبێت یان نا، وە هەر یەکێك لەو مەزهەبانەی وتویانە ئەم زیکرە دوای نوێژە سوننەتەکە دەوترێت لەگەڵ ئەوەی هیچ بەڵگەو دەقێکیان پێ نی یە. پێچەوانەشە بەم فەرمودەیەو هاووێنەکانی کە دەقێکن لەم مەسەلەیەدا. والله ولي التوفيق / السلسلة الصحيحة١٦٢/١ برقم(١٠٢).**

**(٢٤٣) البخاري برقم (٨٤٣)، ومسلم برقم (٥٩٥).**

**٥- سورەتی** ﴿ قُلْ هوَ اللهُ أحَد ﴾ و ﴿ الفَلَق ﴾ و ﴿ النـّاس ﴾ **بخوێنـه له دوای هەموو نوێژێکی فەرز.**[٢٤٤]

**٦-خوێندنی** ﴿ آيةَ الكُرسي ﴾ **له دوای هەموو نوێژێکی فەرز.**[٢٤٥]

**٧-** (( لا إلـهَ إلاّ وحـدَهُ لا شَـريكَ لَـهُ، لَـهُ المُلـكُ، وَلَـهُ الحَمـدُ، يُحيـي ويُميـتُ، وَهُـوَ عَلَـى كـلّ شـيءٍ قَـديرٌ )). **(دە) جـار لـه دوای نوێـژی مەغريب و بەيانی.**[٢٤٦]

---

(٢٤٤) أبوداود ٨٦/٢ برقم(١٥٢٣) والنسائي ٦٨/٣ وانظر صحيح الترمذي ٨/٢. وە ئەم سێ سورەته پێیان دەوترێت (المُعَوِّذات) وأنظر فتح الباري ٦٢/٩. وهو صحيح (انظر صحيح أبي داود ٢٨٤/١).

(٢٤٥) (هەرکەسێ لەدوای هەموو نوێژێکەوە بيخوێنێت هيچ ڕێگری نیيه لەچوونه بەهەشت جگه لـەوە نـەبێ بمـرێ). النسـائي في عمـل اليـوم والليلـة بـرقم (١٠٠). وابن السني برقم(١٢١) وصححه الالبـاني في صـحيح الجـامع ٣٣٩/٥ بـرقم(٦٤٦٤) وسلسلة الاحاديث الصحيحة ٦٩٧/٢ برقم (٩٧٢).

(٢٤٦) ئەمە پێش هەستان له جێگەکەی خۆت و قاچ جوڵاندن دەوترێ.( هەر کەسێك ئەم نزايه بڵێت له دوای نوێژی بەيانی و ئێوارەوە ئەوا به هەر دانەيەکی(١٠) چاکەی بـۆ دەنوسـرێت و(١٠) خراپـەی لێ دەسـڕێتەوە و، (١٠) پلـەش بـەرز دەبێتـەوە و دەپارێزرێت لـه هـەموو خراپەيـەك و، دەپارێزرێـت لـه شـەيطـان. وە هـيچ گوناهێك نايگرێتەوە. جگه له شرك، وە چاکترين کەسـه کـه کـردەوەی ئـەنجام داوە و تـەنها کەسـێك لـەو باشـترە کـه لـەو باشـتری ووتبێـت/ رواه الترمـذي ٥١٥/٥ بـرقم(٣٤٧٤) وأحمد ٢٢٧/٤ وانظر صحيح الترغيب و الترهيب رقم(٧٤٥) ص ١٩١ – ١٩٢ حديث حسن. وانظر تخريجه في زاد المعاد ٣٠٠/١ وانظر صحيح الترمذي ١٩٠/١-١٩١,

٢-وە له فەرموودەی تردا هاتووە کە: ( هەر کەسێك دە(١٠)جار بيڵێ له دوای نوێژی بەيانیيەوە ئەوا کۆمـەڵێك فريشـتەی بۆ دەنێردرێـت تـا لـه شـەيطـان بيپـارێزن تـا بـەيانیو(١٠) چـاکەی رزگارکـەری بـۆ دەنوسـرێت و(١٠) گونـاهی لەناوبـەری

دەسڕێتەوەو پاداشتی ڕزگارکردنی(١٠) بەندەی بڕواداری بۆ دەنوسرێت). انظر ترتیب أحادیث انظر ترتيب أحاديث( صحيح الجامع الصغير) ٢/٤٣٠ رقم(٣٧).

٣-له ڕیوایەتی تردا هاتووه: (هەر کەسێك دوای نوێژی بەیانی هەر بەو شێوەیەی قاچی داناوه(ثان رجليه) پێش ئەوەی قسە بکات (دە)جار بیڵێت. ئەوا خوای گەورە ١٠چاکەی بۆ دەنوسێت و ١٠ خراپەی بۆ دەسڕێتەوەو ١٠ پلە بەرزی دەکاتەوەو هەموو ئەو ڕۆژە پارێزراو دەبێت لە هەموو ناخۆشی و خراپەیەك و پارێزراو دەبێت لە شەیتان، وە بۆ هیچ تاوانێك نییە کە ئەو ڕۆژە بیگرێتەوە (واتە کە بەهیلاکی ببات و کردەوەکانی بەتاڵ بکاتەوە) مەگەر هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە./ رواه الترمذي عن أبي ذر رضي الله عنه واللفظ له وقال حديث حسن غريب صحيح، والنسائي وزاد فيه: (...بيده الخير..)، وزاد فيه أيضا: (..وكان له بكل واحدة قالها عتق رقبة مؤمنة). ورواه النسائي أيضا من حديث معاذ وزاد فيه: (من قالهن حين ينصرف من صلاة العصر أعطي مثل ذلك في ليلته)./ ضعفه الألباني في ضعيف الجامع برقم(٥٧٣٨) لكن ثم حسنه في صحيح الترغيب والترهيب(١/١١٣) برقم(٤٧٢). انظر مختصركتاب (الإعلام بآخر أحكام الألباني الإمام) ٩/٤ صفحة ١٨٨ برقم(٢٨٩).

٤-هەرکەسێك دوای نوێژی مەغریب و بەیانی (پێش ئەوەی لە جێگای نوێژەکەی هەستێت و بڕوات قاچی بجوڵێنێت) بڵێت: ((لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد يحيي ويميت وهو على كل شيء قدير)) ١٠ جار خوای گەورە بە هەر دانەیەکیان ١٠ چاکەی بۆ دەنوسێت و ١٠ تاوانی دەسڕێتەوەو ١٠ پلە بەرزی دەکاتەوەو دەبێتە پارێزگاری بۆی لە هەموو خراپەیەك و دەپارێزرێت لە شەیتانی دوورخراوە لە ڕەحمی خوا وە هیچ تاوانێك نایگرێتەوە جگە لە شیرك، وە لە چاکترین کەسێکە کە کردەوەی باشی کردبێت مەگەر کەسێك پێشی ئەم بکەوێت و لەم باشتر بڵێت./ رواه أحمد عن عبد الرحمن بن غنم رضي الله عنه ورجاله رجال الصحيح غير شهر بن حوشب وعبد الرحمن بن غنم مختلف في صحبته وقد روي هذا الحديث عن جماعة من الصحابة رضي الله عنهم. وفي رواية عن أبي ذر: (من قال في دبر صلاة الفجر وهو ثان رجليه قبل أن يتكلم : لا إله إلا الله وحده .... ولم ينبغي لذنب أن يدركه في ذلك اليوم إلا الشرك بالله).صححه الألباني دون ما بين القوسين: هداية الرواة(٩٣٥)، ثم حسنه

بتمامه في صحيح الترغيب والترهيب (١/١١٤) برقم(٤٧٧) طبعة المعارف. أنظر مختصركتاب (الإعلام بآخر أحكام الألباني الإمام)٤/٩ صفحة ١٨٨ رقم(٢٨٩).

٥- وە تايبەت بە دواى نوێژى مەغریب: (هەر كەسێك دواى نوێژى مەغریب (١٠)جار بیڵێت ئەوا خواى گەورە كۆمەڵێك مەلائیكەتى بۆ ئەنێرێت تا لە شەیتان بیپارێزن هەتا بەیانى لێ دەبێتەوەو بە هۆیەوە خواى گەورە ١٠چاكەى واجبكار(موجبات)ى بۆ دەنوسێت و (١٠)خراپەى تیابەر(موبقات)ى لێ دەسڕێتەوەو بە ئەندازەى ڕزگار كردنى (١٠)كۆیلەى ئیماندار پاداشتى دەكات). رواه الترمذي(٣٥٣٤) عن عمارة بن شبيب وضعفه الألباني في ضعيف الجامع (٥٧٣٩). ولكن تراجع عنه وحسنه في صحيح الترغيب و الترهيب(٤٧٣). أنظر مختصركتاب (الإعلام بآخر أحكام الألباني الإمام) ٥٦/٧ صفحة ١٥٩ برقم(٢٢٨).

٦- دواى نوێژى بەیانى و نوێژى مەغریب (١٠) جار (بەم لەفزە)ش هاتووە:

هەر كەسێك كاتێ سڵاو دەداتەوە لە نوێژى بە یانى بڵێت: ((لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد بيده الخير وهو على كل شيء قدير))١٠ جار ئەوا حەوت پاداشتى پێ دەبەخشرێت: خواى گەورە بە هۆیەوە ١٠ چاكەى بۆ دەنوسێت و ١٠ خراپەى لەسەر دەسرێتەوەو ١٠ پلە بەرزى دەكاتەوەو پاداشتى ڕزگار كردنى ١٠ كەسى بۆ هەیەو دەبنە هۆى پارستنى لە شەیتان و دەپارێزرێت لە ناخۆشىو ئەو ڕۆژە هیچ تاوانێك نایگرێتەوەو جگە لە هاوبەش دانان بۆ خوا، وە هەركەسێك دواى سڵاو دانەوەى لە نوێژى مەغریب بیڵێت ئەو شەوە هەمان پاداشتى بۆ هەیە.// رواه ابن أبي الدنيا والطبراني عن معاذ بن جبل بإسناد حسن واللفظ له. وحسنه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب (١/١١٤) برقم(٤٧٥).

٧- بەیانیان و ئێواران دواى نوێژى مەغریب (١٠) جار بڵێت: ((لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك، وله الحمد، وهو على كل شيء قدير)).

هەركەسێك كە بەیانى لێ بویەوە بڵێت: ((لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير)) (١٠)جار خواى گەورە بە هۆیەوە (١٠)چاكەى بۆ دەنوسێت و (١٠)خراپەى لەسەر لادەبات و (١٠)پلە بەرزى دەكاتەوەو پاداشتى ئازاد كردنى چوار بەندەى بۆ هەیەو بۆى دەبنە پارێزەر هەتا ئێوارە دەكاتەوە، وە هەر كەسێك دواى نوێژى مەغریب بیڵێت هەمان پاداشتى بۆ هەیە هەتا بەیانى لێ

٨- (( اللَّهُـمَّ إنـّي أسـأَلُكَ عِلمـاً نافِعاً.وَرِزقـاً طَيِّبـاً.وَعَمَلاً مُتَقَـبِّلاً ))

**له دوای سلاو دانه‌وه له نوێژی به‌یانی.**(٢٤٧)

**واته: خوایه داوای زانستێکی به که‌ڵکت لێ ده‌که‌م(که کرده‌وه‌ی له‌گه‌ڵ دا بێت) له‌گه‌ڵ ڕۆزییه‌کی پاك و حه‌ڵاڵ و کرده‌وه‌یه‌کی وه‌رگیراو.**

---

ده‌بێته‌وه./ رواه أحمد والنسائي وابن حبان في صحيحه وهذا لفظه عن أبي أيوب رضي الله عنه، وفي رواية له: (وكن له عدل عشر رقاب) قال الألباني: (حسن صحيح) أنظر صحيح الترغيب والترهيب (١١٣/١) برقم(٤٧٤).

٨- تایبه‌ت به دوای نوێژی به‌یانی به(١٠٠) جاریش به‌م له‌فزه هاتووه:

(( هه‌رکه‌سێك دوای نوێژی به‌یانی (سه‌د)جار هه‌ر به‌و شێوه‌یه‌ی قاچی داناوه دانیشێت و بڵێت: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيت، بِيَدِهِ الْخَيْرُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) ئه‌و ڕۆژه چاکترین کرده‌وه‌ی خه‌ڵکی سه‌ر زه‌وی ئه‌نجامداوه مه‌گه‌ر که‌سێك وه‌ك ئه‌می وتبێت یان (زیکری) زیاتری له‌م وتبێت))./ أخرجه الطبراني وابن السني عن أبي أمامة مرفوعا وحسنه الألباني في السلسلة الصحيحة برقم(٢٦٦٤). وفي صحيح الترغيب والترهيب (١١٤/١) برقم(٤٧٦).

شێخ ئه‌لبانی(ڕه‌حمه‌تی خوای لێ بێت) فه‌رمویه‌تی: (له‌م فه‌رموده‌یه‌دا شایه‌تیه‌کی به‌هێزی تیایه بۆ فه‌رموده‌که‌ی (شهر بن حوشب) که ڕسته‌ی (وهو ثان رجليه) تیایه، وه من کارم پێی نه‌ده‌کرد له‌به‌ر لاوازی (شهر) هه‌تا گه‌یشتم به‌م به‌ڵگه شایه‌ته. وه تیایدا هاتووه(ته‌هلیل)ه‌که سه‌د جار له جیاتی (ده جار) وه هه‌ردوکیان دروسته چونکه به ثابتی هاتوون، جا سوپاس بۆ خوا له‌سه‌ر ته‌وفیقی و داوای فه‌زڵی زیاتری لێ ده‌که‌م). سلسلة الأحاديث الصحيحة ٣٥٤/٦ برقم(٢٦٦٤).

(٢٤٧) اخرجه ابن السني في عمل اليوم والليلة برقم(٥٤) وابن ماجه برقم(٩٢٥) و غيره و انظر صحيح ابن ماجه ١٥٢/١ و مجمع الزوائد ١١١/١٠. وحسن اسناده عبدالقادر وشعيب الأرناؤوط في تحقيق (زاد المعاد)٣٧٥/٢.

٩-(( اللَّهُمَّ إنّي أَعوذُ بِكَ مِنَ الكُفرِ، وَالفَقرِ، وَعَذابِ القَبرِ)).(٢٤٨)

**واتە: خوایە پەنات پێ ئەگرم لە بێ باوەڕی و هەژاری و سزای گۆڕ.**

١٠- ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ)).(٢٤٩)

**واتە: خوایە پەنات پێ ئەگرم لە ترسنۆکی، وە پەنات پێ ئەگرم لەوەی کە بکەومە ناو تەمەنی پەککەوتەیی و کەفتەکاری، وە پەنات پێ ئەگرم لە ئاشوبی دونیاو پەنات پێ ئەگرم لە سزای گۆڕ.**

١١- ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ، وَتَرْكَ الْمُنْكَرَاتِ، وَحُبَّ الْمَسَاكِينِ، وَإِذَا أَرَدْتَ بِعِبَادِكَ فِتْنَةً، فَاقْبِضْنِي إِلَيْكَ غَيْرَ مَفْتُونٍ)).(٢٥٠)

---

(٢٤٨) رواه النسائي برقم(١٣٤٧) و(٥٤٦٥) وقال الألباني: صحيح الإسناد. أنظر صحيح وضعيف سنن النسائي١١/٤٦٥ برقم(١٣٤٧) و(٥٤٦٥).

(٢٤٩) صحيح البخاري برقم(٢٦٦٧). عَمْرَو بْنَ مَيْمُونٍ الْأَوْدِيَّ فەرمویەتی: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص منداڵەکانی فێری ئەم ووشانە دەکرد هەر وەك چۆن مامۆستا قوتابیەکانی فێری نوسین دەکات و دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە دوای نوێژ پەنای دەگرت بەم ووشانە.....

(٢٥٠) رواه الترمذي برقم(٣٢٣٣) وصححه الألباني، أنظر صحيح الظلال(٣٨٨)، والتعليق الرغيب (١/٩٨-١٢٦) و في رواية: ( اللهم إني أسألك فِعلَ الخَيرات، وتَركَ المُنكَرات، وَحُبَّ المَساكين، وَأن تَغفِرَ لي، وَتَرحَمَني، وَتَتوبَ عَلَيَّ، وَإذا أَردتَّ بِعِبادِكَ فِتنَةً فاقبِضني إلَيكَ غَير مَفتون). وصححه الألباني في صحيح الجامع برقم(٥٩).

واتە: خوایە من داوای ئەنجامدانی کاری چاکەو واز هێنان لە خراپەو خۆشویستنی هەژارانت لێ دەکەم، (وە داوات لێ دەکەم لێم خۆشــبیت و ڕەحمــم پــێ بکــەیت و تەوبــەو پەشــیمانیم لێ وەربگریت)، وە ئەگەر ویستت بەندەکانت تاقی بکەیتەوە ئەوا ڕۆحمــم بکێشــەو بمگەڕێنــەوە بــۆ لای خــۆت و توشــی ئــەو تاقیکردنەوەیەم مەکە.

١٢- (( رَبِّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ – أَوْ تَجْمَعُ – عِبَادَكَ)).(٢٥١)

واتــە: پــەروەردگارم بمپــارێزە لــە ســزاکەت لــەو ڕۆژەدا کــە بەندەکانتی تێدا زیندوو دەکەیتەوە یان کۆدەکەیتەوە.

١٣- ((سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ)).(٢٥٢)

واتە: پاك و بێ نوقسانی و ستایش بۆ تۆیە ئەی خوای گەورەو پەرستراوی بە هەقم، داوای لێخۆشبونت لێ دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لات.

---

(٢٥١) لە بەرائەوە فەرمویەتی: ئەگەر ئێمە لە پشتی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) نوێژمان بکردایە پێمان خۆش بوو لە لای ڕاستییەوە بین و ڕومان تێ بکات، دەفەرموێت: گوێم لێ بوو دەیفەرموو:....فەرمودەکە.. صحيح مسلم برقم(٧٠٩) وأنظر صحيح الترغيب والترهيب برقم(٥٠٠).

(٢٥٢) پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر لە مەجلیسێك دانیشتبێت یان نوێژی کردبێت دەمبیست کۆمەڵە ووشەیەکی دەفەرموو، پرسیارم لێ کرد فەرمووی: ئەگەر ووتەی باشت وتبێت دەبێتە مۆرێك بەسەرییەوە هەتا ڕۆژی دوایی‌و ئەگەر خراپەشت ووتبێت دەبێتە کەفارەت بۆی کە ئەمەیە:..../ رواه النسائي برقم(١٣٤٤) وصححه الألباني أنظر التعليق الرغيب٢/٢٣٦ وفي رواية: ((سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ)) انظر مشكاة المصابيح(٢/٥١) برقم(٢٤٥٠) (٣٥).

# دوای نوێژی چێشت هەنگاو ( الضحى )

عَن عائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قالَت: صَلّى رَسولُ اللهِ(ﷺ) الضُّحَى، ثُمَّ قال: (( اللَّهُمَّ اغفِرْ لي، وَتُبْ عَلَيَّ، إنَّكَ أَنْتَ التَّوّابُ الرَّحِيم)) حَتّى قالَها مائةَ مَرَّة)).(٢٥٣)

**واته: پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی چێشتهەنگاوی کردو پاشان فەرمووی: خوایە لێمخۆشبەو تەوبەم لێ وەرگرە، بە ڕاستی هەر تۆ تەوبە وەرگرو بە ڕەحمیت. هەتا سەد جار دووبارەی کردەوە.**

# ئەگەر لە نوێژدا بوویت و بانگیان کردیت

**پیاو دەبێت بڵێت: (سُبحانَ اللّٰه) وە ئافرەت چەپڵە لێ بدات. (واته: بە بەری دەستی ڕاستی بکێشێ بەپشتی دەستی چەپیدا تا بزانن کە نوێژ دەکات).(٢٥٤)**

---

(٢٥٣) أخرجه البخاري في الأدب المفرد، قال الألباني: صحيح الأسناد، أنظر صحيح الأدب المفرد (٢٤١/١) برقم(٦١٩/٤٨٣).

(٢٥٤) البخاري ١٣٩/٢-١٤٠و ٦١/٣ و٧٠، ٨٦ ومسلم(٤٢١).

<u>تێبینی</u>: ئەگەر لە نوێژدا بوویت و سڵاویان کرد ئەتوانی بە ئیشارەتی دەستی ڕاستت وەڵام بدەیتەوە بەجۆرێ پشتی دەستت کەمێك بەرەو سەرەوە بەرز بکەیتەوە/ ابن عمر(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەفەرموێت:......بە بیلالم ووت پێغەمبەری خوات(ﷺ) بینی چۆن وەڵامی دانەوە کاتێك سەلامیان لێ دەکردو ئەو لە نوێژدا بوو؟ فەرمووی: ئاوا..جا جەعفەر بن عون لەپی دەستی ڕاخست و بەری دەستی کردە

# ئەگەر وەسوەسەت بۆ دروست بوو
# لە نوێژەکەت یان قورئان خوێندنەکەتدا

**لە عوثمانی کوڕی عاصەوە(خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا شەیطان دێتە نێوان من و نوێژەکەم و قورئان خوێندنەکەم و لێم تێك دەدات. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((ئەوە شەیطانێکە پێی دەوترێ. خەنزەب یان(خینزەب)، هەر کاتێك هەستت پێکرد پەنا بگرە بە خوا لێی(**أعوذُ باللّهِ منَ الشَّيطانِ الرَّجيم**)، وە سێ تف بکە بە لای چەپت دا )).**[255]

---

خوارەوەو پشتی دەستیشی ڕووەو سەرەوە دانا./ أخرجه أبو داود برقم(٨٦٠) وصححه الألباني أنظر السلسلة الصحيحة١/٣٥٩ برقم(١٨٥).

وەلە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(ڕەزای خوایان لێ بێت): پیاوێك سلاوی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد کە لە نوێژدا بوو ئەویش بە ئیشارەت وەلامی دایەوە، کاتێ سلاوی دایەوە پێی فەرموو: ئێمە سەرەتا وەلامی سەلامامان دەدایەوە لە نوێژەکانماندا، دوایی نەهیمان لێ کرا لەم کارە./ أخرجه الطحاوي والبزار والطبراني وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة ٦/٩٩٧ برقم(٢٩١٧).

شێخی ئەلبانی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: لەم فەرمودەیەدا بەڵگەیەکی ڕاشکاوو صەریحی تیایە لەسەر ئەوەی کە وەلام دانەوەی سلاو بە ووتە لە لایەن نوێژخوێنەوە لە سەرەتای ئیسلام و لە مەککەدا دروست بووە. پاشان لە مەدینە نەسخ بویەوەو بوو بە وەلامدانەوەی بە ئیشارەت. جا مادام وابێت ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە سلاو کردن لە کەسێك نوێژ بکات موستەحەبە، لەبەر ئیقرار کردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ ئیبن مەسعود کاتێ سلاوی لێ کردو هەروەك ئیقراری ئەم کارەشی کردووە لە غەیری ئەو لەوانەی سلاویان لێ کردووەو ئەو لە نوێژدا بووە، وە ئەمەش کۆمەڵێك فەرمودەی زۆرو مەعروفیشی لەسەرە./ السلسلة الصحيحة(٢٩١٧).

(٢٥٥) وە تیایدا هاتووە کە دەفەرموێ: ئەمەم کرد خوای گەورە لێی دوور خستمەوە/مسلم ٤/١٧٢٩برقم(٢٢٠٣).

# پاڕانەوەی قنوتی نوێژی ویتر

١-(( اللَّهُمَّ اهدِني فِيمَنْ هَدَيتَ. وَعافِني فِيمَنْ عافَيتَ. وَتَوَلَّني فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ. وَبارِكْ لي فِيما أعْطَيتَ. وَقِني شَرَّ ماقَضَيتَ. فإنّكَ تَقْضي وَلا يُقْضَى عَليكَ. إنّه لا يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ. {ولا يَعِزُّ مَنْ عادَيتَ}. تبارَكْتَ رَبَّنا وَتَعالَيتَ )).(٢٥٦)

**واتــە: خوایــە ڕێنمــویم بکــە لەگــەڵ ئەوانــەدا کــە ڕێنمونیــت کردوون(واتە: دامەزراوم بکەو هۆکارەکانیم بۆ ئاسان بکە). وە پـارێزراوو لـەش سـاغم بکـە لەگـەڵ پارێزراوانـدا. وەپشـتم بگـرە لەگەڵ پشتگیری لـێکراواندا(مەمدەرە دەسـت نەفسـی خـۆم). وە لـەوەی پێــت بەخشــیوم بەرەکــەت و خێــری زۆری تــێ بکــەو**

---

(٢٥٦) أخرجه أصحاب السنن الاربعة وأحمد١/٢٠٠ والدارمي١/٣٧٣ والحاكم٣/١٧٢ والبيهقي٢/٢٠٩ و انظر أبوداود رقم(١٤٢٥) والترمذي برقم(٤٦٤) وصحّحهُ الألباني في الإرواء(٤٢٩). ومابين المعكوفين للبيهقي وانظر صحيح الترمذي ١/١٤٤ وصحيح ابن ماجه ١/١٩٤ وارواء الغليل للألباني ٢/١٧٢.

تێبینی(١): شوێنی ئەم دوعایە پێش چەمینەوە(ركوع)ە بە پێچەوانەی قنوتی کاتی سەغڵەتی(النازلة)ە وە کە لە دوای چەمینەوەدا دەکرێ. وە لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) نەهاتووە کە دەستی بەرز کردبێتەوە لە قنوتی ویتردا.بەڵام لە هاوەڵەکانەوە(ڕەزای خوایان لێ بێت) هاتووەو هەردوو شێوازەکە دروستە. وە صلاوات دانیش لە دوایەوە لە سەلەفەوە وارد بووە.

تێبینی(٢): هیچی تێدا نییە ئەگەر قنوتەکە بخاتە دوای چەمینەوەو زیاد لەودوعایەش لەعنەت لە کافران بکات و صلاوات بدات لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) وە بپاڕێتەوە بۆ موسڵمانان لە نیوەی دووەمی مانگی ڕەمەزاندا/ انظر قيام رمضان للألباني ص٢٣. رواه ابن خزيمة في صحيحه ٢/١٥٥. قال الأرناؤوط رجالهُ ثقات.

لەخراپەی ئەوەی تەقدیرت کردووە بۆم بمپارێزە. بەڕاستی تۆ بڕیار دەدەیت و کەس بڕیار نادات بەسەر بڕیاری تۆدا. وە ئەوەی تۆپشتی بگریت هەرگیز زەبوون نابێ و ئەوەی تۆ دوژمنایەتی بکەی هەرگیز بەعیزەت نابێ. خێری تۆ زۆرە لە هەردوو دونیاداو گەورەیت بەرزەو دەستەڵاتت دیارە پەروەردگارمان.

٢- (( اللَّهُمَّ إنّي أعوذ بِرِضاكَ مِنْ سَخَطِكَ. وَبِمُعافاتِكَ مِنْ عُقوبَتِكَ. وَأعوذُ بِكَ مِنْكَ. لاأُحصي ثناءً عَليكَ. أنْتَ كَما أثنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ)). (٢٥٧)

واتە: خوایە پەنا دەگرم بەڕەزای تۆ لەخەشم و تووڕە بوونت. وە پەنا ئەگرم بەلێبووردەیت لەسزادانت و پەنا ئەگرم پێت. ستایشم بۆت ژمارە ناکەم. تۆ بەو جۆرەی کەخۆت وەسف و ستایشی خۆتت کردووە.

٣- (( اللَّهُمَّ إيّاكَ نَعْبُدُ. وَلَكَ نُصَلّي وَنَسْجُدُ. وَإلَيكَ نَسْعَى وَنَحفِدُ. نَرجو رَحْمَتَكَ. ونَخْشَى عَذابَكَ. إنَّ عَذابَكَ بالكافرينَ مُلحَقُ. اللَّهُمَّ إنّا نَستَعينُكَ، وَنَستَغفِرُكَ. وَنُثْنِي عَلَيْكَ الخَيْرَ. وَلا نَكفُرُكَ. وَنؤمِنُ بَكَ. وَنَخضَعُ لَكَ. وَنَخلَعُ مَنْ يَكفُرُكَ )). (٢٥٨)

---

(٢٥٧) أخرجه أصحاب السنن الاربعة وأحمد١/٩٦و١١٨و١٥٠. انظر صحيح الترمذي٣/١٨٠. وصحيح ابن ماجه ١/١٩٤ والارواء ٢/١٧٥.

(٢٥٨) أخرجه البيهقي في السنن الكبرى وصحَّح اسناده ٢/٢١١ وقال الشيخ الالباني(رحمه الله) في ارواء الغليل: وهذا اسناده صحيح ٢/١٧٠. وهو موقوف على عمر(رضي الله عنه). بەڵام ئەم دوعایە تایبەتە بە(١٥) ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزان.

واته: خوایە تەنها تۆ دەپەرستین و بۆ تۆ نوێژدەکەین و کوڕنوش دەبەین. وە بۆلای تۆ هەڵپە دەکەین و خێرایی دەکەین و ئومێدی بەزەیی تۆ دەکەین و لەسزاکەت دەترسین. بەڕاستی سزاکەت بێ باوەڕان دەگرێتەوە. خوایە پشت بەتۆ دەبەستین و داوای لێ خۆشبوونت لێ دەکەین و ستایشی چاکی تۆ دەکەین و بێباوەڕ نابین پێت و باوەڕت پێ دێنین و مل کەچین بۆت و دووره پەرێز دەوەستین لەو کەسەی کە بێباوەڕە پێت و خۆمانی لێ دادەماڵین و وازی لێ دێنین.

## ویردی دوای سڵاودانەوەی نوێژی ویتر

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنوێژی ویتردا سورەتی ﴿ سَبِّحِ اسمَ رَبِّكَ الأعلَى ﴾ و ﴿ قُلْ يا أيُّها الكافِرونَ ﴾ و ﴿ قلْ هُوَ اللّهُ أحَد ﴾ ی دەخوێندو کەسڵاوی دەدایەوە دەیفەرموو: « سُبْحانَ المَلِكِ القُدُّوس» سێجار، وە لەسێهەم جاردا دەنگی هەڵدەبڕێ و دەنگی درێژدەکردەوە پێی و دەیفەرموو: « رَبِّ المَلآئِكَةِ وَ الرُّوحِ » (٢٥٩)

واته: پاکی و گەورەیی بۆ خوای پادشای پاك و پیرۆز لە هەموو ناتەواوییەك. پەروەردگاری مەلائیکەتەکان و رۆح.

---

(٢٥٩) رواه النسائي٣/٢٤٤ والدارقطني وغيرهما. وما بين المعكوفين زيادة للدارقطني٣/٣١ وإسناده صحيح. انظر زاد المعاد بتحقيق شعيب الأرناؤوط وعبدالقادر الأرناؤوط ١/٣٣٧.

# نوێژە سوننەتەکان

١- پێش نیوەڕۆ چوار ڕکات و لە پاشییەوە چوار[٢٦٠] یان لە پێشییەوە دوو.[٢٦١]

٢- چوار ڕکات پێش نوێژی عەسر[٢٦٢] یان دوو ڕکات.[٢٦٣]

٣- دوو ڕکات پاش مەغریب و[٢٦٤] دوو ڕکات لە پێشییەوە.[٢٦٥]

٤- دوو ڕکات پاش عیشا[٢٦٦] وە دوو ڕکات لە پێشییەوە.[٢٦٧]

---

(٢٦٠) هەرکەس پارێزگاریان بکات لەسەر ئاگری دۆزەخ حەرام دەکرێت لەوەی کە تێی بچێت/ أبوداود ٢/٥٥ و الترمذي ٢/٢٩٢. وقال: حديث حَسَنٌ غريب. والنَسائي٣/٢٦٥ وابن ماجه ١/٣٦٧ وهو حديث صحيح.

(٢٦١) البخاري(رقم ٦٠١ – البغا) ومسلم ١/٥٧٣.

(٢٦٢) ڕەحمەتیخوا لەو کەسە بێت لە پێش نوێژی عەسردا چوار ڕکات دەکات/ أبوداود ٢/٥٣ و الترمذي ٢/٢٩٥ و قال: غريب حَسَن. وهو حديث حَسَن. انظرصحيح الترمذي(٣٥٤).

(٢٦٣) البخاري (رقم ٦٠١– البغا) ومسلم ١/٥٧٣ .

تێبینی/ بە لای هەندێك لە زانایانەوە دوای نوێژی عەسر دوو ڕکات سوننەت هەیەو چەند فەرمودەیەکی صەحیحیشی لەسەرە./ انظر مسلم برقم(٨٣٥). وأنظر السلسلة الصحيحة٦/١٠١٠ برقم(٢٩٢٠). و مشكاة المصابيح (١/ ٢٦١).

(٢٦٤) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەم دوو ڕکاتە لە ماڵەوەتان بیکەن/ ابن ماجه١/٣٦٨وهو حديث حَسَن.

(٢٦٥) البخاري رقم(٥٩٩– البغا) ومسلم ١/٥٧٣.

(٢٦٦) مسلم ١/٥٠٤.

(٢٦٧) البخاري(رقم ٦٠١– البغا) ومسلم ١/٥٧٣.

٥- دوو ڕكـات پـێش بـەیانی.[٢٦٨] سـوننەتە لـە یەكـەم ڕكاتـدا سورەتی ﴿الكافِرونَ﴾و لە دووەمدا ﴿ الإخلاص ﴾ بخوێندرێت.[٢٦٩]

٦- نوێـژی چێشـت هـەنگاو(الضُّحی):( ٢ - ٤ - ٦ - ٨) ڕكاتـە. باش وایە كە بە دوو دوو بیكەیت و كاتەكەی لە خۆربەرز بوونەوە بە ئەندازەی ڕمێك و(چاكتر وایە كە ڕۆژ گەرم دەبێت بكرێـت) تا كاتی لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان.[٢٧٠]

٧- شــەو نوێــژ: لایەنــە زۆرەكــەی(١٣) ڕكاتــە بــە دوو ڕكــاتی سوننەتی فەجرەوە. بە ڕكاتێكی تاك كۆتایی پێ دێت.[٢٧١]

٨- نوێژی ویتر: (١-٣-٥) تا(١٣) ڕكاتە.[٢٧٢] وە دوو ڕكاتیش لە دواوەی.[٢٧٣]

---

(٢٦٨) پێغەمبەر(ﷺ) هیچ نوێژێكی سوننەتی بە ئەندازەی ئەمە پارێزگاری نەدەكردو بـەردەوام نـەدەبوو لەسـەری/ البخـاري ٤٥/٣ ومسـلم ٥٠١/١. وە پێغەمبـەر(ﷺ) دەفەرمووێ: ئەم دوو ڕكاتە چاكترە لە دنیاو چی تێدایە/ رواه مسلم. صحیح الترغیب والترهیب(٣٠٩/١).

(٢٦٩) مسلم ٥٠٢/١.

تێبینی: سوننەتە دوای ئەنجام دانی نوێژی سوننەتی پێش بەیانی لەسەر لای ڕاست ڕابكشێت وەك پێغەمبەر(ﷺ) كردوویەتی/ رواه البخاری(٣٥/٣).

(٢٧٠) البخاري ٢٢٦/٤ ومسلم ٤٩٩/١.

(٢٧١) مسلم ٥٠٩/١. بەڵام نوێژی تەراویح(١١) ڕكاتە/ أخرجه الشیخان و غیرهما وانظر صحیح أبي داود(١٢١٢).

(٢٧٢) أبوداود ١٣٢/٢ والنسائي ٢٣٨/٣ وابن ماجه وغیرهم وهو حدیث صحیح.

(٢٧٣) ابن خزیمة في(صحیحه) و الدارمي وغیرهما وهو مخرج في الصحیحة. ورواه مسلم من فعلهِ (ﷺ)،انظر قیام رمضان للألباني ص(٣٣) وانظر(كشف الستر عن ركعتین بعد الوتر) لابن القیم(رحمه الله).

٩-سلاوی مزگەوت (تَحِيةُ المَسجِد): دوو ڕکاتە کاتی چوونە مزگەوت پێش دانیشتن ئەنجام دەدرێت.(٢٧٤)

١٠- نوێژی داوای چاکە کردن(الإستِخارَة): دوو ڕکاتە.(٢٧٥)

١١- دوو ڕکات لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێك دا.(٢٧٦)

١٢- نوێژی دەست نوێژ: دوای دەست نوێژ شتن.دوو ڕکاتە.(٢٧٧)

١٣- سوننەتی دوای نوێژی جومعە: چوار ڕکات لە مزگەوت.(٢٧٨)یان دوو ڕکات لەماڵەوە.(٢٧٩)

---

(٢٧٤) البخاري ٥٣٧/١ ومسلم ٤٩٥/١ وغيرهما.

(٢٧٥) البخاري ١٦٢/٧.

(٢٧٦) البخاري (رقم ٦٠١ - البغا) ومسلم ٥٧٣/١.

(٢٧٧) هەر کەسێك دەست نوێژی چاك بشوات وپاشان دوو ڕکات نوێژ بکات و لەگەڵ خۆیدا مەشغوڵ نەبێت تیایدا خوای گەورە لە گوناهی لەوەو پێشی خۆش دەبێ / البخاري ٢٦٦/١ ومسلم ٢٠٤/١.

(٢٧٨) مسلم (٨٨١) وغيره عن أبي هريرة(رضي الله عنه).

(٢٧٩) مسلم(٨٨٢) عن ابن عمر .

<u>تێبینی</u>: نوێژی سوننەتە ڕەواتیبە موئەکەدەکان(١٢)ڕکاتن. پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (( هەر کەسێك بەردەوام بێت لەسەر دوانزە ڕکات نوێژی سوننەت لە ڕۆژدا خوای گەورە ماڵێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکات: چوار ڕکات پێش نیوەڕۆو دوو ڕکات لە دوایەوە و دوو ڕکات پاش مەغریب و دوو ڕکات دوای عیشاو دووڕکات پێش نوێژی بەیانی )). رواه الترمذي والنسائي وابن ماجه عن عائشة(رضي الله عنها) وقد صحّح الحديث الألباني في صحيح الجامع الصغير(٢٧٨/٥).

# نەخەوتنەوە دوای نوێژی بەیانی تا ئەنجامدانی نوێژی چێشتەنگاو

عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ): (( مَنْ صَلَّى الْغَدَاةَ (الْفَجْرَ) فِي جَمَاعَةٍ، ثُمَّ قَعَدَ يَذْكُرُ اللَّهَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، كَانَتْ لَهُ كَأَجْرِ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ )).(٢٨٠)

**واتە: هەرکەسێك نوێژی بەیانی بکات بە جەماعەت و پاشان دابنیشێت زیکری خوا بکات هەتا خۆر هەڵدێت و پاشان دوو ڕکات نوێژ بکات، ئەوا وەك پاداشتی حەج و عەمرەیەکی تەواو، تەواو، تەواو وایە بۆی.**

---

**(٢٨٠) أخرجه الترمذي برقم(٥٨٦) وصححه الألباني في صحيح الجامع برقم(٦٣٤٦)و الصحيحة برقم(٣٤٠٣).**

# هەندێ نوێژی تر

## نوێژی تەوبە( ئەگەر گوناهێکی کرد )

(( ما مِنْ عَبْدٍ يُذنِبُ ذَنباً فَيُحسِنُ الطُّهُورَ. ثُمّ يَقوُم فَيُصَلّي رَكْعَتَينِ. ثُمَّ يَستَغْفِرُ اللّهَ إلاّ غَفَرَ اللّهُ لَهُ )).(٢٨١)

**واتە:هیچ بەندەیەك نییە(نێر یان مێ) کە هەر گوناهێك دەکات چاك خۆی بشوات یان دەست نوێژ هەڵگرێ، پاشان هەڵسێ و دوو ڕکات نوێژ بکات. پاشان داوای لێخۆش بوون لەخوا بکات. ئیلا خوای گەورە لێی خۆش دەبێ.**

## نوێژی دوو جەژنەکە ( ڕەمەزان و قوربان )

**ئەم دوونوێژە واجبە(٢٨٢) ، وە دوو ڕکاتە بەبێ بانگو قامەتو بەبێ(الصّلاة جامِعَة) دەکرێت. لە ڕکاتی یەکەمدا پێش خوێندنی سورەتی (الفاتِحَة) حەوت تەکبیرات دەکرێ. وە لە ڕکاتی دووەم دا پێنج تەکبیرات دەکرێ. وە زیکرێکی دیاریکراو نەهاتووە کە**

---

(٢٨١) أبوداود ٨٦/٢ برقم(١٥٢١) والترمذي ٢٥٧/٢ برقم(٤٠٦و٣٠٠٦) وصححه الألباني في صحيح أبي داود ٢٨٣/١. وانظر صحيح الجامع ١٧٣/٥.

(٢٨٢) ئەمە ووتەی ابن تەيميه و أبی حنيفةو غەيری ئەمانو وتەيەكی شافعیو يەكێكە لە دوو ووتە لەمەزهەبی ئيمامی ئەحمەددا/ بڕوانە مجموع الفتاوي١٦١/٢٣.

لەنێوان تەكبیرەكاندا بووترێ.[283]

وە لەدوای نوێژو وتارێك دەخوێندرێتەوە. وە سوننەتە خۆ گۆڕین و جلی نوێ لەبەركردن و خۆبۆن خۆش كردن و دووركەوتنەوە بۆ نوێژگە (الُمصَّـلَی) بۆ ئەنجام دانـی نوێژەكە مەگەر سەرمای زۆر نـەیهێڵێ وە گـۆڕینی رێگـای چـوونو گەڕانـەوە. وە لـە جـەژنی رەمەزانیشـدا سـوننەتە پـێش دەرچـوون بـۆ نوێـژ چـەند دەنكـە خورمایەك(یان شتێك) بخورێت.[284]وە دروستە(دەف) لێ بدرێت و سروود بوترێ لەلایەن كچۆڵەی باڵغ نەبوو بۆ دەرخستنی شادی و خۆشی تیایدا.[285]

---

(٢٨٣) بەڵام چەسپاوە لە ابن مەسعودەوە (رەزای خوای لێ بێت) كە سەبارەت بە نوێژی جەژن فەرموویەتی: (يحمد الله ويثني عليه ويصلي على النبي صـلى الله عليـه وسـلم) رواه الأثرم وحرب واحتج به أحمد. ص ١٥١. وأخرجه الطبراني في المعجم الكبير٢/٣٧/٣. وە فەرموویەتی: ( بينَ كُلِّ تَكبِيرَتَينِ حَمْدُ اللهِ عَزَّ وَجَلّ وَثَناءٌ عَلَى اللهِ ) رَواه البيهقي ٢٩١/٣ بسند جَيِّد. أنظر إرواء الغليل (٣/ ١١٤-١١٥).

واتە: لەنێوان دوو تەكبیرەدا سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەكرێ و صەلاوات دەدرێ لە پێغەمبەری خوا(ﷺ).

(٢٨٤) بڕوانە احكام العيدين/ علي حسن علي عبدالحميد الحلبي الاثري.

(٢٨٥) البخاري (٩٤٩) و(٩٥٢) و(٩٨٧) و( ٣٥٣٠)و(٣٩٣١) ورواه مسلم(٨٩٢) وغيرهما عن عائشة(رضي الله عنها).

## نوێژی خۆرو مانگ گیران( الخُسوف وَ الكُسوف )

ئەم نوێژە بە وتنی: (الصّلاة جامِعة) خەڵكی بۆ كۆدەكرێتەوەو بانگ و قامـەتی نییـە، وە سـوننەت وایـە ئیمـام دەنـگ بـەرز بكاتـەوە تیایداو راست ترین وەسفی دوو ڕكاتەو لەهەموو ڕكاتێك دا دوو چەمینەوە (الركوع)ی تێدایە. وە لەنێوان چەمینەوەكاندا سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ دەخوێندرێتــەوە، دوای نوێژەكــە ئیمــام ووتارێــك دەدات. سوننەتە لەوكاتەدا خێرو چاكە زۆر بكرێ وەك پاڕانەوەو تــەكبیرات و خێركــردن‌و داوای لــێ‌خۆشبوون كــردن لــەخوای گەورە.[٢٨٦] بەڵام تەپڵ‌و تەنەكەو دەف لێدان لەوكاتەدا داهێنراوو (بدعة)یەو لە خووڕەوشتی ناموسڵمانانە.

## نوێژە بـارانە( صلاةُ الإستِسقاء )

سوننەتە لەكاتی باران نەبارین دا بكرێت‌و ئەم نوێژە لە دەرەوەی شار ئەنجام دەدرێت و دووڕكاتـەو لەدواییـدا(یان لـە پێشـەوەی) ئیمام ووتارێك دەخوێنێتەوە. كەتیایدا باسی یادی خواو هەڵنان دەكات بۆ گوێ ڕایەڵی كردنی خوای گەورەو سەرزەنشت كردنی یاخی بوون باس دەكات. وە ئیمام‌و ئەوانەی كە لە گەڵیدان زۆر داوای لــێ خۆشـبوون لـەخوای گـەورە دەكـەن‌و دەپاڕێنـەوە بـۆ

---

(٢٨٦) بڕوانە (الأدلة الرضية) للشوكاني لاپەڕە ٩١- ٩٣.

**لاچوونی ئەم نەبارینی بارانە، لەو دوعایانەش کە دەیکەن بڕوانە لاپـــەڕە (٢١٧) لـــەم نامیلکەیـــەدا. وە ئیمـــام پۆشـــاکەکەی هەڵدەگێڕێتەوەو بە هەڵگەڕاوەیی لەبەری دەکات.[٢٨٧]**

---

(٢٨٧) بڕوانە (الأدلة الرضية) لاپەڕە(٩٤-٩٥).

تێبینی(١): لە فەرمودەدا هاتووە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوعای نوێژە بارانەی لەخوای گەورە کرد پشتی دەستەکانی بەرزکردووە بەرەو ئاسمان/ رواه مسلم(٨٩٦) عن أنس(رضي الله عنه).

ئیبن تەیمیە(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمویێت: وە فەرمودەکەی ئەنەس بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەبەر زۆر بەرز کردنەوەی دەستەکانی چەماونەتەوەو پشتی دەستی ڕوو بە ئاسمان بووە ئەویش لەبەر زۆر دەست بەرزکردنەوەی بووە نەك بە مەبەست، هەروەك لە فەرمودەدا هاتووە: دەستەکانی ڕوو بە دەموچاوی بەرز کردۆتەوە../ المستدرك على فتاوى ابن تيمية. جمع: ابن قاسم (ص: ١١٤).

تێبینی(٢): شافیعی وحەنابیلەکان دەفەرمون: وەك تەکبیراتی جەژن تەکبیر دەکرێت بۆی، حەوت لەیەکەم رکات و پێنج لە دووەمدا، کە ئەمەش ووتەی سەعیدی کوڕی المسيّب وعمری کوڕی عبدالعزيز ومكحول ومحمّدی کوڕی جرير الطّبريّ ، و لە ابن عبّاسیشەوە گێڕدراوەتەوە. بەڵام ئەو فەرمودانەی دەیهێننەوە بە بەڵگە یان لاوازە یان باسی ئەوەی تیایە کە نوێژەکە وەك نوێژی جەژنە، کە زانایان دەفەرمون: مەبەست پێی لەوەدایە کە دوو ڕکاتەو دەنگ هەڵدەبڕێت تیایداو لە دەرەوەی مزگەوت دەکرێت وەك نوێژی جەژن/ أنظر الموسوعة الفقهية الكويتية (٣١٢/٣) و سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة وأثرها السيئ في الأمة (٣٠١/١٢) برقم(٥٦٣١).

(کەواتە زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە نوێژی (صلاة الاستسقاء) وەك نوێژەکانی تر یەك تەکبیری بۆ دەکرێت بۆ استفتاح، چونکە لەو فەرمودانەی باسی نوێژەبارانە هاتووە تەنها دوو ڕکات باسکراوە بە بێ باسی تەکبیر، لەوانە مالك والثّوريّ والأوزاعيّ وإسحاق وأحمد في المشهور عنه، وأبو ثور وأبو يوسف ومحمّد وغەیری ئەمانیش لە هاوەڵانی أبي حەنیفە). أنظر موسوعة فقه العبادات (٢/١٨٠).

# نوێژی نیازو داوای چاکه کردن لەخوای گەورە

## ( صَلاةُ الإِستخارَة )

**جابری کوڕی عبدالله (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای چاکه کردن (الإستِخارَة)ی فێردەکردین کە لە هەموو کارێکی (دونیایی)دا ئەنجامی بدەین، هەروەکو چۆن سورەتێکی قورئانی فێر دەکردین و دەیفەرموو: ئەگەر کەسێك لە ئێوە ویستی کارێك بکات. با دوو ڕکات نوێژ بکات جگە لەفەرزەکان، پاشان با بپاڕێتەوەو بڵێ:**

(( اللَّهُمَّ إنّي أستخيرُكَ بِعِلْمِكَ.وَأستَقدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ. وَأسأَلُكَ مِنْ فَضلِكَ العَظيم. فإنّكَ تَقْدِرُ وَلا أقدِرُ وَتَعلَمُ وَلا أعْلَمُ. وَأنْتَ عَلاّمُ الغُيوبِ. اللَّهُمَّ إنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أنّ هذا الأمْرَ – **ناوی پێویستییەکەی دەهێنێ** – خَيرٌ لي فِي دِيني وَمَعاشِي وعاقِبَةِ أمرِي. **یان فەرمووی** – عاجِلِه وَآجِلِهِ – فاقدُرهُ لِي وَيَسِّرهُ لِي ثُمَّ بارِكْ لي فيهِ. وَإنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أنَّ هذا الأمرَ شَرٌّ لِي فِي دِيني وَمَعاشِي وَعاقِبةِ أمرِي، **یان فەرمووی** – عاجِلِهِ وَآجِلِهِ – فاصرِفْهُ عَنّي وَاصرِفْني عَنْهُ،وَاقدُرْ لِيَ الخيرَ حَيثُ كانَ ثُمَّ أرضِني بهِ )).(٢٨٨)

---

**(٢٨٨) البخاري٧/١٦٢برقم(١١٦٢).**

واتـه: خوایـه مـن بـه زانسـتی خـۆت داوای خێـر و چاكەت لـێ دەكـەم‌و داوای توانـات لێ دەكـەم بـەتوانای خـۆت. وە لـە فـەزڵی گەورەت داوات لـێ دەكەم. بەڕاستی تۆ دەتوانی‌و من ناتوانم‌و تۆ زانای‌و من نازانم‌و تۆ زانای نهێنی و غەیبـەكانی. خوایـە ئەگـەر ئـەم مەسـەلەیە چاكەو خێـری تیایـە بـۆ دیـن‌و ژیـان‌و كۆتـایی تەمـەنم، یـان ئێسـتاو كۆتـایم، ئـەوا خوایـە بەنسـیبم بكـەیت‌و ئاسانی بكەیت لەسەرم و بەرەكەتی تێ بخە بۆم . وە ئەگـەر ئـەم كـارە خراپـە بـۆ دیـن‌و بـژێوی‌و كۆتـایی تەمـەنم. یـان ئێسـتاو كۆتایم. ئەوا خوایە لێم دوور بخەرەوەو منیش لەو دووربخەرەوەو خـەیرو چاكەم بەنسیب بكـە لـە هەرشـوێنێكەو پاشـان دەروونم ڕازی بكە پێی.

ئیبن تەیمیە(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: پەشیمان نابێتەوە ئەوكەسەی داوای چاكەو خێر(استِخارَة) لە خوای گەورە بكات‌و ڕاوێژ بە بڕواداران بكات‌و لەكارەكەی بچەسپێ. خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ ...وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ ..... ﴾.(آل عمران: ١٥٩)

واتە: لە كارو پێشهاتدا پرس و ڕایان پێ بكە، (دوای مەشورەت و پرس و ڕا) ئەگەر بڕیارتدا (كارێك ئەنجام بدەیت، ئەنجامی بدەو) پشت بەخوا ببەستە...[٢٨٩]

---

(٢٨٩) بروانە (الوابل الصيب) ابن القيم ص١٥٧.

# نوێژی( صلاة التَّسبيح )

ئەم نوێژە چوار ڕکاتە و شێوەکەی کەمێك جیاوازی ناوەکی هەیە لەگەڵ نوێژەکانی تردا، ئەویش بەم شێوەیە ئەنجام دەدرێت:-

دوای تەکبیری نوێژ دابەستن سورەتی﴿ الفاتحة ﴾و سورەتێکی تر دەخوێنیت و پاشان هەر بە پێوە(١٥) جار دەڵێی(سُبحانَ اللهِ وَالحَمدُ للهِ وَلا إلـه إلاّ الله وَاللهُ أكبَـر) پاشـان دەچـەمیتەوەو(١٠) جاریش لە چەمینەوەدا دەیڵێیت. ئینجا ڕاست دەبیتەوە لە چەمینەوەو(١٠) جار ئەم نزایە دەڵێیتەوە. پاشان کوڕنوش دەبەیت و(١٠) جار دەیڵێیتەوە، پاشان سەربەرز دەکەیتەوە لە کوڕنوش و(١٠) جار دەیڵێیتەوە. پاشان کوڕنوشی دووەم دەبەیت و(١٠) جار دەیڵێیتەوە. پاشان سەرت لە کوڕنوش بەرز دەکەیتەوەو پێش هەستانەوە بۆ ڕکاتی دووەم(١٠) جار دەیڵێیتەوە، بە هەمان شێوە ڕکاتەکانی تریش هەر ئاوەها ئەنجام دەدرێت. واتە لە هەر ڕکاتێکدا(٧٥) جار ئەو زیکرە دووبارە دەکرێتەوە، ئەگەر توانیت ڕۆژی جارێك ئەنجامی بدە. ئەگەر نا هەفتەی جارێك. ئەگەر نەت توانی مانگی جارێك ئەگەر نا ساڵی جارێك. ئەگەر توانات نەبوولە تەمەنتدا جارێك ئەنجامی بدە.[٢٩٠]

---

(٢٩٠) أخرجه أبوداود وابن ماجه وابن خزيمة في صحيحه. هەرچەندە ئەم نوێژە زانایان جیاوازن لە بارەی صەحیحیو ضەعیفی فەرموودەکەیەوە. بەڵام بەچەسپاوی فەرموودەی لەسەرەو کاری پێدەکرێت. وەك زۆرێك زانایانی متمانە پێکراو ڕایان لەسەریەتی./ بڕوانە(صحيح جامع الصغير وزيادته)(ص٣١٠) وە(قيام رمضان).

تێبینی: ئەم نوێژە تایبەت نیە بەمانگی پیرۆزی ڕەمەزان و شەوی قەدرەوە. وە ئەصڵ وایە بە تەنها ئەنجام بدرێت نەك بە جەماعەت.

## کەفارەتی ناکۆکی و دەمەدەمێ

**پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت:** ((تَكْفِيرُ كُلِّ لِحَاءٍ رَكْعَتَانِ)).(٢٩١)

**واتــە: کــەفارەتی هــەموو نــاکۆکی و کێشــەو دەمەدەمەیــەك ئەنجامدانی دوو ڕکات نوێژە.**

## چی ئەڵێت ئەگەر کەسێك لەسەر دەستی ئەو خوای گەورە هیدایەتی دا

((الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِي أَنْقَذَهُ مِنْ النَّارِ)).(٢٩٢)

**واتە: هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ ئەو خوایەی کە ڕزگاری کرد لە ئاگری دۆزەخ.**

---

(٢٩١) رواه تمام الرازي و الطبراني(٧٦٥١) وابن عساكر وحسنه الألباني أنظر السلسلة الصحيحة برقم(١٧٨٩) وصحيح الجامع(٢٩٨٦).

(٢٩٢) ئەنــەس (ڕەزای خــوای لێ بێــت) دەفــەرموێت: گــەنجێکی جولەکــە خزمــەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)ی دەکرد، نەخۆش کەوت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەردانی کردو لای سەری دانیشت و فەرموی: موسڵمان ببە، ئەویش تەماشایەکی باوکی کرد کە لایدا بوو. باوکی پێی ووت: بەگوێی (أبا القاسم)(ﷺ) بکە. ئەویش موسڵمان بوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە دەرەوەو دەیفەرموو:....فەرموودەکە..... صحيح البخاري برقم(١٢٩٠).

## پیرۆزبایی کردن لەو کەسەی خوا تەوفیقی داوە بۆ تەوبە کردن

((أَبْشِرْ بِخَيْرِ يَوْمٍ مَرَّ عَلَيْكَ مُنْذُ وَلَدَتْكَ أُمُّكَ)).(٢٩٣)

**واتە: مژدەت لێ بێت بە چاكترین ڕۆژێك بەسەرتا تێپەڕیبێت لەو ڕۆژەوە لە دایك بوویت.**

## سوننەتەكانی ڕۆژی هەینی( الجُمُعَة )

**١- زووهاتن بۆ مزگەوت.(٢٩٤)**

**٢- خۆشتن( كە سوننەتێكی موئەكەدەیەو هەندێ لە زانایان پێیان وایە واجبە) وە خۆ بۆن خۆش كردن و سەرچەور كردن بە زەیت.(٢٩٥)**

**٣- پۆشینی پۆشاكی نوێ.(٢٩٦)**

**٤- نزیك بوونەوە لە ئیمام.(٢٩٧)**

---

(٢٩٣) صحيح البخاري برقم (٤١٥٦) وصحيح مسلم(٢٧٦٩). ئەمە ووتەی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) كە بە كەعبی كوڕی مالكی فەرموو(ڕەزای خوای لێ بێت) دوای ئەوەی ئایەتیان لەسەر دابەزیو خوای گەورە لێیان خۆش بوو.

(٢٩٤) البخاري ٣٦٦/٢ ومسلم ٥٨٢/٢.

(٢٩٥) البخارى ٣٧٠/٢.

(٢٩٦) رواه أحمد والشيخان عن أبي سعيد (رضي الله عنه) انظر فقه السنة. للسيد سابق٢٩٨/١. وە بڕوانە(السلسلة الصحيحة)(١٢٧٩).

(٢٩٧) أبوداود ٦٦٣/١ وأحمد في المسند ١١/٥ والحاكم في المستدرك ٢٨٩/١وصحَّحَهُ ووافقه الذهبي.

**٥- خوێندنی سورەتی(الكَهف).[٢٩٨]**

**٦- زۆر صەڵاوات دان لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە شەو[٢٩٩] و ڕۆژەکەیدا.[٣٠٠]**

---

(٢٩٨) هەرکەسێ ڕۆژی هەینی سورەتی(الكَهف) بخوێنێ نورێکی بۆ دادەگیرسێ بە ئەندازەی نێوان هەردوو جومعەکە/ مستدرك الحاكم ٣٦٨/٢ وقال: هذا حديث صحيح الاسناد ولم يخرجاه. وقال الذهبي: (نعيم – أي: ابن حماد – ذو مناكير) وقال الالباني (صحيح) (صغير الجامع الصغير) ٣٤٠/٥ (ح ٦٣٤٦).

(٢٩٩) أخرجه ابن عدى والبيهقي وحسّنه الألباني أنظر السلسلة الصحيحة برقم(١٤٠٧) وتمام المنة ص(٣٢٤).

(٣٠٠) رواه أبوداود (٩٦٢) وغيره وصححه الألباني أنظر صحيح الجامع(٢٢١٢) عن أوس بن أوس.

## بەشی شەشەم:

# هەندێ کاتی گرنگ و پێویستی نزاو پاڕانەوەی دڵتەنگی و خەفەت

١- (( اللَّهُمَّ إنّي عَبْدُكَ. ابنُ عَبْدِكَ. ابنُ أَمَتِكَ. ناصيَتي بِيَدِكَ. ماضٍ فيّ حُكْمُكَ. عَدلٌ فيّ قَضاءُكَ. أسأَلُكَ بِكُلِّ اسمٍ هُوَ لَكَ. سَمَّيْتَ بهِ نَفْسَكَ. أو أنْزَلْتَهُ في كِتابِكَ. أو عَلَّمْتَهُ أحداً مِنْ خَلْقِكَ. أو استأثَرْتَ بهِ في عِلْمِ الغَيْبِ عِنْدَكَ. أنْ تَجْعَلَ القُرآنَ رَبيعَ قَلْبِي. وَنُورَ صَدْري. وَجَلاءَ حُزني. وذَهابَ هَمّي )).[٣٠١]

**واتە: خوایە من بەندەتم نەوەی بەندەتم نەوەی کەنیزەکو کۆیلەکەتم. نسیب و ناوچەوان و چارەنوسم بەدەست تۆیەو حوکمو بڕیارت بەسەرمدا رابووردووەو جێبەجێیە. بڕیاردانت بەسەرم دا دادپەروەرانەیە. داوات لێ دەکەم بەحەقی هەموو ناوێك کە هەتەو خۆتت پێ ناوناوە.یان لەکتێبەکەت دا ناردووتەتە خوارەوە (بۆ سەر یەکێك لە پێغەمبەران(عليهم السلام).**

---

(٣٠١) هەرگیز هیچ کەسێك نیەیە کە تووشی ناخۆشی و خەفەتێك دەبێت و بڵێت...فەرمودەکە .... ئیلا خوای گەورە غەم و خەفەتەکەی لادەبات و شوێنەکەی پڕدەکاتەوە بە دەرو لێکردنەوە و دڵخۆشیو کامەرانی. ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لەبەری نەکەین؟ فەرمووی: بەڵێ پێویستە هەرکەسێ دەیبیستێت لەبەری بکات/ أحمد ٣٩١/١ وصحّحَه الألباني. انظر سلسلة الأحاديث الصحيحة (٣٣٦/١) رقم(١٩٩) والكلم الطيب (ص ١٢٤).

**یان فێری یەکێك لە دروست کراوەکانت کردووە(لە پێغەمبەران یان مەلائیکەت). یان لە عیلمی غەیبدا لە لای خۆت هەڵت گرتووەو تەنها خۆت دەیزانی. کە قورئان بکەیتە کامەرانی و بەهاری دڵمو فراوان بوون و نوری سینەمو رەوێنەرەوەی دڵ تەنگیمو لابەری خەمو خەفەتم.**

**٢-** (( اللَّهُمَّ إنّي أعوذُ بِكَ مِنَ الهَمِّ وَالحَزَنِ. وَالعَجْزِ وَالكَسَلِ.وَالبُخْلِ وَالجُبْنِ. وَضَلَعِ الدَّيْنِ وَغَلَبَةِ الرِّجالِ )).(٣٠٢)

**واتە: خوایە پەنات پێ ئەگرم لە دڵ تەنگی(لەو شتەی چاوەڕوان دەکەم ڕووبدات)و خەفەت(لەوەی کە ڕوویداوە)، وە لە بێ دەستەڵاتیو بێ توانایی و تەمبەڵی. وە لە بەخیلیو ترسنۆکی. وە لە پشت چەمانەوە بەهۆی قەرزارییەوەو شکستی پیاوان بەرامبەر دوژمنان.**

## نزاو پاڕانەوەی کاتی تەنگانەو سەخڵەتی و خەفەتی زۆر ( الكَرْب )

**١-** (( لا إلهَ إلاّ اللهُ العَظيمُ الحَلِيمُ. لا إلهَ إلاّ الله رَبُّ العَرْشِ العَظِيمُ. لاإلهَ إلاّ اللهُ رَبُّ السَّمواتِ وَرَبُّ الأرضِ وَرَبُّ العَرْشِ الكَرِيمِ)).(٣٠٣)

---

(٣٠٢) البخاري ١٥٨/٧ برقم(٦٣٦٣) پێغەمبەر (ﷺ) زۆر ئەم پاڕانەوەیەی دەکرد/ انظر البخاري مع الفتح ١٧٣/١١.

(٣٠٣) البخاري ١٥٤/٧ برقم(٦٣٤٦) ومسلم ٢٠٩٢/٤ برقم(٢٧٣٠).

واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە(الله)ی مەزنی خاوەن حیلم بەرامبەر گوناهو سەرپێچی بەندەکان. هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە پەروەردگاری عەرشی گەورە. هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەوی‌و پەروەردگاری عەرش و بەخشندەو خاوەنی هەموو چاکەو فەزڵێك.

٢- (( لا إلهَ إلاّ أنْتَ سُبْحانَكَ إنّي كُنْتُ مِنَ الظّالِمِينَ )).[٣٠٤]

واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە تۆ، خوایە پاکی‌و بێ گەردی بۆ تۆیە، بەڕاستی من لە ستەم کارانمو ستەمم لە نەفسی خۆم کردووە.

٣- (( أللهُ أللهُ رَبّي، لا أُشْرِكُ بِهِ شَيئاً )).[٣٠٥]

واتە: (الله)، (الله) پەروەردگارمە هیچ هاوبەشێکی بۆ دانانێم. (واتە: خوایە ناڕەحەتیم لەسەر لابە چونکە تەنها تۆ پەروەردگارمی و هیچ هاوبەشت بۆ بڕیار نادەم).

---

(٣٠٤) (ئەمە نزاو پاڕانەوەی یونس پێغەمبەر(علیه الصلاة و السّلام) بوو کە لە سکی حوتەکەدا پاڕایەوە، هیچ موسڵمانێك نی‌یە کە بیڵێ ئیلا وەڵام دەدرێتەوە). الترمذي٥/٥٢٩ برقم(٣٥٠٥) والحاكم وصحّحَهُ وَ وافقَهُ الذَهَبِي ١/٥٠٥ وانظر صحيح الترمذي ٣/١٦٨ .

(٣٠٥) أخرجه أبوداود ٢/٨٧ برقم(١٥٢٥) وانظر صحيح ابن ماجه ٢/٣٣٥.

٤- (( يا حَيُّ يا قَيّوُمُ بِرَحْمتِكَ أستَغيثُ )).[٣٠٦]

**واتە: ئەی خوای زیندوو ئەی هەڵسوڕێنەری بوونەوەر هاناو هاوار بۆلای ڕەحمەتی تۆ دەبەم.**

٥- (( اللَّهُمَّ رَحْمَتَكَ أرجوُ فَلا تَكِلْني إلى نَفْسِي طَرْفَة عَينٍ. وَأصلِحْ لي شَأني كُلَّهُ. لآ إلهَ إلاّ أنتَ )).[٣٠٧]

**واتە: خوایە تەنها ئومێدی رەحمەتی تۆ دەکەم بۆ ئەندازەی چاوتروکانێك مەمدەرە دەست نەفسمو هەموو کاروبارم چاك بکە. هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە تۆ.**

# لەکاتی بەرەنگاربوونەوەی دوژمن وخاوەن دەستەڵات دا

١- (( اللَّهُمَّ إنّا نَجْعَلُكَ في نُحُورِهِمْ. وَنَعوذُ بِكَ مِنْ شُرُورِهِمْ )).[٣٠٨]

**واتە: خوایە خۆت بچۆ بەگژیاندا(لەو شوێنەوە دەیانەوێت بێن)و پەنادەگرم بەتۆ لە شەڕو خراپەکانیان.**

---

(٣٠٦) رواه الترمذي(٣٥٢٤) عن انس (رضي الله عنه) . حسنه عبدالقادر الأرناؤوط في تخريج كتاب(الدعاء المستجاب من السنة و الكتاب) لأحمد عبدالجواد ص٧٧. وحسنه الألباني أنظر صحيح الجامع برقم(٤٧٧٧).

(٣٠٧) أبوداود ٣٢٤/٤ برقم(٥٠٩٠) وأحمد ٤٢/٥ وحسَّنَهُ الالباني في صحيح أبوداود٩٥٩/٣.

(٣٠٨) أبوداود ٨٩/٢ برقم(١٥٣٧) وصَحَّحَهُ الحاكم ووافقه الذهبي ١٤٢/٢.

٢- (( اللَّهُمَّ أنتَ عَضُدِي. وَأنْتَ نَصِيري. بِكَ أحُولُ. وَبِكَ أصُولُ. وَبِكَ أُقاتِلُ )).(٣٠٩)

**واتە: خوایە تۆ كۆمەك و تۆ پشتیوانو سەرخەرمی. بەتۆوە ئەجولێم (یان بە تۆوە فێڵی دوژمن لادەبەم)و بەتۆوە هەڵمەت ئەبەم بۆسەریان تا لە بنیان دێنم و دەیانشكێنم، وە بەكۆمەك و پشتیوانی تۆوە ئەجەنگمو كوشتار دەكەم.**

٣- (( حَسْبُنا اللّهُ وَنِعْمَ الوَكِيلُ )).(٣١٠)

**واتە: خوامان بەسەو چاكترین پشتیوان و سەرپەرشتیارو كارپێسپێردراوە.**

## نزاو پاڕانەوەی كەسێك كە لە ستەمی خاوەن دەستەڵاتێك بترسێ

١- (( اللَّهُمَّ رَبَّ السَّماواتِ السَّبعِ. وَرَبَّ العَرْشِ العَظيمِ. كُنْ لِي جاراً مِنْ فُلانِ بنِ فُلانٍ. وَأحزابِهِ مِنْ خَلائِقِكَ. أنْ يَفرُطَ عَليَّ أحدٌ مِنْهُم أو يَطْغَى. عَزَّ جارُكَ. وَجَلّ ثَناؤُكَ . وَلا إلهَ إلاّ أنْتَ )).(٣١١)

---

(٣٠٩) أبوداود ٣/ ٤٢ برقم(٢٦٣٢) والترمذي ٥/٥٧٢ برقم(٣٥٨٤) وانظر صحيح الترمذي ٣/١٨٣.

(٣١٠) البخاري ٥/١٧٢برقم(٤٥٦٣).

(٣١١) (ئەگەر یەكێك لە ئێوە پێشەوایەكی هەبوو كە ئەم لە خۆبەگەورەزانین و ستەمی ئەترسا، با بڵێت:......). البخاري في الادب المفرد برقم ٧٠٧ وصَحَّحَهُ الالباني في صحيح الادب المفرد برقم ٥٤٨......

واتە: خوایە پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان‌و پەروەردگاری عەرشی مەزن. پارێزەروپشتیوانم بە لە دژی فلانی کوڕی فلان‌و پارت و کۆمەڵەکەی لە دروست کراوەکانت. لەوەی کەیەکێکیان خێرایی بکەن لە کوشتن و سزادانم یان سنوور ببەزێنن لە ستەم و نەفامێتی و خراپەیاندا بەرامبەرم. هەر کەس پەنات پێ بگرێت بەهێزوشکۆمەندە و ستایشت گەورەیەو هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە تۆ.

٢- «اللّهُ أكبَرُ. اللّهُ أعَزُّ مِنْ خَلْقِهِ جَميعاً. أللّهُ أعزُّ مِما أخافُ وَأحذَرُ. أعوذُ باللهِ الّذي لآ إلهَ إلاّ هُوَ. المُمْسِكِ السَّمواتِ السَّبْعِ أنْ يَقَعْنَ عَلَى الأرضِ إلاّ بِإذنِه. مِنْ شَرِّ عَبْدِكَ فُلانٍ. وَجُنودِهِ وأتباعِهِ وَأشياعِهِ. مِنَ الجِنِّ وَالإنسِ. اللَّهُمَّ كُنْ لِي جاراً مِنْ شَرِّهِم. جَلّ ثَناؤكَ وَعَزَّ جارُكَ. وَتَبارَكَ اسمُكَ وَلا إلهَ غَيرُكَ» (**سێ جار**).[312]

واتە: خوا لە هەموو شتێك گەورەترە. خوا لەهەموو دروست کراوەکانی دەستەڵاتدارترەو شکۆمەندترە، خوا دەستەڵاتدارترە لە هەموو ئەوەی کە لێی دەترسم‌و حەزەرو سڵی لێ دەکەمەوە. پەنا دەگرم بەو خوایەی کە پەرستراوی تر نییە بەهەق جگە لەو، ڕاگیرکەری حەوت ئاسمانەکان تانەکەون بەسەر زەویدا بە ئیزنی

---

(٣١٢) (ئەگەر چویتە لای دەستەڵاتدارێکی سامناك و ئەترسایت پەلامارت بدات و ئەزییەتت بدات ئەوا بڵێ:....). البخاري في الادب المفرد برقم ٧٠٨ وصَحَّحَهُ الالباني في صحيح الادب المفرد برقم ٥٤٩....

خۆی. لەخراپەی فلانی بەندەت(ناوی ئەو کەسە دەڵێ)و سەربازو شــوێن کەوتــەو کۆمەڵــەکانی لەجنۆکــەو مــرۆڤ. خوایــە پارێزەروپشتیوانم بە لە خراپەیان. ستایشت پیرۆزو دیارەو ئەو کەسەی پەنات بۆ دێنێ شکۆمەندەو ناوت بەرەکەتی زۆرەو هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە تۆ.

## نزاو پاڕانەوە لە دوژمن

(( اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الكِتابِ. سَريعَ الحِسابِ. إهزِمِ الأحزابَ. اللَّهُمَّ اهْزِمْهُم وَزَلْزِلْهُم )).(٣١٣)

واتــە: خوایــە دابەزێنــەری قورئــان. حیســابت خێرایــە. حیــزب و کۆمەڵە بێ باوەڕەکان بشکێنە. خوایە شکستیان پێ بهێنەو جێ پێیان لەق بکەو ڕاچەمانیان تێبخە.

## دوعا لە بێ بڕوایان

١- (( اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ كُلُّهُ، اللَّهُمَّ لا قَابِضَ لِمَا بَسَطْتَ، وَلا مُقَرِّبَ لِمَا بَاعَدْتَ، وَلا مُبَاعِدَ لِمَا قَرَّبْتَ، وَلا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، اللَّهُمَّ ابْسُطْ عَلَيْنَا مِنْ بَرَكَاتِكَ وَرَحْمَتِكَ، وَفَضْلِكَ وَرِزْقِكَ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ النَّعِيمَ الْمُقِيمَ الذي لا يَحولُ وَ لا يَزولُ، اللَّهُمَّ إِنِّي

---

(٣١٣) مسلم٣/١٣٦٢برقم(١٧٤٢)(٢١).

أَسْأَلُكَ النَّعِيمَ يَوْمَ الْعَيْلَةِ، وَالأَمْنَ يَوْمَ الْحَرب، اللَّهُمَّ عَائِذاً بِكَ مِنْ سوءِ مَا أَعْطَيْتَنَا، وَشَرِّ مَا مَنَعْتَ مِنَّا، اللَّهُمَّ حَبِّب إِلَينا الإيمانَ وَزَينهُ في قُلُوبِنا، وَكَرِّه إِلَينا الكُفرَ وَالفُسوقَ وَالعِصيانَ وَاجعَلنا مِنَ الرَّاشِدين، اللهم تَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ وأحيِنا مُسلِمينَ، وَأَلْحِقْنَا بِالصَّالِحِينَ، غَيْرَ خَزَايَا وَلا مَفْتُونِينَ، اللَّهُمَّ قَاتِلِ الْكَفَرَةَ الَّذِين يَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِكَ وَيُكَذِّبُونَ رُسَلَكَ، واجعَل عَلَيهِم رِجزَكَ وَعَذابَكَ، اللَّهُمَّ قَاتِلِ الْكَفَرَةَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ، إِلَهَ الْحَقِّ)).(٣١٤)

**واته: خوایه هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ تۆیه، خوایه گرەرەوە نییه لەوەی تۆ فراوانت کردووەو نزیکخەرەوە نییه لەوەی تۆ دورت خستۆتەوەو نزیکخەروە نییه لەوەی تۆ دوورت خستۆتەوە، وە دوور خەرەوە نییه لەوەی تۆ نزیکت خستۆتەوە، وە بەخشەر نییه لەوەی تۆ گرتوتەوەو گرەوە نییه لەوەی تۆ بەخشیوتە، سا خوایه لە بەرەکات و ڕەحمەت و فەزڵ و ڕۆزی خۆتمان لەسەر فراوان بکە، خوایه من داوای ئەو نیعمەتە بەردەوامەت لێ دەکەم کە هەرگیز ناگۆڕێت و لاناچێت، خوایه من داوای نیعمەتت لێ دەکەم لە ڕۆژی هەژاری و نەداری و ئەمن و**

---

**(٣١٤) لە رفاعە الزرقی یەوە فەرمویەتی: (کاتێ ڕۆژی جەنگی ئوحود بوو، وە موشریکەکان دەرکەوتن و لایاندا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: ڕێك بوەستن هەتا ستایشی پەروەردگارم بکەم، ئەوانیش لە پشتی‌یەوە بەڕیز پۆل پۆل وەستان، فەرموی:......)صححه الألباني في صحيح الأدب المفرد (٢٥٤/١) برقم(٦٩٩/٥٤١).**

ئاسایش لە ڕۆژی جەنگدا، خوایە پەنات پێ ئەگرم لە خراپەی ئەوەی پێت بەخشیوین و لە خراپەی ئەوەی لێت گرتوینەتەوە، خوایە ئیمانمان لە لا خۆشەویست بکەو لە دڵماندا شیرینی بکەو بیڕازێنەوە، وە کوفرو فسوق و سەرپێچیمان لە لا ناشیرین و قێزەون بکەو بمانکێڕە لە ژیرو دامەزراوان،خوایە بە موسڵمانێتی بمانمرێنەو بمانژییەنەو بمانگەیەنە بە پیاوچاکاندا، بەبێ ریسوایی و توشی فیتنەبوون، خوایە ئەو بێ بڕوایانە بکوژە کە بەربەست دادەنێن لەسەر ڕێگای دینەکەت و پێغەمبەرەکەت بە درۆ دەخەنەوە، سزای خۆتیان بەسەردا داباریێنە، خوایە ئەو بێ بڕوایانە بکوژە کە کیتابیان بۆ ڕەوانە کراوە ئەی پەرستراوی بەهەق.

٢- «اللَّهُمَّ أَحْصِهِمْ عَدَدًا، وَاقْتُلْهُمْ بَدَدًا، وَلَا تُبْقِ مِنْهُمْ أَحَدًا».(٣١٥)

واتە: خوایە هەموویان بە ژماردە بژمێریت، بە پەرتەوازەیی هەموویان بکوژیت، و کەسیان لێ نەهێڵیتەوە.

---

(٣١٥) ئەمە پاڕانەوەی (خوبەیبی کوڕی عەدی)(ڕەزای خوای لێ بێت) بوو کاتێ موشریکەکان بە دیلی بردیان و شەهیدیان کرد، ئەویش پێش ئەوەی بیکوژن دوو ڕکات نوێژی کورتی کردو پاشان ئەم دوعایەی لێ کردن./البخاري برقم ٣٩٨٩.

## ئەگەر لەكۆمەڵێك ترسايت

(( اللَّهُمَّ اكفِنيهِم بِما شِئتَ )).(٣١٦)

**واتە: خوايە بەهەر هۆكارێك تۆ ويستت لييەتى بمپارێزە لێيان.**

## ئەگەر بينيت موسڵمانان شكان لەجەنگێك دا

(( اللَّهُمَّ أعتَذِرُ إليكَ مِمّا صَنَعَ هؤلآءِ _ يَعنِي أصحابَهُ _ وأبرَأ إليكَ مِمّا صَنَعَ هؤلآءِ _ يَعني المُشرِكينَ _ )).(٣١٧)

**واتە: خوايە خەجاڵەتى دەردەبڕمو بەهانە دێنمەوە بۆت لەوەى ئەوكۆمەڵە كرديان _ واتە هاوەڵەكانى _ لە شكستى توش بوون و پشت هەڵكردن. وە خۆبەرى دەكەم لەوەى ئەو كۆمەڵە پىێى هەستان _ واتە هاوبەش پەيداكەران _ لە دژايەتى كردنو ئەزيەت دانى موسڵمانان.**

---

(٣١٦) ئەمە وتەى منالەكەى (أصحاب الأُخدود) ە كە لە بىێ باوەڕەكانى كرد/ مسلم٤/٢٣٠٠برقم(٣٠٠٥).

(٣١٧) ئەمە وتەى ئەنەسى كوڕى نەضرە (رەزاى خواى لىێ بىێ) كە لە رۆژى ئوحوددا كە بينى موسڵمانان دەشكێنو هەڵدێن. وە لە دواييدا جەنگاو شەهيد بوو، بينيان هەشتاو ئەوەندە زامى پێوە بوو، كەس نەيناسىيەوە جگە لە خوشكێكى نەبێت ئەويش بە نيشانەيەكدا ناسىيەوە كە بە پەنجەيەوە بوو./ البخاري ١٦/٦، ١٧ ومسلم(١٩٠٣)

# لەسەرەمەرگی شەهیدی دا

بڵێ: «اللهُ أكبَر. فُزْتُ وَرَبُّ الكَعْبَةِ».[٣١٨]
واتە: خوا گەورەترە لە هەموو شتێك. بە پەروەردگاری كەعبە بردمەوە.

# كەسێك لە جیهاد گەڕایەوە

«الحَمدُ للهِ الَّذي أَعَزَّكَ وَأَكْرَمَكَ».[٣١٩]

واتە: هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ ئەو خوایەی سەربەرزی كردیت و ڕێزی لێ نایت.

# لە كاتی پەیدا بوونی گومان لە ئیمان دا

١- پەنا دەگرێ بەخوای گەورە.[٣٢٠]
٢- كۆتایی لەو شتە دێنێ كە گومانی هەیە تیایدا.[٣٢١]

---

(٣١٨) ئەمە ووتەی حەرامیی كوڕی مەلحان ی خاڵی ئەنەسی كوڕی مالیكە كە لە كاتی شەهید بوونیدا لە(بئر المعونة)دا فەرمووی/ بڕوانە(الرحيق المختوم)ص(٢٦٧). رواه البخاري و مسلم، بەڵام لە ڕیوایەتی مسلم دا(الله أكبر)ی تێدا نییە. عن أنس(رضي الله عنه) انظر الأذكار للنووي ص(١٩٢).

(٣١٧) أخرجه أبوداود(٤١٥٣) وصححه الألباني أنظر آداب الزفاف (١٠٩-١١٢) وصحيح الجامع الصغير(٧٢٦٢).

(٣٢٠) البخاري مع الفتح٦/٣٣٦برقم(٣٢٧٦) ومسلم ١/١٢٠برقم(١٣٤)(٢١٤).

(٣٢١) البخاري مع الفتح٦/٣٣٦برقم(٣٢٧٦) ومسلم ١/١٢٠ برقم(١٣٤)(٢١٤).

**٣- بڵێ:** (( آمَنتُ باللهِ وَرُسُلِهِ )).[(٣٢٢)] ، **واتە: ئیمانم هێنا بە خواو پێغەمبەرەکانی**(علیهم الصلاة والسلام).

**٤- ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە:**﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ۝٣﴾.[(٣٢٣)]

**واتە: ئەو خوایە یەکەمینە و لەسەرەتاوە هەر هەبووەو کەس پێش ئەو نەبووە، دواهەمینە و کۆتایە، کەس دوای ئەو نامێنێت، (بەڵام ئەو هەر دەمێنێت)، هەروەها ئەو زاتەدیارە و هەموو شت بەڵگەیە لەسەر بوونی، لەهەمان کاتدا زاتی خۆی نادیارە و (بەچاوی سەر نابینرێت، بەڵام بەبینایی بیروهۆش و دڵ و دەروون ئاشکرایە)، هەر خۆیشی زانایە بەهەموو شتێك.**

**٥-** (( اللهُ أَحَد، اللهُ الصَّمَد، لَم يَلِد، وَلَمْ يُولَد، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَد)) **پاشان سێ تف بکات بەلای چەپیداو پەنابگرێت بە خوای گەورە لە شەیتان.**[(٣٢٤)]

---

(٣٢٢) مسلم ١/١١٩-١٢٠برقم(١٣٤)(٢١٤).

(٣٢٣) سورة الحديد: الآية (٣) . أبو داود ٤/٣٢٩ برقم(٥١١٠) وحسَّنَهُ الالباني في صحيح أبوداود ٣/٩٦٢.

(٣٢٤) نزیکە خەڵکی پرسیار بکەن بە جۆرێك بڵێن: ئەوە خوایە دروستکراوانی دروستکردووە، ئەی کێ خوای دروست کردووە؟ ئەگەر ئاوایان ووت بڵێن:......./أبوداود (١٤٢٢) عن أبي هريرة(رضي الله عنه) وحسنه الألباني في صحيح الجامع برقم(٨١٨٢).

# نزاو پاڕانەوەی قەرزاری یان قەرز لەسەر لاچوون

١- (( اللَّهُـمَّ اكفِنـي بِحَلالِـكَ عَـن حَرامِـكَ. وأغْنِنـي بِفَضـلِكَ عَمَّـنْ سِواكَ)). (٣٢٥)

**واتـە: خوایـە بـە حـەڵاڵی خـۆت دوورم بخـەرەوە لەحـەرامت تـا مـەجبوری نـەبم و بـە فـەزڵی خـۆت دەوڵەمەنـدو بێنیـازم بکـە لـە غەیری خۆت.**

٢-(( اللَّهُمَّ إنّي أعوذُ بِكَ منَ الهَمِّ وَالحَزَنِ. وَالعَجْزِ وَالكَسَلِ، وَالبُخْلِ وَالجُبْنِ. وَضَلَعِ الدَّينِ وَغَلَبَةِ الرِّجالِ )). (٣٢٦)

**واتـە: خوایـە پـەنات پـێ ئـەگرم لـەدڵ تـەنگی و خەفـەت. وە لـە بێدەستەڵاتی و تەمبەڵی. وە لە بەخیلی و ترسنۆکی. وە لە پشت چـەمانەوە بـەهۆی قورسـی قەرزارییـەوەو لـە دۆڕانـی پیـاوانی ئیسلام و شکست هێنانیان.**

٣- ((اللَّهُمَّ مَالِكُ الْمُلْكِ، تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشَاءُ، وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشَاءُ، وَتُعِزُّ مَنْ تَشَاءُ، وَتُذِلُّ مَنْ تَشَاءُ، بِيَدِكَ الْخَيْرِ إِنَّكَ عَلَى كُلِّ

---

(٣٢٥) هەرکەس ئەمە بڵێ و (لە چەند ڕیوایەتی جیادا) ئەوا بە ئەندازەی شاخی (صبر){ کە شاخێکە لە أجإ لە دیار طي کە کۆمەڵێك ئەشکەوتی تیایە لە خانوو دەچێت} (یان ثبیر) یان(صبیر)کە شاخێکە لە یەمەن قەرزار بێت، خوای گەورە دانەوەی بۆ ئاسان دەکات/ الترمذي ٥/٥٦٠ (٣٥٦٣) و حَسَّنَهُ الألْبانِي في صَحِيح الجامع(٢٦٢٥) وانظر صحيح الترمذي ٣/١٨٠ .

(٣٢٦) البخاري ٧/١٥٨برقم(٦٣٦٣).

شَـيْءٍ قَـدِيرٌ، رَحْمـنُ الـدُّنْيَا وَالآخِـرَةِ وَرَحيمَهُمـا، تُعْطِيهُمَـا مَـنْ تَشَـاءُ، وَتَمْنَـعُ مِنْهُمَـا مَـنْ تَشَـاءُ، ارْحَمْنِـي رَحْمَـةً تُغْنِينِـي بِهَـا عَـنْ رَحْمَـةِ مَـنْ سِوَاكَ)). (٣٢٧)

**واته: خوايه ئەی خاوەنی هەموو موڵك، موڵك ئەبەخشيت بەهەر كەسێك بتەوێت و موڵك لەهەر كەسێك دەسەنيتەوە كە بتـەوێت، هەركەسێك ويستت لێ بێت سەربەرزی دەكەيت و كێت ويست لێ بێت زەليل و سەرشۆڕی دەكـەيت، خێـر بەدەسـت تۆيـەو بەسـەر هـەموو شـتێكدا بـەتوانايت، تـۆ ڕەحمـانی دونيـاو قيامـەت و ڕەحيميـانی، ئەيانبەخشـيت بەهـەر كەسـێك ويسـتت لێ بێـت و لەهەركەسێكی دەگريتەوە ويستت لێ بێت، خوايە ڕەحمێكم پـێ بكە بێ نيازم بكات لە بەزەيی غەيری خۆت.**

## ئەگەر كارێكت لەسەر گران بوو

(( اللَّهُـمَّ لاسَـهْلَ إلاّ ماجَعَلتَـهُ سَـهلاً، وأنـتَ تَجعَـلُ الحَـزْنَ إذا شِـئتَ سَهلاً)). (٣٢٨)

---

**(٣٢٧) رواه الطبراني في الصغير برقم (٥٥٨) بإسناد جيد وحسنه الألباني صحيح الترغيب والترهيب (٢/١٧١) برقم(١٨٢١).**

**(٣٢٨) رواه ابن حبان في صحيحه برقم (٢٤٢٧) (موارد) وابن السني برقم (٣٥١) وقال الحافظ: هذا حديث صحيح. وصحّحه عبدالقادر الارناؤوط في تخريج الاذكار للنووي ص(١٠٦). وصححه الألباني في الصحيحة برقم(٢٨٨٦).**

واتە: خوایە هیچ کارێکی ئاسان نییە مەگەر ئەوەی تۆ ئاسانت کردووە. وە تۆ ئەگەر ویستت لێ بێ زبری و ڕەقی و گرانی ئاسان دەکەیت.

## ئەو نزایەی کە شەیطان و وەسوەسەکانی ڕاودەنێ

١- پەنا گرتن بەخوای گەورە لێی.(٣٢٩)

٢- بانگ دان.(٣٣٠)

٣- زیکرە شەرعییەکان و خوێندنەوەی قورئان.(٣٣١)

---

(٣٢٩) انظر سورة المؤمنون آية (٩٧ – ٩٨). والحديث اخرجه أبوداود ٢٠٦/١ والترمذي وانظر صحيح الترمذي ٧٧/١

(٣٣٠) البخاري ١٥١/١برقم(٦٠٨) ومسلم ١/ ٢٩١برقم(٣٨٩).

(٣٣١) (ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان. بەڕاستی شەیطان لەو ماڵە ڕادەکات کە سورەتی (البَقَرة) ی تێدا دەخوێندرێ) مسلم ٥٣٩/١برقم(٧٨٠). وە لەو نزایانەی کە شەیطان ڕاودەنێ: ذیکری بەیانیان و ئێواران و خەوتن و هەستان لەخەوو ذیکری چوونەماڵ و هاتنە دەرەوە لێ ی و ذیکری چوونە مزگەوت و هاتنە دەرەوە لێ ی و غەیری ئەمانە لە ذیکرە شەرعی یەکان وەکو خوێندنی (آية الكرسي) لەپێش خەوتنداو خوێندنی دووئایەتی کۆتایی سورەتی(البَقَرَة). وەهەرکەسێك(سەد) جار بڵێ (لا إلهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَريكَ لهُ. لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهُوَ عَلى كُلّ شَيءٍ قَدير) ئەوا دەبێتە قەڵغان بۆی لەشەیطان بەدرێژایی ئەو ڕۆژە. وەهەروەها بانگ دان شەیطان ڕاودەنێ.

# ئەو نزایەی بۆ دەرکردنی فێڵی شەیطان و دارودەستەکەی دەووترێ

«أعوذُ بكَلِماتِ اللهِ التّامّاتِ الَّتي لا يُجاوزُهُنَّ بَرٌّ وَلا فاجِرٌ مِنْ شَرِّ ما خَلَقَ. وَبَرَأَ وَذَرَأَ. وَمِنْ شَرِّ ما يَنزِلُ مِنَ السَّماءِ. وَمِنْ شَرِّ ما يَعْرُجُ فيها. وَمِنْ شَرِّ ما ذَرَأَ في الأرضِ. وَمِنْ شَرِّ ما يَخْرُجُ مِنْها. وَمِنْ شَرِّ فِتَنِ اللّيلِ وَالنَّهارِ. وَمِنْ شَرِّ كُلِّ طارِقٍ إلاّ طارِقاً يَطرُقُ بخَيرٍ يارَحْمن». [(٣٣٢)]

**واتە: پەنا ئەگرم بە ووتە تەواوە(بێ نوقسانییە بەسوودو شیفادەر)ەکانی خوای گەورە کە بەتەقواو خراپەکار ناتوانن بیبەزێنن( واتە زانستی کەس ئەو سنوورە نابەزێنێت و زیاتر نازانێت کە بۆی دیاری کراوە) لەخراپەی ئەوەی دروست کراوەو دێتو دەچێ. وەلە خراپەی ئەوەی لە ئاسمانەوە دادەبەزێ لە سزا(وەك هەورەبروسکەو باران)و خراپەی ئەوەی سەردەکەوێ بۆی(لەکردەوەی خراپ و شایستەی سزا). وە لە خراپەی ئەوەی کە بەسەر زەویدا دەڕوا(لە گیانلەبەرو دڕندەو جنۆکە)و ئەوەی لێوەی دێتەدەرەوە(لەمێروو زیندەوەر). وە لە خراپەو تاقیکردنەوەی لەشەوو ڕۆژدا ڕوودەدات. وە لە خراپەی ئەو ڕووداوانەی لە شەودا ڕوودەدەن، مەگەر ڕووداوێك کە بەخێر ڕووبدات ئەی خوای بەبەزەیی.**

---

(٣٣٢) أحمد ٤١٩/٣ بإسنادٍ صحيح وابن السني برقم (٦٣٧) وصَحَّحَ اسناده الارناؤوط في تخريجه للطّحاوية ص(١٣٣) وانظر مجمع الزوائد ١٢٧/١٠.

## ئەگەر كارێكت ویست و سەری نەگرت و وا دەرنەچوو

١-( بڕواداری بەهێز چاكترەو خۆشەویست ترە بە لای خوای گەورەوە لە بڕواداری لاوازو لەهەردوكیانیشدا خێر هەیە. سوور بە لەسەر ئەو شتەی كەڵكت پێدەگەیەنێو داوای كۆمەك لە خوا بكەو دەستەوستان و لاواز مەبە. وە ئەگەر شتێكت تووش هات(پێت ناخۆش بوو) مەڵێ ئەگەر ئاواو ئاوام بكردایە ئەوا ئاواو ئاوا دەبوو. بەڵكو بڵێ: (( قَدَرُ اللهِ وَما شآءَ فَعَلَ )). واتە: ئەمە بڕیاری خوای گەورەیەو ئەو شتەی ویستی بوو كردی و ئەنجامیدا. چونكە ووشەی(ئەگەر) دەرگای كاری شەیطان دەكاتەوە).[٣٣٣]

## لە كاتی پژمین( العَطَس )دا

١- دەست یان كراسەكەت بخەرە سەر دەمت و دەنگت نزم بكەرەوە.[٣٣٤]

٢- ئەگەر یەكێك لە ئێوە پژمی با بڵێ: (( ألحَمْدُ للهِ ))[٣٣٥]یان (( ألحَمْدُ للهِ على كُلِّ حالٍ )).[٣٣٦]

---

(٣٣٣) مسلم ٢٠٥٢/٤برقم(٢٦٦٤).

(٣٣٤) أبوداود (٥٠٢٩) والترمذي (٢٧٤٦) وقال: حديث حسن صحيح، وسنده حَسَنٌ عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

(٣٣٥) البخاري ١٢٥/٧برقم(٦٢٢٤).

(٣٣٦) رواه أبوداود برقم(٥٠٣٣) وأحمد والترمذي والنسائي والحاكم وصححه الألباني وانظر حديث رقم (٦٨٧) في صحيح الجامع وأنظرصحيح سنن أبى داود ٩٤٩/٣.

**واتە: هەموو سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە لەسەر هەموو حاڵێك(بۆ دەرچوونی ئەو هەوایە). وە با براكەی یان هاوەڵەكەی پێی بڵێ: « يَرْحَمُكَ الله ».واتە:خوا ڕەحمت پێبكات(یان واتە: ئەمە ڕەحمی خوایە بۆت)، وە ئەگەر وتی: « يَرحَمُكَ الله » ئەم پێی بڵێ: « يَهديكُمُ اللهُ وَيُصلِحُ بالَكُمْ ».(٣٣٧)**

**واتە: خوا ڕێنمایتان بكات و حاڵتان بۆ چاك بكات(لە دین و دونیادا بە تەوفیق و پشتگیری كردن).**

**٣- ( ئەگەر كەسێك لە ئێوە پژمی و سوپاسی خوای كردو بیستتان{هەمووتان} وەڵامی بدەنەوە بە: « يَرحَمُكَ الله » بەڵام ئەگەر سوپاسی خوای نەكرد وەڵامی مەدەنەوە).(٣٣٨)**

---

(٣٣٧) البخاري ١٢٥/٧برقم(٦٢٢٤).

تێبینی: حیكمەتی سوپاسی خوا كردن لەم كاتەدا وەك ابن القیم(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت ئەوەیە : (بە هۆی ئەو پژمینەوە نیعمەت و سودێكی زۆری تووش بووە ئەویش بە هۆی دەرچوونی ئەو هەڵم و هالاْوە قەتیسماوەی ناو دەماغی كە ئەگەر بمایەتەوەو دەرنەچووایە تووشی نەخۆشی سەخت و قورسی دەكرد، هەر بۆیە بۆی دانراوە سوپاسی خوا بكات لەسەر ئەو نیعمەتە لەگەڵ مانەوەی ئەندامەكانی لاشەی لەسەر شێوەی خۆی دوای ڕوودانی ئەو لەزینەی كە بۆ لاشە بە وێنەی بومەلەرزەی زەویی‌یە بۆی...). زاد المعاد (٢/ ٣٩٧)

(٣٣٨) مسلم ٢٢٩٢/٤.

<u>تێبینی</u>: هەتا سێجار وەڵامی كەسێك بدەرەوە كە پژمی بە(يَرحَمُكَ الله). ئەگەر زیاد لە سێجار پژمی وەڵامی مەدەرەوە چونكە دیارە نەخۆشەو هەڵامەتی‌یەتی./ بۆ درێژەی ئەمە بە بەڵگە صەحیحەكانیەوە بڕوانە( الأذكار) لاپەڕە (٢٦٧-٢٦٨).

**٤- ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمی با بڵێت:** ((الحَمدُللهِ رَبِّ العالَمين))، **وە با پێی بوترێت:** ((يَرحَمُكَ الله))، **ئەویش بڵێت:** ((يَغفِر الله لَنا وَلَكُم)). (٣٣٩)

## ئەگەر بێباوەڕێك پژمی و ( الحَمدُ للهِ ) ی کرد

**پێی بڵێ:** (( يَهديكُمُ اللهُ وَيُصلِحُ بالَكُم )). (٣٤٠)

---

**تێبینی/ دروست نییە لە کاتی پژمیندا شتێکی تر بوترێت وەك وتنی(سەبری هێنا) یان سەلاواتدان یان شتی تر چونکە:**

**پیاوێك لە تەنیشت ابن عمر(ڕەزای خوای لێ بێت) پژمی و وتی: (الحمدلله والسلام على رسول الله)، ابن عمر فەرموی: منیش ئەڵێم: (الحمد لله والسلام على رسول الله)، بەلاَم پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوا فێر نەکردوین(کە لەم کاتەدا ئەمە بیڵێین)!! ئەو فێری کردوین کە بڵێین: ((الحمدلله على كل حال))./ أخرجه الترمذي برقم(٢٧٣٨) وغيره بإسناد صحيح وحسنه الألباني كما هو مبين في (إرواء الغليل) (٢٤٥/٣). أنظر صحيح الأدب المفرد ٣٦٠/١.**

**(٣٣٩) رواه الطبراني وأحمد والحاكم وصححه الألباني في صحيح وضعيف الجامع الصغير(١٨٨/٢) برقم (٦٨٨) وانظر حديث رقم (٦٨٦) في صحيح الجامع.**

**(٣٤٠) الترمذي ٥/ ٨٢ برقم(٢٧٣٩) وأحمد٤/٤٠٠ وأبوداود٣٠٨/٤ برقم(٥٠٣٨) وانظر صحيح الترمذي ٣٥٤/٢. جولەکەکان بە زۆر خۆیان دەپژماند لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) تاپێیان بڵێت: یرحمکم الله، ئەویش دەیفەرموو:...)**

# له كاتی باوێشك دان( التّثاؤب )دا

١- (( باوێشك له شهیطانهوهیه.ئهگهر باوێشكت هات تا دهتوانی بیگێڕهوه چونكه شهیطان لهوكاتهدا پێت پێ دهكهنێت )).[٣٤١]

٢- (( ئهگهر باوێشكت دا دهست بخهره سهردهمت چونكه شهیطان دهچێته ناوی )).[٣٤٢]

# نزاو پاڕانهوه بۆ موسڵمانێك ئهگهر هاوسهری هێنا( دوای ماره بڕین )

١- پــێی بڵــێ: (( بـارَكَ اللهُ لَـكَ. وَبـارَكَ عَلَيـكَ. وَجَمَـعَ بَينَكُمـا فـي خَيرٍ)).[٣٤٣]

واته: خوا لێت پیرۆز بكات و بهرهكهت بڕژێ به سهرت داو لهسهر خێر كۆتان بكاتهوه.

٢- یان بڵێ: (( اللَّهُمَّ بارِكْ فيهما وَبارك لَهُما في بِنائِهِما )).[٣٤٤]

واتــه: خوایــه بهرهكــهت بــڕژه بــه ســهریانداو بهرهكــهت بخــهره گهیشتنیان بهیهك و چوونه لای یهكتریان.

---

(٣٤١) البخاري ٥٠١/١٠ عن أبي هريرة(رضي الله عنه).

(٣٤٢) رواه مسلم (٢٩٩٥) عن أبي سعيد الخدري(رضي الله عنه).

(٣٤٣) أخرجه أصحاب السنن إلاّ النسائي وانظر صحيح ابن ماجه٣٢٤/١.

(٣٤٤) رواه الطبراني في الكبير وحسّنه الألباني (آداب الزفاف ص ٧٧).

**٣- یان بڵێ:** (( عَلَى الخَير وَالبَرَكَةِ وَعلى خَيرِ طائِرٍ )).[٣٤٥]
**واتە: لە خوا دەپاڕێمەوە لەسەر چاکەو فەڕو بەرەکەتی تەواو و لەسەر چاکترین نسیب کۆی کردبێتنەوە.**

# نزاو پاڕانەوەی ژن هێنەرو بکڕی هۆی گواستنەوە

**( ئەگەر یەکێك لە ئێوە ژنی هێناو خێزانی پەیدا کرد(لە شەوی گواستنەوەدا ئەمە دەڵێت). یان خزمەتکارێکی کڕی[٣٤٦] با ناوچەوانی بگریو(ناوی خوا بهێنێ) و(لە خوا بپاڕێتەوە بۆی بە بەرەکەت)و بڵێ:** (( اللَّهُمَّ إنّي أسألُكَ خَيرَها، وَخَيرَ ما جَبَلتَها عَلَيهِ. وَأعوذ بِكَ مِن شرِّها، وَشَرِّ ما جَبَلْتَها عَلَيهِ )).

**واتە: خوایە من داوای چاکەی ئەمە(کە چاك هەڵسوکەوت کردنە لەگەڵی)و ئەو چاکەیەت لێ دەکەم کە بەدیتهێناوە سەری(لە ڕەوشتی جوان)و پەنات پێ ئەگرم لە خراپەکەی و لەو خراپەیەی**

---

(٣٤٥) رواه البخاري ٣٦/٧. ئافرەتە ئەنصارییە ئامادە بووەکان ئەمەیان بە عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت) ووت کاتێ گوازرایەوە.
(٣٤٦) وە ئەگەر ئۆتۆمبیلی کڕی هەمان کار دەکات و دەست دەگرێ بەسەرئۆتۆمبێلەکەوەو دەیڵێ... .

که خستوتەتە سەری. وە ئەگەر حوشترێکی کڕی با دەست بگرێ بە بەرزایی سەر کۆپارەی پشتی و هەروەکو ئەمە بڵێ). (٣٤٧)

## شەوی زاوایەتی چی بکات

**دوو ڕکات نوێژ دەکەن بە یەکەوەو دواتر ئەم دوعایە دەخوێنێت:**

((اللَّهُـمَّ بَـارِكْ لِـي فِـي أَهْلِـي، وَبَـارِكْ لَهُـمْ فِـيَّ، اللَّهُـمَّ اجْمَـعَ بَيْنَنَـا مَـا جَمَعْتَ بِخَيْرٍ، وَفَرِّقْ بَيْنَنَا إِذَا فَرَّقْتَ إِلَى خَيْرٍ)). (٣٤٨)

**واتە: خوایە بەرەکەت بڕژە بەسەرمدا لە خێزانم و بەرەکەت بڕژە بەسـەر ئەوانـەدا لـە منـدا، خوایـە تـا کـەی ویسـتت لێیـەتی**

---

(٣٤٧) أبوداود ٢٤٨/٢ برقم(٢١٦٠)، وابن ماجه ٦١٧/١ برقم(١٩١٨) وحسنه الألباني انظر صحيح ابن ماجه ٣٢٤/١. بۆ زیادەی نێوان دوو کەوانەکە بڕوانە: آداب الزفاف ص١٩. وسـنن الكـبرى للبيهقـى (١٤٨/٧) بـرقم (١٣٦١٦) و(١٣٦١٧) و سـنن أبـى داود(٢١٤/٢) برقم (٢١٦٢) وە غەیری ئەوانیش...

(٣٤٨) پیاوێك هات پێیان ئەوت (أبو حرين) فەرمووی: من کچێکی گەنجم خواستووەو ئەترسـم ئــەو مــن ببوغزێنێــت و منــی خــۆش نــەوێت، عبداللــەی کــوڕی مەسعودیش(ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموی:

واتە: پێکەوە گونجان لە خواوەیەو ڕق و کینەو ئاژاوەش لە شەیتانەوەیە، ئەیەوێت ئەو شتەی خوای گەورە بۆی حەڵاڵ کردون لاتان ناخۆش و ناشیرین بکات، جا کاتێ هاوسـەرەکەت هاتـە لات فـەرمانی پـێ بکـە دوو ڕکـات نوێـژ لـە دواتـەوە بکات،(لـە ڕیوایەتەکەی تردا ئەمەشی لەگەڵدایە: ) وە بڵێ: ((اللَّهُمَّ بَارِكْ لِي فِي أَهْلِي.......)).\/

أخرجه أبو بكر بن أبي شيبة في المصدر السابق وكذا عبد الرزاق في مصنفه وسنده صحيح وأخرجه الطبراني بسندين صحيحين والزيادة مع الرواية الأخرى له ورواه في الأوسط كما في الجمع بينه وبين الصغير، أنظر آداب الزفاف (٢٤/١).

**کۆماندەکەیتـەوە لەسـەر خێـرو چاکە کۆمـان بکـەرەوەو کـەیش جیات کردینەوە بەرەو چاکە جیامان بکەرەوە لە یەکتری.**

# نزاو پاڕانەوەی پێش چوونە لای خێزان و

# ( جیماع کردن )

(( بِسْمِ اللهِ. اللَّهُمَّ جَنِّبْنا الشَّيطانَ. وَجَنِّبِ الشَّيطانَ مارَزَقْتَنا )).(٣٤٩)

**واتە: (خۆم پەنا ئەدەم)بە ناوی خوا. خوایە شەیطانمان لێ دوور بخـەرەوەو شـەیطـان لـەو منالـەش دوور بخـەرەوە کـە پێمـان دەبەخشی.**

# ئەگەر منداڵێکی لەش ساغیان بوو

عن كثير بن عبيد قال: (كانَتْ عائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) إِذا وُلِدَ فِيهِم مَولـودٌ- يَعنـي: فـي أَهلِهـا- لا تَسـأَل: غُلامـاً وَلا جارِيَـة، تَقـولُ: خُلـق سويّاً؟ فَإِذا قيلَ: نَعَم. قالَتْ: ((أَلْحَمدُ لله رَبِّ العالَمين)).(٣٥٠)

**واتە: عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت) عادەتی وابوو ئەگەر لە منداڵ و ساوایەکیان ببوایە- واتـە لـە نـاو کـەس و کاریـدا- پرسـیاری**

---

(٣٤٩) ئەگەر ئەمە بڵێ و منداڵیان بوو ئەوا شەیطان هەرگیز ناتوانێ زیانی پێ بگەیەنێ/ البخاري ١٤١/٦ برقم(٣٢٧١) ومسلم ١٠٢٨/٢برقم(١٤٣٤).

(٣٥٠) قال الشيخ الألباني: حسن الإسناد موقوفا، أنظر صحيح الأدب المفرد (١٣/٢) باب من حمد الله عند الولادة إذا كان سوياً ولم يبال ذكراً أوانثى برقم(١٢٥٦/٩٥٦).

نەدەکرد: ئایا کوڕە یان کچ، بەڵکو دەیفەرموو: ئایا تەواوو بێ نوقسانییە؟ ئەگەر بیانوتایە: بەڵێ، دەیفەرموو: هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان.

## ئەو نزاو پاڕانەوەی کە منداڵی پێ پەنا دەدرێ

ابن عەباس(ڕەزای خوایان لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەسەن و حوسەینی(ڕەزای خوایان لێ بێت) پەنا دەدا بەمە: (( أُعيذُكُما بِكَلِماتِ اللهِ التّامَّةِ. مِنْ كُلِّ شيَطانٍ وَهامَّةٍ. ومِنْ كُلِّ عَينٍ لامّةٍ )).(351)

واتە: پەناتان دەدەم بە ووتە تەواوەکانی خوای گەورە، لە هەموو شەیطان و گیانلەبەرو زیندەوەرێکی زیانبەخشی خاوەن ژەهر. وە لە هەموو چاوێکی لۆمەکراوو پیس. ( یان – مِنْ كُلّ عَينٍ لامّة – واتە: لە هەموو دەردو نەخۆشییەك کە مرۆڤ دەیگرێ لە شێتی و کەم عەقڵی).(352)

وە دەیفەرموو: ئەمە ئیبراهیم پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) ئیسماعیل و ئیسحاقی کوڕی پێ پەنا دەدا.(353)

---

(351) البخاري ٤/١١٩برقم(٣٣٧١).

(352) الفتح ٦/٣٧٣.

(353) البخاري برقم(٣٣٧١).

# ئەگەر منداڵتان بوو

**١- هۆزەبانە(العَقيقة) يان (النَّسيكة)ی بۆ بكە. ئەويش سەربڕينی دوو مەڕە بۆ نێرو يەك مەڕ بۆ منداڵی مێينە.[354]**

**٢- ئەمە لە ڕۆژی حەوتەم دا دەكرێت و منداڵەكە ناو دەنرێت بە ناوێكی جوانی شەرعی.[355] ئەگەر نەكرا ئەتوانرێ لە(١٤) يان (٢١)دا بكرێ.[356]**

**٣- وە گۆش(تَحنيك) دەكرێت، ئەويش بە خورمايەك لەدەمی خۆت دا شلی بكەرەوەو بيدە لەمەڵاشووی و دوعای خێری بۆ بكە.[357]**

---

(٣٥٤) أخرجه الترمذي ٤/٩٦رقم(١٥١٣) وقال: حديث حسن صحيح، وهو حديث صحيح. لێی دەخورێت و لێی دەكرێتە خێر، وەچاك وايە ئێسقانی نەشكێنرێت.

(٣٥٥) أخرجه ابوداود ٣/٢٦٠ رقم(٢٨٣٨) والترمذي ٤/١٠١ رقم( ١٥٢٢) والنسائي٧/١٦٦ رقم( ٤٢٢٠) وابن ماجه وغيرهم. وهو حديث صَحيح. وأنظر ابن ماجه(٣١٦٥).

(٣٥٦) موقوف على عائشة(رضي الله عنها). أخرجه الحاكم (٤/٢٣٨-٢٣٩) برقم(٧٥٩٥) انظر إرواء الغليل٤/٣٩٥-٣٩٦.

(٣٥٧) صحيح( صحيح سنن أبي داود ٣/٩٦١). وەهەروەها ئەبی موسی دەفەرموێت: (منداڵێكمان بوو بردم بۆلای پێغەمبەر(ﷺ)و ئەويش ناوی نا ئيبراهيم و خورمايەكی لە دەمی خۆیدا شل كردەوەو دەمیمنداڵەكەی پێ شيرين كردو پاڕايەوە بۆی بە بەرەكەت و دايەوە پێم...). رواه البخاري(٦١٩٨) ومسلم من حديث أبي موسى الأشعري/ أنظر تحفة الذاكرين ص١٨٢.

**٤- وه سـەری دەتاشـریٚو بـه ئەنـدازەی کێشـەکەی زیـو دەبەخشیتەوە بەسەر هەژاران دا.** (٣٥٨)

# پارانەوە بۆ کۆرپەی تازە بوو لە کاتی گۆشکردنی دا

((كَانَ يُؤْتَى بِالصِّبْيَانِ، فَيُبَرِّكُ عَلَيْهِمْ، وَيُحَنِّكُهُمْ، وَ يَدْعُو لَهُمْ)). (٣٥٩)

**واتـه: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) منـداڵی کۆرپـەی تـازە بوویـان بـۆ دەهێنا ئەویش دوعای بەرەکەتی بۆ دەکردن و گۆشی دەکردن و بۆیان دەپاڕایەوە.**

---

(٣٥٨)أحمد في المسند ٣٩٠/٦ والبيهقي في(السنن الكبرى) ٣٠٤/٩. وهوحديث حَسَن.

تێبینی(١): أبی بریده دەفەرموێت: لە سەردەمی نەفامیێتیدا ئەگەر یەکێك لە ئێمە کوڕی ببوایە مەڕێکیان بۆ سەردەبڕیو سەریان سواخ ئەدا بە خوێنەکەی، بەڵام کاتیٚ ئیسلام هات ئێمە (لە ڕۆژی حەوتەمیدا) مەڕەکەمان سەردەبڕیو سەری منداڵەکەمان دەتاشیو زەعفەرانمان دەدا لە سەری، (رزین) ئەمەشی بۆ زیاد کردووە: وە ناومان دەنا./ رواه أبوداود برقم(٢٨٤٣) قال الألباني: حسن صحيح، وانظر مشكاة المصابيح(٢/ ٤٤٥) برقم(٤١٥٨) وإرواء الغليل٣٨٩/٤.

تێبینی(٢): سەبارەت بە فەرموودەی بانگ دان بەگوێی منداڵدا بەبانگی نوێژ لە حەوتەم ڕۆژیدا شێخ ئەلبانی یەکەم جار بە (حَسَن)ی دانابوو بڕوانە الكلم الطيب(٢١٠) ط:٣، الإرواء (١١٧٣)، أبو داود (٥١٠٥)، الترمذي (١٥١٤)، بەڵام دواتر دەفەرموێت: فەرموودەیەکی ضەعیفە بڕوانە صحيح الكلم (ص ١٦٢( طبعة المعارف، والضعيفة (٦١٢١). بەڵام هەندێ لە زانایان کار بەم فەرمودەیە دەکەن لەوانە: ئیمامی النووی لە(الأذكار) وە ابن القيم لە( أحكام المولود)دا وە الدهلوی لە(حجة الله البالغة)، وە هەندێك زانای تر پێی وایە کە لە پێشینی چاکەوە وارد بووە کە کردوویانە... والله أعلم.

(٣٥٩) أخرجه أبوداود عن عائشة وصححه الألباني أنظر صحيح الجامع(٤٨٧٦). وفي مسلم(٥٧٤٣) بلفظ: (كَانَ يُؤْتَى بِالصِّبْيَانِ فَيُبَرِّكُ عَلَيْهِمْ وَيُحَنِّكُهُمْ).

## تەوقە كردن لەگەڵ منداڵ و دەست هێنان بە سەریدا

عن سلمة بن وردان قال: رَأيتُ أنَسَ بن مالك يُصافِحُ النّاسَ، فَسَأَلَني: مَن أَنتَ؟ فَقُلتُ: مَولى لبني لَيث، فَمَسَحَ عَلى رَأسي ثَلاثاً، وَقال: (بارَكَ اللهُ فِيكَ). (٣٦٠)

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیکم بینی تەوقەی لەگەڵ خەڵکیدا دەکرد، لێی پرسیم: تۆ کێیت؟ ووتم: خزمەتکارێکی نەوەی (لَیث)م، سێ جار دەستی هێنا بەسەرمداو فەرمووی: خوا بەرەکەتت تێ بکات.**

## فەزڵی سەردانی کردنی نەخۆش

**پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **دەفەرموێت**: «إذا عادَ الرَّجُلُ أخاهُ المُسلِمَ. مَشَى في خِرافَةِ الجَنّةِ حَتَى يَجْلِسَ. فإذا جَلَسَ غَمَرَتْهُ الرَّحْمَةُ. فإنْ كانَ غُدْوَةً صَلّى عَلَيهِ سَبْعُونَ ألفَ مَلَكٍ حَتَى يُمْسِيَ، وَإن كانَ مَساءً صَلّى عَلَيهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَى يُصْبِحَ». (٣٦١)

---

(٣٦٠) البخاري في الأدب المفرد، وقال الألباني: صحيح الإسناد، أنظر صحيح الأدب المفرد (٣٧٧/١) برقم(٩٦٦/٧٤٧) باب مصافحة الصبيان.

(٣٦١) رواه الترمذي برقم(٩٦٩) وابن ماجه برقم(١٤٤٢) وأحمد٩٧/١ وانظر صحيح ابن ماجه ٢٤٤/١ وصحيح الترمذي ١/ ٢٨٦ وصحّحهُ أيضاً أحمد شاكر.

واتــە: ئەگــەر پیاوێــك ســەردانی بــرا موســڵمانەكەی بكــاتو نەخۆشییەكەی بەسەر بكاتەوە ئەوا وەك لێكەرەوەی میوەی بەناو باخێكی میوەی بەهەشـت دا دەڕوات هـەتا دادەنیشـێ (ئەمەنـدە چاكەی دەستگیر دەبێت، یان بە ڕێگایەكدا دەڕوات دەیگەیەنەتە بەهەشت). وەكاتێ دانیشت بەزەیی خوایی دای دەپۆشێتو دای دەگرێتەوە. وەئەگەر سەرەتای ڕۆژو بەیانی بێت حەفتا هەزار مەلائیكەت بۆی دەپاڕێنەوە هەتا ئێوارەی لـێدەبێتەوە. وەئەگەر ئێوارە بێت حەفتا هەزار مەلائیكەت بۆی دەپاڕێنەوە هەتا بەیانی لـێدەبێتەوە.

## نزاو پاڕانەوە بۆ نەخۆش لە كاتی سەردانی كردنیدا

١- پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر بچوایە بۆ سەردانی نەخۆشێك پـێی دەفـەرموو: (( لا بَأسَ طَهورٌ إن شآءَ الله )).[٣٦٢] واتـە هـیچ ناڕەحـەتی و ئازارێكت لەسـەر نییـە پاك دەبێتـەوە لـە گونـاه بـە ویستی خوای گەورە.

٢-( هیچ بەندەیەكی موسڵمان نییە كە سەردانی نەخۆشێك بكات كە ئەجەلی نەهاتبێو حەوت جار لەلایدا بڵـێ: (( أسألُ اللهَ العَظيمَ رَبَّ العَرشِ العَظيمِ أنْ يَشفِيَكَ )) ئیلا چاك دەبێتەوە).[٣٦٣]

---

(٣٦٢) البخاري مع الفتح ١١٨/١٠برقم(٣٦١٦).

(٣٦٣) أخرجـه الترمـذي بـرقم(٢٠٨٣) وأبـوداود بـرقم(٣١٠٦) وانظـر صـحيح الترمذي٢١٠/٢. وصحيح الجامع ١٨٠/٥برقم(٥٧٦٦).

تێبینی: دیارە ئەمەش بە مەرجێك خوای گەورە ئەم دوعایەی لێ قبوڵ بكات.

**واته: داوا ئەكەم لە خوای مەزنی پەروەردگاری عەرشی مەزن کە شیفات بدات.**

٣-(( اللَّهُـمَّ اشـفِ عَبْـدَكَ يَنْكَـأْ لَـكَ عَـدوّاً. أو يَمشـي لَـكَ إلـى جَنازَةٍ)). (٣٦٤)

**واته: خوایە شیفای بەندەکەت بدە تا دوژمنت بۆ بۆڕ بدات(بەوەی زۆریان لێ بریندارو کوژراو بخات). یان لەبەر تۆ بچێت بە دوای جەنازەیەکداو شوێنی بکەوێ.**

٤- (( بِسْمِ اللهِ أرقيكَ. مِنْ كُلِّ شَيءٍ يُؤذيكَ. وَمِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ أو عَينٍ حاسِدٍ اللهُ يَشفيكَ. بِسْمِ اللهِ أُرقيكَ )). (٣٦٥)

**واته: (خۆم پەنا ئەدەم)بە ناوی خواوە دوعات بۆ دەکەم لە هەموو شتێك کە ئەزیەتت دەدات و لە خراپەی هەموو نەفسێك یان چاوی حەسوود بەرێك کە حەسودیت پێ دەبات خوا شیفات بدات، بە ناوی خواوە دوعات بۆ دەکەم.**

٥- (( اللَّهُمَّ رَبَّ النّاسِ. إذهَبِ البَأْسَ وَاشفِ أنتَ الشّافِي. لاشِفاءَ إلاّ شِفاءُكَ. شِفاءاً لا يُغادِرُ سَقَماً )). (٣٦٦)

---

**(٣٦٤) صحيح سنن أبي داود(٢/٦٠٠) . وفي رواية: (( أو يَمشي لَـكَ إلى صـلاةٍ )) رواه أبوداود(٣١٠٧) والحاكم ٣٤٤/١. وقال: صحيح على شرط مسلم، وحَسّنهُ الألباني في صحيح الجامع برقم( ٤٤٦).**

**(٣٦٥) مسلم(١٧١٨/٤) عن أبي سعيد(رضي الله عنه).**

**(٣٦٦) البخاري مع الفتح (٢٠٦/١٠) ومسلم(١٧٢١/٤).**

**واتە: خوایە پەروەردگاری خەڵكی، ئەم ئازارە لابەرەو شیفای بدە خۆت شیفا دەری دەردانی، هیچ شیفایەك نییە جگە لە شیفای تۆ، شیفایەك كە هیچ نەخۆشییەك جێ ناهێڵێ.**

**٦- پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە سەعدی فەرموو:** «اللَّهُمَّ اشفِ سَعداً، اللَّهُمَّ اشفِ سَعداً، اللَّهمَّ اشفِ سَعداً ». (٣٦٧)

**واتە: خوایە شیفای سەعد بدەیت.**

**٧- خوێندنی سورەتی ﴿الإخلاص﴾ و ﴿الفلق﴾ و ﴿الناس﴾ و فوو كردن و دەست هێنان بە لاشەیدا.** (٣٦٨)

**٨-** «اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ، أَذْهِبْ الْبَاسَ، اشْفِهِ وَأَنْتَ الشَّافِي، لَا شِفَاءَ إِلاّ شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا ». (٣٦٩)

---

(٣٦٧) البخاري مع الفتح ١٠/١٢٠ ومسلم ٣/١٢٥٣.

(٣٦٨) عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر كەسێك لە خانەوادەكەی نەخۆش بووایە هەرسێ سورەتە (معوذات)ەكەی بەسەردا دەخوێندو فوی(یەكی بێ تەڕی) دەكرد پیایدا، بەڵام كاتێ نەخۆش كەوت ئەو نەخۆشی‌یەی كە تیایدا وەفاتی كرد من بەسەرمدا دەخوێندو بە دەستی خۆی دەستیم دەهێنا بە لاشەیدا، چونكە لە دەستەكانی من بەبەرەكەتتر بوون). صحیح مسلم (٧/ ١٦) برقم(٢١٩٢). وَفِي رِوَايَةِ يَحْيَى بْنِ أَيُّوبَ بِمُعَوِّذَاتٍ.

(٣٦٩) عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەندێك لە كەسوكارو خانەوادەكەی خۆی پەنا دەدا بە دوعاچارەكان بە جۆرێك دەستی ڕاستی پێدا دەهێناو دەیفەرمو:....). صحيح البخاري (رقم:٥٧٤٣). وفي رواية عنها قالت: كان رسولُ الله(ﷺ) إذا اشتكى منَّا إنسانٌ مسحه بيمينه ثم قال: وذكرتِ الدعاءَ، صحيح مسلم برقم(٢١٩١). وفي روايةٍ قالت: إنَّ رسولَ الله(ﷺ) كان يَرقي بهذه الرُّقية وذكر نحوه) صحيح مسلم برقم(٢١٩١).

**واتە: خوایە پەروەردگاری خەڵکی، ئەم ئازارە لابەرەو شیفای بدە خۆت شیفا دەری دەردانی، هیچ شیفایەك نییە جگە لە شیفای تۆ، شیفایەك کە هیچ نەخۆشییەك جێ ناهێڵێ.**

## نزاو پاڕانەوەی ئەو نەخۆشەی ئومێدبڕاو بووەو دەستی لە ژیان شتووەو بێزار بووە

**١-** (( اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارحَمْني، وَألحِقْني بالرَّفِيقِ الأعْلَى )).(٣٧٠)

**واتە: خوایە لێم خۆش بەو ڕەحمم پێبکەو بمگەیەنە بە هاوڕێیانی پلە بەرز.(٣٧١)**

**٢- لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی سەرەمەرگیدا هەردوو دەستی دەخستە ناو ئاوەوەو دەیسڕین بەدەمو چاویداو دەیفەرموو:** (( لا إلهَ إلاّ اللهُ، إنّ لِلمَوتِ سَكَراتٍ )).(٣٧٢)

---

**(٣٧٠) البخاري ١٠/٧ برقم(٤٤٤٠) ومسلم ١٨٩٣/٤برقم(٢٤٤٤).**

**(٣٧١) کە بریتین لە پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام)و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان. بڕوانە سورەتی(النساء: ٦٩).وە بڕوانە (قصص الأنبیاء)ی ابن کثیر لاپەڕە(٢١٠). هەندێکی تر ئەڵێن واتە بەهەشت. وەووتراوە مەبەست پێی: خوای گەورەیە.**

**(٣٧٢) البخاري مع الفتح ١٤٤/٨ برقم(٤٤٤٩). وە بە (...لَسَكَرات)یش هاتووە.**

**واته: هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە(الله) بە ڕاستی مردن ژانو ناڕەحەتی خۆی هەیە.**

٣- (( لا إلـهَ إلاّ الله وَالله أكْبَـرُ. لا إلـهَ إلاّ الله وَحْـدَهُ. لا إلـهَ إلاّ الله وَحْدَهُ لا شَريكَ لهَ. لا إلهَ إلاّ الله لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ. لا إلهَ إلاّ الله وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاّ بِالله )).(٣٧٣)

**واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە(الله)و خوا گەورەترە لە هەموو شتێك. هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە (الله)و تاكە. هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە (الله)و تاكو بێ هاوبەشە. هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە (الله)و هەموو موڵكو ستایش بۆ ئەوە. هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە (الله)و گۆڕانو توانا نییە مەگەر بەوەوە.**

---

(٣٧٣) هەركەسێك ئەمە بڵێ لە كاتی نەخۆشیداو پاشان بمرێت ئەوا لاشەی ئاگری دۆزەخ نایخوات/ أخرجه الترمذي(٣٤٣٠) وابن ماجه(٣٧٩٤) وصحّحهُ الألباني. وانظر صحيح الترمذي ٣/ ١٥٢. و صحيح ابن ماجه ٣١٧/٢. وفي رواية للنسائي: عن أبي هريرة وحده مرفوعا: من قال: (لا إله إلا الله والله أكبر، لا إله إلا الله وحده، لا إله إلا الله ولا شريك له، لا إله إلا الله له الملك وله الحمد، لا إله إلا الله، ولا حول ولا قوة إلا بالله) يعقدهن خمسا بأصابعه، ثم قال: من قالهن في يوم أو في ليلة أو في شهر ثم مات في ذلك اليوم أو في تلك الليلة أو في ذلك الشهر غفر له ذنبه). وصححه الألباني انظر صحيح الترغيب والترهيب ١٩٨/٣ برقم(٣٤٨١).

# نزاو پاڕانەوەی ئەو کەسەی جێگایەکی لەشی ئازاری هەیە ( نەخۆش بۆ خۆی )

**١-(دەستت بخەرە سەر ئەو شوێنەی ئازاری هەیە لە لەشت داو سێجار بڵێ:** (( بِسمِ اللهِ )) **وە حەوت جار بڵێ:** (( أعوذُ بِاللهِ وَقُدرَتِهِ مِنْ شَرِّ ما أجِدُ وأُحاذِرُ )).(٣٧٤)

**واتە: پەنا ئەگرم بە خوای گەورەو دەستەلآت و توانای لە خراپەی ئەو ئازارەی هەستی پێئەکەم و سڵی لێ دەکەمەوە.**

٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا): (أَنَّ رَسُولَ اللهِ(ﷺ)كَانَ إِذَا اشْتَكَى يَقْرَأُ عَلَى نَفْسِهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ وَيَنْفُثُ، فَلَمَّا اشْتَدَّ وَجَعُهُ كُنْتُ أَقْرَأُ عَلَيْهِ وَأَمْسَحُ بِيَدِهِ رَجَاءَ بَرَكَتِهَا).(٣٧٥)

---

(٣٧٤) عُثْمَانَ بْنِ أَبِى الْعَاصِ الثَّقَفِىِّ شەکوای هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە ئازارێک بە لاشەیەوەیەتی لەو کاتەوەی موسڵمان بووە پێوەیەتی، ئەویش فەرمووی..... /مسلم ٤/١٧٢٨برقم(٢٢٠٢). وە ابن ماجه(٣٥٢٢) وابوداود(٣٨٩١) ڕیوایەتیان کردووە بەلەفزی: (هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)و ئازارێکم هەبوو خەریك بوو بە هیلاکی دەبدم، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: بە دەستی ڕاستت حەوت جار دەستی پێدا بهێنەو بڵێ: (أعوذ بعزة الله وقدرته وسلطانه من شر ما أجد)، دەفەرموێت: منیش وام کرد ئیتر خوای گەورە ئازارەکەی نەهێشتم، منیش بە بەردەوام فەرمانم دەکرد بە کەسوکارم و غەیری ئەوانیش).صححه الألباني أنظر صحيح الترغيب والترهيب برقم(٣٤٥٣).

(٣٧٥) صحيح البخاري(٥٠١٦) ومسلم(٢١٩٢).

واتــە: پێغەمبــەری خــوا(ﷺ) ئەگــەر نــەخۆش بوایــە هــەر ســێ سورەتە(معوذات)ەکانی بەسەر خۆیدا دەخوێندو فوی بە خۆیدا دەکرد، کاتێ نەخۆشییەکەی توند بوو من بەسەریدا دەمخوێندو بە دەستی خۆی دەستیم دەهێنا بە لاشەیدا لەبەر بەرەکەتی دەستەکانی.

# چارەسەری برینداری و زام

(پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر مرۆڤێك ناساغ بووایەو ئازاری هەبووایە یان برینداری یان زامی پێوە بووایە پەنجەی ئاوا لێ دەکردو دەیفەرموو – وە سوفیان(کە ڕاوییەکە) پەنجەی شایەتمانی دەدا لە زەوی – پاشان بەرزی دەکردەوەو دەیفەرموو:

(( بِسمِ اللهِ، تُرْبَةُ أرضِنا، بِرِيقَةِ بَعْضِنا، يُشفَى سَقيمُنا، بِإذنِ رَبِّنا)).(٣٧٦)

واتە: (خۆم پەنا ئەدەم)بەناوی خوا، گڵ و خۆڵی زەوییەکەمان بەلیکی هەندێکمانەوە دەبێتە شیفا بۆ نەخۆش و ناساغەکانمان بە ئیزنی پەروەردگارمان.

( وە مانای فەرموودەکە وادەگەیەنێ کە هەندێ لە لیکی خۆی دەکرد بە پەنجەی شایەتمانیەوە، پاشان دەیخستە سەر گڵەکەو هەندێکی لێ هەڵدەگرتو دەیهێنا بەشوێنی برینداریيەکە، یان

(٣٧٦) البخاري مع الفتح١٠/٢٠٦. ومسلم ٤/١٧٢٤ برقم (٢١٩٤).

ناساغییەکەداو ئەم ووتەو نزایەی لەم حاڵەتی پێداهێنانەدا دەفەرموو ).[377]

# چارەسەری پێوەدراوی مارو دووپشك
# ( اللّسعَة واللّدغَة )

١- سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ دەخوێنی لەگەڵ کۆکردنەوەی تفی دەمت و تف کردنە سەر شوێنی پێوەدراوییەکە.[378]

٢- بە ئاوو خوێ شوێنی پێوەدراوییەکە مەسح بکە لەگەڵ خوێندنی سورەتی ﴿ قُلْ یا أیُّها الکافرونَ ﴾ و﴿ الفَلَق ﴾ و ﴿النّاس﴾.[379]

# چارەسەری ( تا )

**قال(ﷺ):** (( الحُمّى مِن فَيحِ جَهَنّمَ، فأبرِدوها بِالماءِ )).[380]

واتە: (تا) لە هاڵاوو لە پریشکی دۆزەخەوەیە ئەگەر تووشتان هات بە ئاو ساردی بکەنەوە.

---

(٣٧٧) انظر: شرح النووي على صحيح مسلم ١٨٤/١٤ وفتح الباري ٢٠٨/١٠وە بڕوانە ڕوونکردنەوەیەکی درێژی ئەم فەرموودەیە لە (زاد المعاد)١٨٦/٤-١٨٧.

(٣٧٨) البخاري مع الفتح ٢٠٨/١٠.

(٣٧٩) الطبراني في المعجم الصغير ٨٣٠/٢ ، وانظر مجمع الزوائد ١١١/٥ وحَسَّنَ إسناده.

(٣٨٠) البخاري مع الفتح ١٧٤/١٠ ومسلم ١٧٣٣/٤.

# تەڵقین دادانی کەسێك کە لەسەرەمەرگدا بێت

(( مَنْ كـانَ آخِرُ كَلامِـهِ لآ إلـهَ إلاّ اللهُ دَخَـلَ الجَنـةَ )).[381] **واتـە: هـەر کەسـێك کۆتـا ووتـەی لـە دونیـادا** (لآ إلــهَ إلاّ الله) **بێـت دەچـێتە بەهەشتەوە.**

---

(381) أبوداود ٣/١٩٠ برقم(٣١١٦) وانظر صحيح الجامع ٤٣٢/٥ برقم(٦٤٧٩). وفي رواية: (( مَنْ كانَ آخرُ كَلامِهِ مِنَ الدنيا...)) رواه أبوداود(٣١١٦) والحاكم ٣٥١/١، وحَسَّنَهُ الألباني في إرواء الغليل برقم(٦٨٧). ورواه مسلم بلفظ: (( لَقّنوُا مَوتاكُم لا إلهَ إلاّ الله)) مسلم ٢١٩/٦ عن أبى سعيد وفى رواية عن أبي هريرة. وابن حبان(٧١٩) موارد بلفظ: ( لَقّنوُا مَوتاكُم لا إلهَ إلاّ اللهَ فإنهُ مَنْ كانَ آخرُ كَلامِهِ لا إلهَ إلاّ الله دَخَلَ الجَنّة يَوماً مِنَ الدَّهرِ وَإنْ أصابَهُ قَبْلَ ذلك ما أصابَهُ) انظر احكام الجنائز /١٠. واتە: تەڵقینی ئەو کەسانەتان بکەن کە لەسەرە مەرگدان بە وتنی (لا إلـهَ إلاّ الله) تا بیڵێن چونکە هەرکەسێك کوتا ووشەی (لا إلـهَ إلاّ الله) بێت دەچێتە بەهەشتەوە هەر ڕۆژێك بێ ئەگەرچی پێش ئەوە تووشی ئەوەببێ کە تووشی دەبێ لە سزا.

تێبینی(١): ابن حجر(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (مەبەست بە (لا الـه الا الله) لەم فەرمودەیەو غەیری ئەم فەرمودەیەشدا بریتی لە هەردوو ووشەی شایەتومانەکە). فتح الباري لابن حجر (٢٦٠/٤).

کرمانی فەرمویەتی: (کە دەفەرموێت (لا اله الا الله) واتە ئەم ووشەیەو هاوبەشەکەی کە بریتییە لە (محمد رسول الله). عمدة القاري شرح صحيح البخاري١١٤/١٢.

تێبینی(٢): ئیمامی نەوەوی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: ( لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه ) واتە: بە مانای ئەو کەسەی لە سەرەمەرگدایە، وە مەبەست پێی بیری (لا اله الا الله) ی بخەنەوە تا کۆتا ووشەی بێت چونکە هەروەك لە فەرمودەدا هاتووە (هەر کەسێك کۆتا ووشەی لا اله الا الله بێت دەچێتە بەهەشتەوە)، فەرمان کردن بەم تەلقین کردنەش ئەمرێکی نەدبە، وە هەموو زانایان لەسەر ئەم تەلقینە یەکدەنگن. وە بە مەکروهیان داناوە کە زۆر بە دوای یەکدا لێی دووبارە بکرێتەوە نەبا بەهۆی تەنگی حاڵ و قورسی ناڕەحەتییەوە وەڕست بێت و بە دڵ ئەمەی پێ ناخۆش بێت و قسەیەکی نالایەق بکات، وە ووتویانە: ئەگەر یەکجار نەخۆشەکە ووتی نابێت لێی

دووباره بكرێتەوە مەگەر بەدوایدا قسەیەكی تربكات ئەو كات بە ناڕاستەوخۆ پێی دەوترێتەوە هەتا ببێتە كۆتا قسەو ووشەیەك كە دەیكات./ شرح النووي على مسلم (٣٢٧/٣) حديث رقم(١٥٢٣).

تێبینی(٣): ئەمە مانای ڕاستەقینەی تەڵقینە، بەڵام ئەوەی كە لەم زەمانەدا هەندێك بۆ مردووی دەكەن بیدعەیەو دروست نییە:

شێخ ئەلبانی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (بەڵام تەڵقین دادانی دوای مردن لەگەڵ ئەوەی ئەم كارە بیدعەیەو لە سوننەتدا نەهاتووە هیچ سوودێكیشی نییە، چونكە كەسەكە لە خانەی تەكلیفەوە دەرچووە بۆ خانەی پاداشت، وە لەبەر ئەوەی تازە قابیلی بیرخستنەوە نییە خوای گەورە دەفەرموێت: (لتنذر من كان حيا). جا شێوازی تەڵقینەكە بەوەیە كە فەرمانی پێ بكرێت شایەتوومان بڵێت. وە ئەوەی لە هەندێك كتێبدا هاتووە كە گوایە دەبێت لە لایدا بوترێت و بیری بخرێتەوەو نابێت فەرمانی پێ بكرێت بە ووتنی پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) هەروەك تەحقیقی ئەمەم كردووە لە (كتاب الجنائز)دا ص١٠-١١ بگەڕێرەوە بۆی./ السلسلة الصحيحة ٧٥٧/١ رقم الحديث(٤٦٧).

تێبینی(٤): ئەو تەڵقین دادانەی ئەمڕۆ دەكرێت بیدعەیەو فەرمودەكەی زۆر ضەعیفەو دروست نییە كاری پێ بكرێت، ئەم زانایانە بە ضەعیفیان داناوە: ابن القيم(زاد المعاد)٢٠٦/١ ابن صلاح(الأذكار ص١٣٨)، والنووي(المجموع٢٥٧/٥) والحافظ العراقي(تخريج الأحياء٤٢٠/٤) و ابن حجر(فتح الباري٥٦٣/١٠).

وە الصنعاني دەفەرموێت: (لە ووتەی پێشەوایانی تەحقیقەوە دەردەكەوێت كە فەرمودەیەكی ضەعیفەو كاركردن پێی بیدعەیەو سەرت لێ تێك نەچێت بە زۆری ئەو كەسانەی كاری پێ دەكەن). سبل السلام١٥٧/٢.

شێخ ئەلبانی دەفەرموێت: (بە لای منەوە ئەو فەرمودەیە مونكەرە ئەگەر مەوضوع نەبێت). السلسلة الضعيفة٦٥/٢.

تێبینی(٥): شێخ ئەلبانی دەفەرموێت: (وە خوێندنی سورەتی (یاسین) لەلای كەسێك لەسەرەمەرگدا بێت و ڕووی كردنە قیبلە هیچ فەرمودەیەكی صەحیحی لە بارەوە نەهاتووە. بگرە سەعیدی كوڕی المسيب بە مەكروهی زانیوە ڕوی بكرێتە قیبلە./ احكام الجنائز١١/١.

# ئەگەر تووشی موسیبەتێك بوو( كەسێكی مرد )

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿.... وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴿١٥٧﴾﴾.(البقرة: ١٥٥-١٥٧)

**واتـە: ... جـا مـژدە بـدە بـەو كەسـانەی خـۆگرو ئـارامگرن، كـە ئەوانەن هەر كاتێك تووشی بەڵاو ناخۆشیەك دەبن دەڵـێن: ئێمـە مـوڵكی خـواین و هەرچـی هەمانـە بەخششـی خوایـە، سـەر ئەنجامیش تەنها هەر بۆ لای ئەو زاتەیە گەڕانەوەمان. ئا ئەوانـە چەندەها ستایش و ڕەحمـەت و میهرەبـانی هـەر بەسـەر ئەوانـدا دەبارێت لەلایەن پەروەردگاریانەوە و ئەوانە ئەو كەسانەن ڕێبازی هیدایەتیان وەرگرتووە.**

**١-** (( ﴿ إِنّا للهِ وَإِنّا إِليهِ راجعونَ﴾ اللَّهُمَّ اجُرْني في مُصيبَتي وَأخلِفْ لي خَيراً مِنها )).(٣٨٢)

**واتـە: ئێمـە مـوڵكی خـواین و بـۆ لای ئـەو دەگەڕێینـەوە. خوایـە پاداشـتم بدەیتـەوە لـەم موسـیبەتەمداو كەسـێكی باشـترم بـۆ بخەرەوە جێگەی.**

---

**(٣٨٢) هــیچ بەندەیــەك(ی موســڵمان) نیـیــە كــە موســیبەتێكی تــووش ببــێ و بڵێ:......فەرموودەكە...ئیلا خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە لە موسیبەتەكەیداو كەسێكی چاكتری لە پاش ئەو بۆ دەخاتە شوێنی/ مسلم ٦٣٢/٢ برقم(٩١٨).**

**٢- یان بڵێ:** (( اللَّهُمَّ اغفِرْ لي وَلَهُ. وأعقِبني مِنهُ عُقْبىَ حَسَنةً )).[٣٨٣]
**واته: خوایه له من و له ئەویش(مردووەکە) خۆش ببەو کەسێکی چاکم بۆ بخەرەوە شوێنی.**

## له كاتی داخستنی چاوی مردوویەك دا

(( اللَّهُمَّ اغفِرْ لِفُلان **(ناوەکەی دەڵێی)** وَارفَعْ دَرَجَتَهُ في المَهديِّينَ.وَاخلُفْهُ في عَقِبهِ في الغابِرينَ. وَاغفِر لَنا وَلَهُ يا ربَّ العالمينَ، وَافسَح لَهُ في قَبرِهِ وَنَوِّر لَهُ فِيهِ )).[٣٨٤]

**واته: خوایه له فڵانەکەس خۆش ببەو پلەی بەرزبکەرەوە له ناو ڕێنمویی کراوانداو له پاش ئەو کەسێکی دڵسۆز جێ بهێڵە بۆ کەس وکاری و زیندووەکاندا بیکەرە جێنشینی. وە له ئێمەو لەویش خۆش ببە ئەی پەروەردگاری جیهانیان و گۆڕەکەی بۆ فراوان بکەو بۆی ڕۆشن و نوردار بکه.**

---

(٣٨٣) مسلم برقم(٢١٦٨) والترمذي والنسائي. انظر صحيح الترغيب والترهيب٣/٢٠١ برقم(٣٤٨٩).

(٣٨٤) مسلم ٢/٦٣٤برقم(٩٢٠).

# ئاوات نەخواستنی مردن

(هیچ کەسێك لە ئێوە ئاواتی مردن نەخوازێ( بە هۆی ناڕەحەتییەکەوە کە تووشی هاتووە).[٣٨٥] ئەگەر هەردەبوو بیڵێ با بڵێ: (( اللَّهُمَّ أحييني ما كانَتِ الحَياةُ خَيراً لِي. وَتَوَفَّني إذا كانَتِ الوَفاةُ خيراً لِي )).[٣٨٦]

واتە: خوایە بمژێنە هەتا ئەو کاتەی ژیان چاکە بۆم و بممرێنە ئەگەر مردن خێری تێدا بوو بۆم.

# نوێژی مردوو

نوێژی مردوو فەرزی کیفایەیە ( واتە ئەگەر چەند کەسێك ئەنجامی بدەن لەسەر موسڵمانان لادەچێو بە نەکردنی هەموو موسڵمانانی ئەو ناوچەیە گوناهبار دەبن)وە ئەم نوێژە کوڕنوش و چەمینەوەی تێدا نییە. ڕاسترین شێوەی چوار تەکبیر( الله أكبر)ە، وە پێنج تەکبیر تا نۆ تەکبیر کردن هاتووە.

---

(٣٨٥) دروست نییە موسڵمان ئاواتی مردن بخوازێ. لەبەرئەوەی چاکترین کەس ئەوکەسەیە کە تەمەنی درێژ بێت وکرداری چاکی زۆر بێت.وە تا گوناه کەم بکاتەوەو پەشیمان ببێتەوە لێی. هەروەها لەبەر سەختیو ناڕەحەتی مردن و ژیانی ناو گۆڕ. بەڵام ئەگەر موسڵمان لە دین و ئیمانی ترسی هەبوو کەزیانی پێ بگات لەکاتی زۆربوونی فیتنەو ئاشووبەدا، ئەوا ئەو کاتە دروستە ئاواتی مردن بخوازێت تا ژینی کۆتایی پێ بێت بەڵام دینی سەلامەت بێت.

(٣٨٦) البخاري ١٠/١٠٨،١٠٧ ومسلم (٢٦٨٠).

وە ئەصڵ وەهایە تەنها لە تەکبیری یەکەمی نوێژ دابەستندا دەست بەرز بکرێتەوە.

ڕوو بە(قیبلە) دەوەستێت و مردووەکە لەبەردەم خۆیدا دادەنێ‌و ئەگەر مردووەکە پیاو بوو لەلای سەرییەوەو ئەگەر ئافرەت بوو لەلای ناوەڕاستیدا دەوەستێو تەکبیری دابەستن دەکاو دەست بەرز دەکاتەوەو پاشان دەست دەگرێ‌و سورەتی ﴿ الفاتِحة ﴾و سورەتێکی تر دەخوێنێت بەبێ دوعای دەست پێکردن (الإستفتاح)، وە تەکبیری دووەم دەکات و صلاوات دەدات لەسەر پێغەمبەر(ﷺ).

وە لە دوای تەکبیری سێیەم و چوارەم و...هتد دەپاڕێتەوە بۆ مردووەکە بەو پاڕانەوەی کە ئێستا پێی دەگەین. وە بە دەنگی نزم ئەم نوێژە دەکرێت ئەگەر ئیمام بوو، مەگەر لەبەر فێرکردنی خەڵکەکە دەنگ بەرز بکاتەوەو سلاویش دەداتەوە هەر بە دەنگی نزم بە جۆرێك تەنها دوای خۆی بیبیستن و بە یەك سلاویش دەتوانێت سلاوبداتەوە( واتە بە یەك لادا)، بەلام لە سێ کاتدا ئەم نوێژە دروست نییە مەگەر لەبەر ناچاری:( کاتێ خۆر هەڵدێ تا بەرز دەبێتەوە بە تەواوی) وە ( کاتێك خۆر دەچێتە ناوەڕاستی

ئاسمان تا لادەدات) وە ( کاتێك خۆر سەر دەبات بۆ ئاوا بوون تا ئاوا دەبێت).[٣٨٧] وە هەتا نوێژکەران لەسەری زۆربن چاکترە، لەو فەرموودانەش کە باسی ئەمە دەکات:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (( هەر مردوویەك گرۆیەك لە موسڵمانان لەسەری نوێژ بکەن و ژمارەیان بگاتە سەد کەس و تکای بۆ بکەن لە خوا، خوای گەورە پاڕانەوەو تکایان وەردەگرێ)).[٣٨٨]

وە دەفەرموێت(ﷺ): (( هەر پیاوێکی موسڵمان بمرێت و لەسەر جەنازەکەی چل پیاوی یەکتاپەرست بوەستن کە هاوەڵیان هیچ بۆ خوا دانەنابێ، ئیلا خوای گەورە تکایان وەردەگرێت )).[٣٨٩]

وە دەفەرموێت(ﷺ): (( هەر کەسێك سێ ڕیز لە خەڵکی لەسەری نوێژ بکات، بەهەشتی بۆ واجب دەبێت )).[٣٩٠]

---

(٣٨٧) بڕوانە درێژەی ئەمە بەبەڵگەکانییەوە لە(أحكام الجنائز)ی ئەلبانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت).

(٣٨٨) صحيح مسلم بشرح النووي – كتاب الجنائز – ٢١/٧ رقم (٩٤٧) والجامع الصغير للترمذي ٣٤٨/٣ رقم (١٠٢٩) وە لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ...ئەوا خوای گەورە لێی خۆش دەبێ.

(٣٨٩) شرح صحيح مسلم ٢١/٧-٢٢ رقم (٩٤٨) وصحيح ابن ماجه (١٤٨٩).

(٣٩٠) رواه ابوداود (٣١٦٦) والترمذي (١٠٢٨) وقال: حديث حسن. واخرجه ابن ماجه(١٦٩٠) ومسند أحمد ٧٩/٤ وصححه الحاكم في المستدرك ٣٦٢/١ ووافقه الذهبي.

# پاڕانەوە بۆ مردوو لە نوێژی مردوودا

١- (( اللَّهُمَّ اغفِرْ لَهُ. وَارْحَمْهُ. وَعافِهِ وَاعفُ عَنْهُ. وَأكرِمِ نُزُلَهُ. وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ. وَاغسِلْهُ بِالماءِ وَالثَّلجِ وَالبَرَدِ. وَنَقِّهِ مِنْ الخَطايا كما نَقّيتَ الثَّوبَ الأبيضَ مِنَ الدَّنسِ. وأبدِلْهُ داراً خَيراً مِنْ دارِهِ. وَأهلاً خيراً مِنْ أهْلِهِ. وَزَوجاً خيراً مِنْ زَوجِهِ. وأدخِلْهُ الجَنّةَ. وَأعِذهُ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ {وَعَذَابِ النّار} )).(٣٩١)

**واتە: خوایە لێی خۆش ببەو ڕەحمی پێ بکەو بیپارێزە(لە ناڕەحەتی)و لێی ببورەو لەشوێنگەو میواندارییەکی ڕێز لێگیراو (لە بەهەشت) داینێو (گۆڕەکەی و جێگای بەهەشتی) بۆ فراوان بکەو بەئاوی بارانوبەفرو تەرزە بیشۆرەو لە گوناه پاکی بکەرەوە هەروەك چۆن پۆشاکی سپی پاك دەبێتەوە لە چڵك. وە ماڵەکەی بۆ بگۆڕە (لە بەهەشتدا) بەخانەیەکی خۆش تر لەوەی دونیای و کەسوکارێکی بدەرێ لە کەسو کارەکەی چاکترو هاوسەرو خێزانێکی بدەرێ لەهاوسەرەکەی باشترو بیخەرە بەهەشتەوەو پەنای بدە لە سزای گۆڕو سزای ئاگری دۆزەخ.**

---

(٣٩١) لەعەوفی کوڕی مالکی ئەشجەعیەوە(رضي الله عنه) دەفەرموێ: ... ئاواتم ئەخواست کە ئەو مردووە من بم.لەبەرئەم پاڕانەوەیەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەری پاڕایەوە/مسلم ٢/٦٦٣برقم(٩٦٣).

٢- (( اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنا. وَمَيِّتِنا. وَشاهِدِنا. وَغائِبِنا. وَصَغِيرِنا وَكَبِيرِنا. وَذَكَرِنا. وَأُنثانا. اللَّهُمَّ مَنْ أحيَيتَهُ مِنّا فأحْيِهِ عَلَى الإسلامِ. وَمَنْ تَوَفَّيتَهُ مِنّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الإيمانِ. اللَّهُمَّ لا تَحْرِمْنا أجرَهُ وَلا تُضِلَّنا بَعْدَهُ )).(٣٩٢)

**واته: خوایه خۆش ببه له زیندوو و مروودمان و له ئامادەو نائامادەمان و بچووك و گەورەمان و نێرو مێمان. خوایه هەركەسێكمانت ژیاند لەسەر ئیسلام بیژێنەو هەركەسێكمانت مراند لەسەر ئیسلام بیمرێنه. خوایه له پاداشتی (ئارامگرتنمان لەسەر) ئەم موسیبەته(و شۆردن و ئەسپەردەكردنی ئەم مردووه) بێبەشمان مەكەو لەدوای بردنەوەو له دەستدانی ئەم كەسه سەرلێشێواو و گومڕامان مەكە.**

٣- (( اللَّهُمَّ إنّ فُلانَ بنَ فُلانٍ في ذِمّتِكَ. وَحبلِ جِوارِكَ. فَقِهِ مِنْ فِتْنَةِ القَبْرِ وَعَذابِ النّارِ. وَأَنْتَ أهلُ الوَفآءِ وَالحَقِّ. فاغْفِرْ لَهُ وَارحَمْهُ إنّكَ أنْتَ الغَفُوُرُ الرَّحِيمُ )).(٣٩٣)

**واته: خوایه فلانی كوڕی فلان له ژێر ئەمانەت و پەیمان و پارێزگاری تۆدایەو له ژێر پەیمان و ئەمانەتی تۆدایه. له ئاشوبەی گۆڕو سزای ئاگر بیپارێزه. وه تۆ خاوەنی وەفاو ڕەواییت. ساخوایه لێی خۆش ببەو بەزەیت پێیدا بێتەوه بەڕاستی تۆ لێبووردەو بەبەزەیی و میهرەبانیت.**

---

(٣٩٢) ابن ماجه ٤٨٠/١ برقم(١٤٩٨) وأبوداود برقم(٣٢٠١) والترمذي برقم(١٠٢٤) والنسائي برقم(١٩٨٨) وأحمد ٣٦٨/٢ وانظر صحيح ابن ماجه ٢٥١/١.

(٣٩٣) أخرجه ابن ماجه برقم(١٤٩٩) وأبوداود٢١١/٣ أنظر صحيح ابن ماجه٢٥١/١.

٤- (( اللَّهُـمَّ عَبْدُكَ وَابـنُ أمَتِكَ. احتاجَ إلى رَحْمَتِكَ. وَأنـتَ غَنِيٌّ عَـنْ عَذابِهِ. إنْ كانَ محُسِناً فَزِدْ في حَسَناتِهِ. وَإنْ كانَ مُسِيئاً فَتَجاوَزْ عَنْهُ)).

**پاشان ئەوەندەی خوای گەورە ویستی بێت دەپاڕێتەوە.(٣٩٤)**

**واتە: خوایە ئەمە بەندەتەو نەوەی کۆیلەتە پێویستی بەبەزەیی تۆیە. وە تۆش دەوڵەمەندو بێنیازی لە سزادانی. ساخوایە ئەگەر چاکەکارە ئەوا لەچاکەکانی زیاد بکەو ئەگەر خراپەکارە لێی ببورە.**

٥- ((اللَّهُمَّ إِنَّهُ عَبْدُكَ، وَابْنُ عَبْدِكَ، وَابْنُ أَمَتِكَ، كَانَ يَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ أَنْتَ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ، وَأَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ، اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ مُحْسِنًا فَزِدْ فِي إِحْسَانِهِ، وَإِنْ كَانَ مُسِيئًا فَتَجَاوَزْ عَنْ سَيِّئَاتِهِ، اللَّهُمَّ لا تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ، وَلا تَفْتِنَّا بَعْدَهُ)).(٣٩٥)

---

**(٣٩٤) أخرجه الحاكم وصحَّحَهُ ووافقه الذهبي ٣٥٩/١ ، ورواه الطبراني في (الكبير) بالزيادة كما في (المجمع) (٣٤/٣٣/٤) وصححه الألباني انظر أحكام الجنائز ص ١٢٥.**

**(٣٩٥) پرسیاریان کرد لە ابوهورەیرە چۆن نوێژ لەسەر جەنازە دەکەیت؟ فەرموی: سوێند بە خوا هەواڵتان دەدەمێ: لە ماڵەوە شوێن جەنازەکەی دەکەوم و کاتێ دانرا بۆ نوێژ لەسەر کردنی تەکبیر دەکەم و سوپاسی خوای گەورە دەکەم و پاشان صەلأوات دەدەم لەسەر پێغەمبەرەکەی(ﷺ)و پاشان دەڵێم: ...../ أخرجه مالك (١-٢٢٧) وعنه محمد بن الحسن (١٦٤-١٦٥) وإسماعيل القاضي في (فضل الصلاة ﷺ) رقم ٥ (٩٣)٢٧ وسنده موقوف صحيح جدا، وقد ساق الهيثمي منه الدعاء مرفوعا من حديث أبي هريرة وقال: رواه أبو يعلى ورجاله ورجال الصحيح. وصححه الألباني أنظر فضل الصلاة على النبي(ﷺ)٧٨/١ برقم(٩٣).**

**واتە: خوایە ئەمە بەندەتە و کوڕ بەندەو کۆیلەتە، ئەو شایەتی دەدا بەوەی هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە تۆ، وە محمد(ﷺ) بەندەو نێردراوی تۆیە، وە خۆشت زاناتری پێی، خوایە ئەگەر چاکەکار بووە چاکەکانی بۆ زیاد بکەو ئەگەر خراپەکاریش بووە لێی ببورە، خوایە لە پاداشتی بێ بەشمان مەکەو لە دوای ئەویش توشی تاقیکردنەوەمان مەکە.**

## پاڕانەوە بۆ( کۆرپە ) لە نوێژی مردوودا لەسەری

**١-** (( اللَّهُمَّ أعِذْهُ مِنْ عَذابِ القَبرِ )).[٣٩٦]

**واتە: خوایە پەنای بدە لە سزای گۆڕ.**

**٢-** (( اللَّهُمَّ اجعَلْهُ لَنا فَرَطاً. وَسَلَفاً. وَأجراً )).[٣٩٧]

**واتە: خوایە بۆمان بکەرە پاداشتێك لە پێشمانەوە بڕوات و بیکەرە پێشڕەوێك بۆ بەهەشت و پاداشت بۆمان.**

---

(٣٩٦) (سەعیدی کوڕی المسیَّب دەفەرموێ: لە دوای ئەبی هورەیرەوە نوێژم کرد کە لەسەر منداڵێك نوێژی دەکرد کە هەرگیز گوناهی نەکردبوو گوێم لێ ی بوودەیفەرموو... ... فەرموودەکە). أخرجه مالك في الموطأ ٢٨٨/١ وابن أبي شيبة في المصنف ٢١٧/٣ والبيهقي ٩/٤. وصحَّحَ اسناده شعيب الارناؤوط في تحقيقه لشرح السنة للبغوي ٣٥٧/٥. وهو حسن (أحكام الجنائز) للالباني ص ١٦١.

(٣٩٧) أخرجه البغوي في شرح السنة ٣٥٧/٥ وعبدالرزاق برقم ٦٥٨٨. وعَلّقَهُ البُخارِي في كِتاب الجَنائِز ٦٥ باب قراءة فاتحة الكتاب على الجنازة ١١٣/٢.وهذا اثر عن الحَسَنِ البصري(رحمه الله).

## بۆ دڵ دانەوەی کەس و کاری مردوو( دُعآء التَّعزِيَة )و هاندانیان لەسەر ئارامگری

(( إنّ للهِ ما أخَذَ. وَلَهُ ما أعطى. وَكُلُّ شَيءٍ عِندَهُ بِأجَلٍ مُسَمَّىً... فلتَصْبِرْ وَلتَحْتَسِبْ )).(٣٩٨)

**واتە: خوا خاوەنی ئەو شتەیە کە دەیباتەوەو خاوەنی ئەوەشە کە دەیبەخشێ، وە هەموو شتێك لە لای ئەو (لە بردنەوەو بەخشین)بەکات و بە ئەجەلێکی دیاری کراوە، سا ئارام بگرەو ڕازی بە بەم تاقیکردنەوەو موسیبەتە بە نیازی پاداشت لە خوای گەورە.**

## خواردن ناردن بە دیاری بۆ کەس و کاری مردووەکە

عَن عَبدالله بِن جَعفَر قالَ: قالَ رسول الله(ﷺ): (( إصنَعوا لآلِ جَعْفَرٍ طَعاماً، فإنّهُ قد أتاهُم أمرٌ شَغَلَهُم )).(٣٩٩)

**عبدالله ی کوڕی جەعفەر دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: خواردنێك دروست بکەن بۆ کەس و کرای جەعفەر**

---

(٣٩٨) البخاري ٢/٨٠ برقم(١٢٨٤) ومسلم ٢/٦٣٦برقم(٩٢٣).

(٣٩٩) أخرجه أبوداود ٣/٤٩٧ وابن ماجه ١/٥١٤ والترمذي ٣/٣٢٣ وقال: حديث حسن صحيح. وحسنه الألباني في المشكاة(١٧٣٩).

چـونکه شـتێکیان بەسـەر هـاتووە کـە بـە ڕاسـتی سـەرقاڵی کردوون.[400]

## ئەگەر مردووت خستە گۆڕەکەی

بڵێ: (( بِسمِ اللهِ. وَعلى سُنَّةِ رَسُولِ اللهِ )).[401]

واتە: (خۆم پەنا ئەدەم)بە ناوی خوای گەورە. وە لەسەر ڕێڕەوو شەریعەت و سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

## پاڕانەوە دوای ناشتنی مردوو

(( اللَّهُمَّ اغفِرْ لَهُ ، اللَّهُمَّ ثَبِّتْهُ )).[402]

واتە: خوایە لێی خۆش بە، خوایە چەسپاوو دامەزراوی بکە( لە کاتی وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی ناو گۆڕ).

---

(٤٠٠) ئەمەیش لە کاتێکدا فەرمووی کە جەعفەری کوڕی ئەبی طالب(خوای لێ ڕازی بێت) لەجەنگی(مؤتە)دا شەهید بوو.

(٤٠١) أبوداود ٣/٣١٤ برقم(٣٢١٣) بَسَندٍ صَحِيح. وأحمد٢/٤٠ بلفظ: (( بسمِ اللهِ، وَعَلَى مِلّةِ رَسولِ الله )) وسنده صحيح.واتە: (خۆم پەنا ئەدەم)بەناوی خواو لەسەر میللەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ). وانظر (صحيح الترمذي) ١/٣٠٦.

(٤٠٢) پێغەمبەر (ﷺ) کە تەواو دەبوو لە ناشتنی مردوو لەسەری(واتە لە نزیکی گۆڕی مردووەکە) ڕادەوەستاو دەیفەرموو:(( داوای لێخۆشبوونو دامـەزراوی بکـەن بـۆ براکـەتان. چـونکە بەڕاسـتی ئێسـتا پرسـیاری لـی دەکرێـت )). ابـوداود ٣/٣١٥ برقم(٣٢٢١) والحاكم وصحَّحَه ووافقه الذهبي ١/٣٧٠.

# لەكاتی سەردانی گۆڕستان دا

١-(( السّلامُ عَلَيكُمْ أهلَ الدّيارِ. مِنَ الـمُؤمِنينَ وَالمُسلِمِينَ. وإنّا إنْ شآءَ اللهُ بِكُم لَلاحِقونَ، {وَيَرحَمُ اللهُ المُستقدِمينَ مِنّا وَالمُستَأْخِرينَ}، أسألُ اللهَ لَنا وَلَكُمُ العافِية )).(٤٠٣)

**واتە: سڵاوتان لێ بێت خاوەنی خانەكان لە ئیمانداران و موسڵمانان ئێمەش بە ویستی خوای گەورە دەگەین پێتان. خوا بەزەیی بە پێشكەوتوەكانمان و دواكەوتەكانماندا بێتەوە. لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە ئێمەو ئێوەش بپارێزێ.**

٢- ((السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ {بِكُمْ} لَلاَحِقُونَ، {أَنْتُمْ لَنَا فَرَطٌ، وَنَحْنُ لَكُمْ تَبَعٌ}، أَسْأَلُ اللَّهَ لَنَا وَلَكُمُ الْعَافِيَةَ)).(٤٠٤)

---

(٤٠٣) مسلم ٦٧١/٢برقم(٩٧٥) وابن ماجه واللفظ له ٤٩٤/١ برقم(١٥٤٧) عن بريدة (رضي الله عنه) وفي رواية:(السلام على أهل الديار..) وە نێوان دوو كەوانەكە لەو فەرموودەیە كە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیگێڕێتەوە لە مسلم ٦٧١/٢ برقم(٩٧٤). وە بەم لەفزەش هاتووە: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لاَحِقُونَ). مسلم برقم(٢٤٩).

(٤٠٤) قال الألباني: أخرجه مسلم (٦٥/٣) والنسائي وابن ماجه، وكذا ابن أبي شيبة وابن السني في (٥٨٢) والبيهقي وأحمد ، والزيادتان لهم جميعا حاشا ابن ماجه ومسلما. والزيادة الثانية، أخرجها ابن أبي شيج من حديث علي وإسناده صحيح، ومن حديث سلمان (وإسناده حسن) وكلاهما موقوف عليهما./ أنظر احكام الجنائز(١/١٩٠).

**واتــە: ســڵاوتان لێ بێــت خــاوەنی خانــەکان لــە ئیمانــداران و موسڵمانان، ئێمەش بە ویستی خوای گەورە دەگەین پێتان. ئێوە پێشینەی ئێمەن پێشمان کەوتوون و ئێمەش بە دواتاندا دێین. لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە ئێمەو ئێوەش بپارێزێ.**

---

**تێبینی:**

١-داوای لێخۆشبوون کردن بۆ کەسێك لەسەر بێ باوەڕێتی مردبێت دروست نییە/ سورەتی (التوبە) ئایەتی ١١٣. وە بڕوانە أحکام الجنائز ص,٩٦

٢-دروست نییە سلاو بکرێت لە گۆڕی بێ بڕواو بۆی بپاڕێیتەوە، بەڵکو پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی کردووە: (حَيْثُمَا مَرَرْتَ بِقَبْرِ كافر فَبَشِّرْهُ بِالنَّارِ) واتە: هەر کاتێك بە لای گۆڕی بێ بڕوایەکدا ڕەت بوین مژدەی دۆزەخی پێ بدە ( بەو مەرجەی دڵنیابین لەوەی بە بێ بڕوایی مردووە). السلسلة الصحيحة١/٢٥ برقم(١٨). وانظر أحكام الجنائز ص١٩٨..

شێخ ئەلبانی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: وە لەم فەرمودەیەدا فائیدەیەکی گرنگی تیایە کە زۆربەی کتێبەکانی فیقهـ باسیان نەکردووە ئەویش دروستی مژدەدانی بێ باوەڕە بە ئاگر کاتێ بە لای گۆڕەکەیدا ڕۆیشتی، وە شاراوە نییە کە حیکمەتی ئەمەش ڕاچڵەکاندنی ئیماندارو بیرخستنەوەیەتی بە سامناکی تاوانی ئەو کافرە کە چ گوناهێکی گەورەی ئەنجامداوە بەجۆرێك هەموو گوناهەکانی دونیا ئەگەر کۆشبکرێنەوە لە بەرامبەر ئەو گوناهەدا بچوکترە، ئەویش کوفرو شیرك ئەنجامدانە بەرامبەر خوای گەورە). السلسلة الصحيحة١/١٧ رقم الحديث (١٨)

٣- قورئان خوێندن لە کاتی سەردانی گۆڕستاندا(جا سورەتی الفاتحە بێت یان غەیری ئەو) هیچ بنچینەیەکی نیە لە سوننەتدا بەڵکو سەلام کردن و دوعا کردن بۆ مردووەکە هاتووە، بە پێچەوانەشەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمویەتی: ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان(بەوەی قورئانی تێدا نەخوێنن). بۆ درێژەی ئەمە بڕوانە احکام الجنائز١/١٩١.

وە مەکروهە بە پێلاوەوە بە گۆڕستاندا بڕوات/ابوداود برقم(٣٢٣٠) والنسائي٤/٩٦ وابن ماجه برقم(١٥٦٨) وصححه الألباني. الارواء (٧٦٠) وأحكام الجنائز ص١٩٩.

## بەشی حەوتەم:

# هەندێ كاتی تری جیاواز

## لە كاتی هەڵكردنی( بـــا )دا

١- (( اللَّهُمَّ إنّي أسأَلُكَ خيرَها. وَأعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّها )).[405]

**واتــە: خوایــە داوای چـاكی و خێرەكـەیت لــێ‌دەكەم‌و پــەنات پێ‌ئەگرم لەخراپەكەی.**

٢- (( اللَّهُـمَّ إنّـي أسـأَلُكَ خَيرَهـا. وَخَيـرَ مافِيهـا. وَخَيْـرَ مـا أُرسِـلَتْ بـهِ، وَأعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّها. وَشَرِّ ما فِيها. وَشَرِّ ما أُرسِلَتْ بِهِ )).[406]

**واتە: خوایە من داوای خێرو چاكەكەیت لێ‌دەكەم(وەك فێنكی و لابردنی بۆنی ناخۆش)و ئەوچاكەیەی كە تیایەتی(لە سوود وەك هـاتنی بـارانی بەسـوود بـە دوای خۆیـدا)و ئـەو چاكەیەی بۆی نێردراوە(لە كاتیدا وەك هاتنی هـەوری پـڕ بـارانی بەسـوود). وە پەنات پێ‌ئەگرم لە خراپەكەی‌و لەو خراپەیەی كە تیایەتی‌و ئەو خراپەیەی بۆی نێردراوە.**

**٣- جوێن بە – با – مەدەن. ئەگەر قایمی كردو ترسی زیانێكتان لــێ‌چاوەڕوان دەكـرد بڵـێن:** (( اللَّهُـمَّ إنّـا نَسأَلُكَ مِنْ خَيرِهـذِهِ الرِّيحِ

(٤٠٥) أخرجه أبوداود ٣٢٦/٤ برقم(٥٠٩٧) وابن ماجه ١٢٢٨/٢ برقم(٣٧٢٧) وانظر صحيح ابن ماجه ٣٠٥/٢.

(٤٠٦) مسلم ٦١٦/٢ برقم(٨٩٩) والبخاري ٧٦/٤ برقم(٣٢٠٦).

وَخَيرِ ما فِيها. وَخَيرِ ما أُمِرَتْ بِهِ. وَنَعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ هذِهِ الرِّيحِ وَشَرِّ ما فِيها. وَشَرِّ ما أُمِرَتْ بِهِ)).(٤٠٧)

**واته: خوايه ئێمه داواى چاكەى ئەم بايەت لىێدەكەين و داواى ئەو چاكەيەت لىێ دەكەين كە تيايەتى و فەرمانى پىێكراوه. وە پەنات پىێدەگرين لەخراپەى ئەم بايەو ئەو خراپەيەى كە تيايەتى و خراپەى ئەوەى فەرمانى پىێكراو كە بيكات.**

**٤- ئەگەر (با) توندى بكردايه پێغەمبەرى خوا(ﷺ) دەيفەرموو:** ((اللَّهمَّ لاقحاً، لا عَقيماً)).(٤٠٨) **واته: خوايه لاقح بێت (واته هەڵگرو پيتێنەرى هەورو باران بێت) و نەزۆك(ى بىێ سوودو باران) نەبێت.**

## پاڕانەوەى كاتى هەورەگرمه( الرَّعد )

**١- عبدالله ى كوڕى الزبير (رەزاى خوايان لىێبێت) ئەگەر گوێى له هەورەگرمه بوايه وازى لەقسەكردن دەهێناو دەيفەرموو:**

(( سُبْحانَ الّذي يُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ، وَالمَلائِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ )).(٤٠٩)

---

(٤٠٧) رواه الترمذي(٢٢٥٢) وصححه الألباني أنظر المشكاة(١٥١٨)والصحيحة(٢٧٥٦) والروض النضير(١١٠٧) والكلم الطيب برقم(١٥٤).

(٤٠٨) رواه البخاري في الأدب المفرد برقم(٧١٨)، وصحَّحه الألباني في صحيح الأدب برقم(٥٥٦). وحسنه في سلسلة الصحيحة ٥/٩٠ برقم(٢٠٥٨) بلفظ: (اللهم لقحا لا عقيما). وأنظر صحيح الجامع(٤٦٧٠).

(٤٠٩) الموطأ ٢/٩٩٢ وقال الألباني: صحيح الإسناد موقوفاً. الكلم الطيب ص١٣٥.

**واته: پاکی وبێگەردی بۆئەو خوایەی هەورەگرمە تەسبیحات و ستایشی دەکات. وە فریشتەکانیش لەترسی ئەو تەسبیحاتی دەکەن .**

**٢- لە عبداللەی کوڕی عەباسەوە(رضي الله عنهما) ئەگەر گوێی لە دەنگی هەورەگرمە بوایە دەیفەرموو:** ((سُبْحَانَ الَّذي سَبَّحْتَ لَهُ)).

**واتە: پاك و بێ نوقسانی بۆ ئەو خوایەی تەسبیحاتی بۆ کرا.** (٤١٠)

---

(٤١٠) ....وە دەیفەرموو: هەورە گرمە مەلائیکەتێکە هەورەکان پێش خۆی دەدا هەروەك چۆن شوان مەڕومالأتی پێش دەدات./ الأدب المفرد برقم(٧٢٢)، وحسَّنه الألباني في صحيح الأدب برقم(٥٥٩).

وە لە ابن عباسەوە(رضي الله عنهما) دەفەرموێت: چەند جولەکەیەك هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتیان: ئەی ابا القاسم هەواڵمان بدەرێ دەربارەی (الرعد) چیە؟ فەرموی: مەلائیکەتێکە دانراوە بە هەوارەکانەوە قامچیەکی پێیە( لە شێوەی دروستکراو لە پەڕۆ) لە نور(یان لە ئاگر) هەورەکانی پێ دەگێڕێت بەرەو ئەو شوێنەی خوای گەورە ویستی لێ بێت، ووتیان: ئەی ئەو دەنگە چیە کە دەیبیستین؟ فەرموی: دەنگی لێخوڕینیەتی بۆ هەورەکان تا دەیانبات بۆ ئەو شوێنەی فەرمانی پێ کراوە، وتیان: ڕاست ئەکەی....../ رواه أحمد (٢٧٤/١)، والترمذي برقم (٣١١٧)، وصححه الألباني، وانظر الصحيحة برقم (١٨٧٢).

<u>تێبینی:</u> (البرق) بریتیە لەو ڕووناکیەی لە کاتی هەورو هەڵادا لە ناکاو لە ئاسمانەوە دەردەکەوێت و بە دوایدا دەنگێك دێت. (الرعد) بریتییە لە دەنگی هەورەگرمە ئەو دەنگەی لە دوای دەرکەوتنی ڕووناکی بەرقەوە دێت، وە بەرهەردووکیان (البرق) و (الرعد) دەوترێت: (الصاعقة).

# له پاڕانەوەکانی داوای باران بارین کردن (الإسْتِسقاء)

١– (( اللَّهُمَّ اسقِنا غَيثاً مُغِيثاً مَريئاً مَريعاً. نافِعاً غَيرَ ضارٍّ، عاجِلاً غيرَ آجِلٍ )).(٤١١)

**واتە: خوايە بارانمان بۆ ببارێنە بارانێکی پڕ لەکۆمەکی و یارمەتی ئاسانی چاك(خاڵی لە ڕوخان و ڕوخاندن) سەوزکەری گژوگیاو بەسوودی بێ زیان. بەم زووانەو دوای مەخە بۆمان.**

٢– (( اللَّهُمَّ اغِثْنا. اللَّهُمَّ أغِثْنا. اللَّهُمَّ أغِثْنا )).(٤١٢)

**واتە: خوايە بارانمان بۆ ببارێنەو فریامان بکەوە،......**

٣– (( اللَّهُمَّ اسقِ عِبادَكَ. وَبَهائِمَكَ. وَانشُرْ رَحمتَكَ. وَأحيِي بَلَدَكَ المَيّتَ )).(٤١٣)

**واتە: خوايە بەندەکانت تێر ئاوبکە. هەروەها گیانلەبارانیش.وە بەزەیی خۆت بڵاوبکەرەوەو شارە مردووەکەت زیندوو بکەرەوە.**

٤– ((﴿الْحَمْدُلِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾، لاَ إِلَـهَ إِلاّ اللهُ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ، اللَّهُمَّ أَنْتَ اللهُ لاَ إله إِلاّ أَنْتَ الغَنِيُّ،

---

(٤١١) أبوداود ٣٠٣/١ وصَحّحَهُ الألباني في صحيح أبوداود ٢١٦/١.

(٤١٢) البخاري ٢٢٤/١ برقم(١٠١٣) ومسلم ٦١٣/٢برقم(٨٩٧).

(٤١٣) أبوداود ٣٠٥/١ برقم(١١٧٦) وحَسَّنَهُ الألباني في صحيح أبي داود ٢١٨/١.

وَنَحْنُ الفُقَرَاءُ، أَنْزِلْ عَلَيْنَا الغَيْثَ، وَاجْعَلْ مَا أَنْزَلْتَ لَنُا قُـوَّةً وَبَلاَغاً إِلَى حِينٍ)). (٤١٤)

# ئەگەر هەوری بینی ڕوو بەوێ هات

**لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لێ بێت): پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر ببیبینیایە هەور بەرو ئەو جێگایە دێت وازی لە ئیش دەهێنا ئەگەر لە نوێژیشدا بووایە و پاشان دەیفەرموو:**((اللَّهُمَّ إِنّي أَعوذُ بِكَ مِن شَرِّها)) **خۆ ئەگەر باران بباریایە دەیفەرموو:** ((اللَّهُمَّ صَيِّباً هَنيئاً)). (٤١٥)

---

(٤١٤) ئەمە یەکێکە لەو پاڕانەوانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە دوای وتاری نوێژە بارانەدا کردویەتیو پۆشاکەکەی بەری هەڵگێڕاوەتەوە. پاشان نوێژەکەی کردووە پاشان باران دایکردووەو ئەویش پێکەنیوەو فەرمویەتی: (أَشْهَدُ أَنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، وَأَنِّي عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ). اخرجه أبوداود(١١٧٣)، وحسنه الألباني في صحيح ابي داود(١٠٦٤). وصحيح الجامع(٢٣١٠) والكلم الطيب(١٥٢).

(٤١٥) أخرجه أبوداود(٥٠٩٩) وصححه الألباني أنظر الصحيحة (٢٧٥٧) والكلم الطيب(١٥٥) وصحيح الجامع الصغير(٧٩٣٠) وصحيح الكلم (١٥٦/١٢٨). وأخرجه ابن ماجة(٣٨٨٩) بلفظ: (....اللهم إنا نعوذ بك من شر ما أرسل به، فإن أمطر قال: اللهم سيبا نافعا، مرتين أو ثلاثة، وإن كشفه الله عز وجل ولم يمطر حمد الله على ذلك). وصححه الألباني أنظر الصحيحة(٢٧٥٧).

# له كاتی باران بارینددا

(( اللَّهُمَّ صَيِّباً نافِعاً )). [٤١٦]

**واته: خوایه بارانێکی زۆری به لێزمەی به سوود بێت.**

# له كاتی بارینی یەكەم باراندا چی دەكات

قَالَ أَنَسٌ: أَصَابَنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللهِ(ﷺ) مَطَرٌ، قَالَ: فَحَسَرَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) ثَوْبَهُ حَتَّى أَصَابَهُ مِنَ الْمَطَرِ. فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ لِمَ صَنَعْتَ هَذَا؟ قَالَ: (( لأَنَّهُ حَدِيثُ عَهْدٍ بِرَبِّهِ تَعَالَى)). [٤١٧]

---

**(٤١٦) البخاري مع الفتح ٥١٨/٢ برقم(١٠٣٢). والنسائي(١٥٢٣) بلفظ: (اللهم اجعله صيبا نافعا). وصححه الألباني أنظر صحيح الكلم الطيب (١٥٥/٨٨)، والصحيحة برقم(٢٧٥٧). وأخرجه أبوداود(٥٠٩٩) بلفظ: (اللهم صيبا هنيئا) وصححه الألباني أنظر الصحيحة (٢٧٥٧). وأخرجه ابن ماجه(٣٨٨٩) بلفظ: (اللهم سيبا نافعا)مرتين أو ثلاثا. وصححه الألباني الصحيحة(٢٧٥٧). (السيب): أي عَطاَء. ويجوز أن يُريد مَطراً سائباً: أي جَارِيا.**

**(٤١٧) مسلم برقم(٨٩٨).**

**ئیمامی نەوەوی فەرمویەتی: (...لەم فەرمودەیەشدا بە پێی ووتەی هاوەڵانمان(لە شافعیەکان) بەڵگەی ئەوەی تیایە کە موستەحەبە لە کاتی یەکەم باراندا هەندێك لە لاشەی بێجگە لە عەورەتی دەربخات تا بارانەکەی بەربکەوێت، ئەمەشیان کردۆتە بەڵگە، وە ئەوەشی تیایە کە ئەکەر کەسانێك شتێکیان لە یەکێکی بەڕێزتر بیزیو نەیاندەزانی چیيە پرسیاری لێ بکەن تا فێری ببن و کاری پێ بکەن و غەیری خۆشی لێ شارەزا بکەن). شرح النووي على مسلم (٣/ ٣٠٢) برقم(١٤٩٤).**

**واتـە: ئێمـە لـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوادا(ﷺ) بـوین بارانمـان بەسـەردا بـاری، پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) هەنـدێك لـە پۆشـاكەكەی لابـرد هـەتا لاشـەی لـە بارانەكـەی بەركـەوت، ووتمـان: ئـەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆچی ئاوات كرد؟ فەرموی: لەبەر ئەوەی تازە خەلق بووەو لە لایەن خوای پەروەردگارییەوە دابەزیوە.**

# زیكری دوای بـارینی بـاران

(( مُطِرْنا بِفَضلِ اللهِ وَرَحْمَتهِ )). (٤١٨)

**واتە: بارانمان بۆ باری(خوای گەورە بارانی بۆ باراندین) بە فەزڵ و سۆزو ڕەحمەتی خوای گەورەوە.**

# لەو پاڕانەوانەی كە بۆ خۆش كردنەوەی بـاران دەوتـرێ ( الإستِصحاء )

(( اللَّهُمَّ حَوالَينا وَلا عَلَينا. اللَّهُمَّ على الآكامِ وَالظِّرابِ.وَبُطونِ الأوديَةِ. وَمَنابِتِ الشَّجَرِ )). (٤١٩)

---

**(٤١٨) البخاري ١/٢٠٥ برقم(٨٤٦) ومسلم ٨٣/١ برقم(٧١).**

**(٤١٩) البخاري ١/ ٢٢٤ برقم(١٠١٣) ومسلم ٦١٤/٢ برقم(٨٩٧).**

**واتە: خوایە لە چوار دەورمان بیبارێنەو لەسەرمان مەیبارێنە، خوایە بیبە بۆ سەرگردو کورتە شاخ و ناو شیوو دۆڵەکان و شوێنی ڕووانی دارو درەختەکان.**

## لە کاتی تەماشاکردنی مانگ ( القَمَر )دا

(( أعوذُ بِاللّهِ مِن شَرِّ هذا الغاسِقِ إذا وَقَبَ )).(٤٢٠)

**واتە: پەنا ئەگرم بە خوای گەورە لە خراپەی ئەم تاریکییەی شەو کە دادێت.**

## لە کاتی بینینی هەیڤ( سەرەتای مانگ ) ( الهلال )دا

(( اللّهُ أكبَرُ. اللَّهُمَّ أهِلَّهُ عَلَينا بالأمْنِ وَالإيمانِ. وَالسَّلامةِ وَالإسلامِ. وَالتَّوفيقِ لِما تُحِبُّ وَتَرضَى. رَبُّنا وَرَبُّكَ اللّهُ )).(٤٢١)

---

**(٤٢٠) أخرجه الترمذي(٩/٣٠٢ تحفة) والحاكم في المستدرك من حديث عائشة. قال الترمذي: حديث حسن صحيح، انظر مختصر تفسير ابن كثير ٦٩٥/٣: وقال الحاكم: صحيح الإسناد. وأخرجه من حديثه أيضاً النسائي انظر (تحفة الذاكرين)ص ١٧٧ وهو حديث حسن. وصحّحَهُ الألباني. انظر السلسلة الأحاديث الصحيحة(٦٤٧/١).**

**(٤٢١) الترمذي ٥٠٤/٥ برقم(٣٤٥١) بلفظ: (اللَّهُمَّ أَهِلَّهُ عَلَيْنَا بِالْيُمْنِ وَالإِيمَانِ، وَالسَّلاَمَةِ وَالإِسْلاَمِ، رَبِّيَ وَرَبُّكَ اللهُ) وحسّنه الألباني في صحيح الجامع (٤٧٢٦). والدارمي بلفظه٣٣٦/١ انظر صحيح الترمذي ١٥٧/٣. والكلم الطيب رقم(١٦٢). وقال الألباني: صحيح بشواهده.**

واته: خوا گەورەترە لە هەموو شتێك. خوایە ئەم مانگە دەرخەو هەڵبێنە بە سەرماندا بە ئاسایش(دوور لە موسیبەت و بە دامەزراوی)(لە ریوایەتی بالیمن: واتە بە کامەرانی) و ئیمان و بە سەلامەتی لە ئافاتی دونیاو دین و ئیسلامەتی و ملکەچی شەرعەوەو بە تەوفیق و یارمەتی دانت بۆ ئەو شتەی پەروەردگار تۆ پێت خۆشەو پێی ڕازیت.(ئەی مانگ)پەروەردگاری ئێمەو تۆش(الله)یە.

## بە ڕۆژوو بوون

١- (( پارشێوبکەن چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە )).[٤٢٢]

٢- ئەگەر بە ڕۆژوو بوویت و کەسێك جوێی پێ دایت یان نەفامی لەگەڵ کردی( یان ویستی شەڕت لەگەڵ بکات) بڵێ: (( إنّي صآئِمٌ. إنّي صآئِمٌ )).[٤٢٣] ، واتە: من بە ڕۆژووم. من بەڕۆژووم.

٣- (( پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر چەند دەنکە خورمایەکی نەرم و پێگەیشتوو (رُطَب) بەربانگ دەکردەوە پێش ئەوەی نوێژ بکات. ئەگەر نەبوایە بە خورمای ووشك(تمرات). ئەگەر نەبوایە بە چەند مشتێك لە ئاو )).[٤٢٤]

---

(٤٢٢) البخاري ٤/١٢٠ ومسلم (١٠٩٥) عن أنس(رضي الله عنه).

(٤٢٣) البخاري مع الفتح ٤/١٠٣ برقم(١٨٩٤) ومسلم ٢/٨٠٦ برقم(١١٥١). وصحيح الجامع(٥٣٧٦).

(٤٢٤) حسن صحيح (صحيح سنن أبي داود ٢/٤٤٨).

## له كاتی( له دوای ) بەربانگ كردنەوەی ڕۆژووەواندا

(( ذَهَبَ الظّمَأُ وَابتَلَّتِ العرُوقُ. وَثَبَتَ الأجْرُ إن شاءَ اللّهُ )).(٤٢٥)

**واتـــە: تینوویـــەتی ڕۆیشـــت ودەمارەكـــان تێـــر ئـــاو بـــوون و تەڕبوونەوەو پاداشتەكەشمان چەسپاوەو مسۆگەرە ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ بێت.**

## نزاو پاڕانەوە ئەگەر لەلای ئەهل و خێزانی ماڵێك بەربانگت كردەوە

(( أفطَرَ عِنـدَكُمُ الصـآئِمونَ. وَأكَـلَ طَعـامَكُمُ الأبـرارُ. وَصَـلَّتْ عَلـيكُمُ الملآئِكَةُ )).(٤٢٦)

**واتە: یاخوا ڕۆژووەوانان لە لاتان بەربانگ بكەنەوەو خوانـاس و بێگوناهان لە خواردنتان بخۆن و مەلائیكەت بۆتان بپاڕێنەوە.**

---

(٤٢٥) أخرجـه أبـوداود ٣٠٦/٢ بـرقم(٢٣٥٧)وغـيره. وانظـر صـحيح الجـامع ٢٠٩/٤ برقم(٤٦٧٨).

(٤٢٦) (وە دەقەكەی وایە كە پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی دەفەرموو كاتێ بەربانگی لـە لای خێزانی ماڵێك دەكردەوە). سنن أبي داود ٣٦٧/٣ برقم(٣٨٥٤). وابن ماجه ٥٥٦/١ برقم(١٧٤٧). والنسائي في عمل اليوم والليلة برقم(٢٩٦-٢٩٨). وصححه الألباني في صحيح أبي داود ٧٣٠/٢. وأحمد بلفظ: (....و تنزلـت علـيكم الملائكـة). وصـححه الألباني في صحيح الجامع(٤٦٧٧).

# نزاو پاڕانەوەی ڕۆژووەوان ئەگەر خواردنیان هێناو نەیشکاند

(( إذا دُعِيَ أحَدُكُمْ فَليُجِبْ. فإنْ كان صائِماً فَليُصَلِّ. وَإنْ كانَ مُفطِراً فَليُطْعَم )).[٤٢٧]

**واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە بانگ کرا بۆ دەعوەتێك با بچێت. ئەگەر بە ڕۆژوو بوو ئەوا با بپاڕێتەوە بۆیان بە بەرەکەت و ئەگەر ئەیویست بیشکێنێت(لە ڕۆژووی سوننەتدا) با( لە خواردنەکە)بخوات.**

# نزاو پاڕانەوەی شەوی قەدر( لَيلَةُ القَدر)

(( اللَّهُمَّ إنّكَ عَفُوٌّ{كَرِيمٌ}، تُحِبُّ العَفوَ، فاعفُ عَنّي )).[٤٢٨]

**واتە: خوایە تۆ لێبووردەو بەخشندەیت و لێبووردنت پێخۆشە. ساخوایە لێم خۆشبەو لێم ببورە.**

---

(٤٢٧) مسلم ٢/١٠٥٤برقم(١٤٣١).

تێبینی: دروستە ئەگەر ڕۆژووی سوننەتی گرتبوو وە دەعوەت کرا بۆ خواردنێك کە ڕۆژووەکەی بشکێنێت و خۆی لەمەدا سەرپشکە. مسلم ١٩٥٠-١٩٥١ و(١٤٣٠) والترمذي وغيرهِ. وانظر إرواء الغليل(٩٦٥).

(٤٢٨) صحيح (صحيح ابن ماجه ٣٢٨/٢) بدون لفظ:(( كـريم )). والترمـذي( صحيح الترمذي)(٢٧٨٩) بهذا اللفظ وصحّحَهُ الألباني.

# ئەگەر نیازی قوربانی کردنت هەبوو

(( إذا دَخَلَ العَشرُ. فأرادَ أحدَكُم أن يُضَحّى. فَلا يَمَسَّ مِن شَعرِهِ. وَلا مِن بِشرِهِ شَيئاً )).(٤٢٩)

**واتە: ئەگەر(دە) ڕۆژی یەکەمی مانگی(ذي الحِجّة) هات و دەستی پێکردو یەکێك لە ئێوە ویستی وابوو کە قوربانی بکات با هیچ دەست نەدات لە مووو نینۆکی و لێی نەکاتەوە.**

# لەکاتی سەربڕین و قوربانیدا

(( بِسمِ اللهِ وَاللهُ أكبَرُ،{اللَّهُمَّ مِنكَ وَلَكَ}. اللَّهُمَّ تَقَبَّلْ مِنّي )).(٤٣٠)

**واتە: (خۆم پەنا ئەدەم)بە ناوی خواو خوا گەورەترە لە هەموو شتێك. خوایە لە تۆوەیەو بۆ تۆیە. خوایە لێم وەرگرەو لێم قبوڵ بکە.**

---

(٤٢٩) مسلم (١٩٧٧) وأبوداود (٢٧٩١) والنسائي (٢١١/٧ و ٢١٢) وغيره عن ام سلمة(رضي الله عنها).

(٤٣٠) مسلم ١٥٥٧/٣ برقم(١٩٦٦)(١٨) والبيهقي ٢٨٧/٩ ومابين المعكوفين للبيهقي٢٨٧/٩ وغيره والجملة الأخيرة سقتها بالمعنى من رواية مسلم.

# تەكبیركردن بۆ جەژنەكان

**كاتی تەكبیر كردن لە جەژنی ڕەمەزاندا لە كاتی دەرچوونەوەیە بۆ نوێژ تا نوێژ تەواو دەبێ‌و لە جەژنی قوربانیشدا لە بەرەبەیانی ڕۆژی عەرەفەوەیە تا كۆتایی ڕۆژی( أيّامُ التَّشريق ).(٤٣١)**

**بەم شێوازانە:**

١- (( اللهُ أكبَـرُ اللهُ أكبـر. لآ إلـهَ إلاّ الله. وَالله أكبَـرُ اللهُ أكبَـرُ. ولله الحَمدُ)).(٤٣٢)

٢- (( أللهُ أكبَـرُ أللهُ أكبَـرُ أللهُ أكبَر. وَللهِ الحَمـدُ. اللهُ أكبـرُ وَأجَـلّ.اللهُ أكبَرُ على ما هَدانا )).(٤٣٣)

**واتە: خوا گەورەترە لە هەموو شتێك، خوا گەورەترە لە هەموو شتێك، خوا گەورەترە لە هەموو شتێك و هەموو ستایش بۆ خوایە. خوا گەورەترە لە هەموو شتێك و خاوەنی شكۆو ڕێزە. خوا گەورەترە لە هەموو شتێك لەسەر ئەوەی ڕێنمایی كردووین.**

**٣-** (( أللهُ أكبَرُ. أللهُ أكبَرُ. أللهُ أكبَرُ كَبيراً )).(٤٣٤)

---

(٤٣١) انظر(سلسلة الأحاديث الصحيحة)(١٧٠) ومجموع الفتاوى ٢٢٠/٢٤ وانظر سبل السّلام ٧١/٢-٧٢.

(٤٣٢) رواه ابن أبي شيبة ١٦٨/٢ بإسناد صحيح موقوفاً على ابن مسعود(رضي الله عنه). وصحّحَهُ الألباني في الإرواء ١٢٥/٣.

(٤٣٣) رواه البيهقي٣١٥/٣ وسنده صَحيح موقوفاً على ابن عباس (رضي الله عنهما).

(٤٣٤) أخرجه عبدالرزاق ومن طريقه البيهقي في(السنن الكبرى)٣١٦/٣ بسندصحيح.

# جەژنە پیرۆزە کردن

(( تَقَبَّلَ اللهُ مِنّا وَمِنكَ )).[٤٣٥] ، واتە: خوا لە ئێمەو لە تۆشی قبوڵ بکات.

# ڕۆژووە سوننەتەکان

١- شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال(شەشەڵان): پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (( هەر کەسێك مانگی ڕەمەزان بگرێت و بە دوایدا شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال بگرێت وەکو ڕۆژووی ساڵەکە وایە )).[٤٣٦]

٢- (نۆ)ڕۆژی یەکەمی مانگی( ذي الحِجّة) نۆمینەی حاجیان.[٤٣٧]

٣- مانگی موحەڕەم: (( چاکترین ڕۆژوو دوای ڕەمەزان مانگی موحەڕەمە...)).[٤٣٨]

٤- مانگی شەعبان.[٤٣٩]

---

(٤٣٥) قال أحمد: اسناد حديث أبي أمامة جيد. وانظر (الجوهر النقي) ٣/٣٢٠ وقال السيوطي في (الحاوي) ٨١/١: إسناده حسن. وقال ابن حجر: ورويناه في (المحامليات) بإسنادٍ حسن عن جبير ابن نفير من فعل الصحابة ايضاً / (فتح الباري)٢/٤٤٦.

تێبینی: تەکبیر کردن لە جەژن دا لە هەموو کاتەکانیدا (کە دیاری کراوە) سوننەتەو تایبەت نییە بە دوای نوێژە فەرزەکانەوەو بەس. وە دروستە کە دەنگی هەڵبڕێ.

(٤٣٦) مسلم ٨٢٢/٢ وغيره.

(٤٣٧) أبوداود ٨١٥/٢ وغيره وهو حديث حَسَن.

(٤٣٨) مسلم ٨٢١/٢ وغيره.

(٤٣٩) البخاري ٢١٣/٤ ومسلم ٨١١/٢.

**٥- دووشەممەو پێنج شەممەی هەموو هەفتەیەك.**[٤٤٠]

**٦- ڕۆژە سپییەکان(أیامُ البیض) واتە: (١٣،١٤،١٥)ی هەموو مانگێك(مەبەست مانگی کۆچییە).**[٤٤١]

**٧- ڕۆژ نا ڕۆژێك: (( لەڕۆژووی داود پێغەمبەر**(علیه الصلاة والسلام) **چاکتر نییە کە نیوەی ساڵی دەگرت. ڕۆژێك بگرەو ڕۆژێك بشکێنە )).**[٤٤٢]

**٨- ڕۆژووی عەرەفە: (( ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە خوای گەورە دەیکاتە مایەی سڕینەوەی گوناهی ساڵێکی پێشووی وە ساڵێکی دوایی )).**[٤٤٣]

**٩- ڕۆژووی عاشورا واتە(١٠)ی مانگی مەحەرەم: ((... وە ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا خوای گەورە گوناهی ساڵێکی پێشوی پێ دەسڕێتەوە )).**[٤٤٤]

---

(٤٤٠) رواه أبو داود(٢٤٣٦) والترمذي والنسائي وابن ماجه بألفاظٍ مختلفةٍ وهوحديث صحيح. انظر صحيح أبي داود(٢١٢٨). والإرواء ٤/١٠٥-١٠٦.

(٤٤١) مسلم ٢/٨١٨ وغيره عن أبي قتادة. تێبینی: بۆیە پێی دەوترێ(أیّامُ البیض) چونکە مانگ لەو سێ شەوەیدا زۆر ڕووناکەو دیارە.

(٤٤٢) البخاري ٤/٢٢٤ ومسلم ٢/٨١٧.

تێبینی: ئەمەش بە مەرجێك شەرع ڕازی بێت پێیو نەکەوێتە ئەو ڕۆژانەی کە دروست نییە بە ڕۆژوو بێت تیایدا وەك:( جەژن- أیّام التَّشریق - ڕۆژی هەینی بە تەنها - ڕۆژی شەممە بە تەنها(مەگەر بۆ فەرز بێت) - ...هتد).

(٤٤٣) مسلم ٢/٨١٨.

(٤٤٤) مسلم ٢/٨١٨. پێغەمبەر(ﷺ) دەیەم ڕۆژی گرت و فەرمووی ئەگەر ساڵێکی تر بمێنم نۆیەمیش دەگرم، بەڵام ئەوەبوو لە ساڵی داهاتوودا وەفاتی کرد.

# له كاتی تووڕەبووندا( لەسەر شتی دونیایی )

**بڵێ:** (( أعوذُ باللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيمِ )).[(٤٤٥)]

**واته: پەنا دەگرم بە خوای گەورە لە شەیطانی نەفرەت لێکراوو دوورخراوە لە ڕەحمەتی خوا.**

# ئەگەر کەسێکی تووش بوو بە بەڵایەکت بینی

**بڵێ:** (( ألحَمدُ للهِ الَّذي عافاني مِمّا ابتَلاكَ بهِ. وَفَضَّلَني عَلى كَثيرٍ مِمَّن خلَقَ تَفضيلاً )).[(٤٤٦)]

**واتە: هەموو ستایشێك بۆ ئەو خوایەی منی پاراست لەوەی تووشی تۆی کردوەو فەزڵی منی داوە بەسەر زۆرێك لە دروست کراوەکانیدا.**

---

**(٤٤٥) البخاري ٩٩/٧ برقم(٦٠٤٨) ومسلم ٢٠١٥/٥ برقم(٢٦١٠).**

**(٤٤٦) هەرکەسێ ئەمە بڵێ لەو بەڵایەی تووش نابێ/ الترمذي ٤٩٤/٥ و ٤٩٣/٥ برقم(٣٤٣٢) وانظر صحيح الترمذي ١٥٣/٣.**

**<u>تێبینی:</u> زانایان فەرمویانە: پێویستە ئەم زیکرە بە نهێنی بوترێت بەجۆرێك تەنها خۆی بیبیستێت و کەسی خاوەن بەڵاکە گوێی لێ نەبێت، مەگەر بەڵاکەی بریتی بێت لە تاوان و سەرپێچی ئەوکات ئەگەر مەفسەدەیەکی تیانەبوو دەنگ بەرز دەکاتەوە تا کەسەکە بیبیستێت و بە خۆیدا بچێتەوە./ فیض القدير (١٣٠/٦) و تحفة الأحوذي(٢٧٦/٩).**

## چی دەڵێت ئەگەر بانگ کرا بۆ حوکمی خوای گەورە

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾﴾. (النور: ٥١)

**واتە: بەڵام وتەو گوفتاری بڕوادارەکانیش کاتێ بانگ دەکرێن بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بۆ ئەوەی لەنێوانیاندا داوەری بکا هەر ئەمەیە کە ئەڵێن: ئەوا بیستمان و گوێرایەڵیشین. ئائەوانە سەرفرازی ڕاستەقینەی دونیاو قیامەتن.**

## ئەگەر کەسێك بانگ کرا بۆ سوننەتێك و کەچی پشتی هەڵکردو نەیویست

﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ حَسْبِيَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ ۖ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾ ﴾. (التوبة: ١٢٨-١٢٩)

**واتە: سوێند بەخوا هەر لەخۆتان پەیامبەرێکی پایە بەرزتان بۆ هات و چاك دەیناسن لەکێیە، هەر ناڕەحەتییەکتان توش بێت زۆر**

سەختە لایی و پێی سەخڵەت دەبێ، زۆریش سوورە لەسەر بڕوا هێنانتتان، بەرامبەر بە بڕواداران زۆر دڵسۆزو بە بەزەییە ، ئینجا ئەگەر بەهاتنەکەت بەهرەمەند نەبوون، دڵ زویر مەبەو بڵێ: من هەر خوام بەسە بێ لەو خوایە هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق شیاوی پەرستن بێت هەر بەویش پشتدەبەستم و هەر ئەویشە خاوەن و پەروەردگاری عەرشی گەورە.

# وتاری پێویستی( خُطبَةُ الحاجة )

(( إنَّ الحمدَ للهِ نَحمَدُهُ ونَستَعينُهُ نَستغفِرُهُ، وَنَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنفُسنا وَسَيِّئاتِ أعمالِنا، مَنْ يهدِهِ اللهُ فلا مُضِلّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِل فَلا هادِيَ لَهُ، وَأشهَدُ أن لا إلـه إلاّ الله وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ، وَأشهَدُ أن محمّداً عَبدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾ (آل عمران: ١٠٢)

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ (النساء: ١)

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾. (الأحزاب: ٧٠-٧١)

أما بَعْدُ فإنَّ أصدَقَ الحَديثِ كِتابُ الله، وخَيرَ الهَدي هَدِيُ مُحَمّدٍ(ﷺ)، وَشَرَّ الأمُور مُحدَثاتُها، وَكُلّ مُحْدَثةٍ بِدْعَة، وَكُلّ بِدعَةٍ ضَلالَة، وَكُلّ ضلالَةٍ في النّار)). (٤٤٧)

**واته: هەموو سوپاس و ستایش بۆ خوایە، ستایشی دەکەین و داوای کۆمەکی و لێخۆش بوونی لێ دەکەین. وە پەنا دەگرین بە خوا لە خراپی دەروون و کردەوەکانمان، هەر کەسێك خوا ڕێنومایی بکات گومڕا کەری نییەو کەسێك گومڕا ببێت ڕێنمایی کەری نییە، وە شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە(الله). تاکی بێ هاوبەشە، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد(ﷺ) بەندەو نێردراوی خوایە.**

---

(٤٤٧) ئەمە بریتی‌یە لە دەقی ئەو ووتاری پێویستی‌یەی کە پێغەمبەر(ﷺ) دەیکردە دەستپێکی ووتارەکانی‌و فێری هاوەڵەکانیشی دەکرد. ئەم ووتارە(شەش) کە لە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت) گێڕاویانەتەوەو کۆمەڵێك لەپێشەوایانی فەرموودە لە(مصنف)ە کانیاندا دەریان هێناوە لەوانە: إمام أحمد(٢٧٢/٥) ومسلم في(صحيحه)(٤٦٧/٥٩٢/٢) وأبوداود والنسائي وابن ماجه والحاكم والطيالسي وفي(صحيح النسائي) ( ١٣٣١) وفي(المشكاة) (٣١٤٩) و ( الكلم الطيب) ( ٢٠٥).
تێبینی/ شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (ئەم ووتارە گرێی نیزامی ئیسلام و ئیمانە).مجموع الفتاوى (٢٢٣/١٤).

(ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، لە خوا بترسن و پارێزکاربن بەشێوەیەکی وا کە شایستەی ئەو زاتەیە و هەمیشە پابەند و دامەزراو بن لەسەر ئیسلامەتی، بۆ ئەوەی هەر کاتێك مردن بە ئیمان و ئیسلامەتی نەبێت نەمرن).

(ئەی خەڵکینە لە خەشم و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆ بپارێزن کە ئێوەی لە تاکە نەفسێك دروست کردووە، هەر لەو نەفسەش هاوسەرەکەی بەدی هێناو لەو دووانە پیاوان و ژنانی زۆری خستۆتەوە و بڵاوکردەوە، هەروەها لەو خوایە بترسن کە لە یەکتر داوا دەکەن بەناوهێنانی ئەوەوە، هەوڵ بدەن پەیوەندی خزمایەتیش بپارێزن و (پتەوی بکەن)چونکە بەڕاستی خوا (هەمیشە و بەردەوام) چاودێرە بەسەرتانەوە).

(ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن و پارێزکاربن، هەمیشە قسە و گوفتاری بەجێ و بەسوود بکەن. (ئەوسا ئیتر) کردەوەکانتان چاك و بەجێ و پەسەند دەکات، لەگوناهەکانیشتان خۆش دەبێت، جا ئەوەی فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی بێت، ئەوە ئیتر سەرکەوتن و سەرفەرازیەکی بێ وەندازەو بێ سنووری بەدەست هێناوە).

پاشان ڕاسترین ووتەو فەرمووده کیتابەکەی خوایەو چاکترین ڕێنمویی ڕێنومایی پێغەمبەرە(ﷺ)، وە خراپترینی کاروبارەکان تازە گەرییەکانێتی، وە هەموو تازەگەرییەکیش لە دیندا (کە تیایدا نەبێت) داهێنراوە، وە هەموو داهێنراوێکیش گومراییەو هەموو گومڕاییەکیش لە ئاگردایە.

# ئەو زیکرەی لە دانیشتگا( مەجلیس ) دا دەووترێ

**لە ابن عمرەوە(ڕەزای خوایان لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێش ئەوەی هەستێ لە مەجلیسێکدا دەیانژمارد سەد جار دەیفەرموو:** (( رَبِّ اغفِرْ لي وَتُبْ عَلَيَّ إنَّكَ أنتَ التَّوّابُ الغَفورُ )).(٤٤٨)

**واتە: پەروەردگار لێم خۆش بەو (تەوفیقم بدە بۆ تەوبە) یان گەڕانەوەم لێ وەربگرە، بەڕاستی تۆ تۆبە وەرگری لێ بووردەیت.**

# کەفارەتی دانیشتگا( مەجلیس )

١- (( سُبحانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ. أشهَدُ أنْ لا إله إلاّ أنْتَ. أستغفِرُكَ وَأتوبُ إلَيكَ )).(٤٤٩)

---

**(٤٤٨) الترمذي برقم(٣٤٣٢) واللفظ له وصححه الألباني انظر صحيح الترمذي ١٥٣/٣ و أخرجه ابن ماجه (٣٨١٤) وأبوداود (١٥١٦) بلفظ: (....إنك أنت التواب الرحيم) وصححه الألباني أنظر صحيح ابن ماجه ٣٢١/٢. وصحيح ابوداود٢/١.**

**(٤٤٩) هەرکەسێك لە مەجلیسێکدا دابنیشێ و زۆر هەڵەو قسەی بێبایەخی تێدا بکات و پێش ئەوەی لەو مەجلیسە هەستێ بڵێ...(فەرموودەکە).. ئیلا خوا لە تاوانی ئەو مەجلیسەی خۆش دەبێ/ أخرجه الترمذي(٣٤٣٣) والحاكم، وابن حبان (٥٩٤)بلفظ: (سبحانك اللهمّ ربّنا وبحمدك...) وصححه الألباني في صحيح الجامع برقم(٦١٩٢). وأنظر المشكاة(٢٤٣٣).**

**وەچەسپاوە کە عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) لە هیچ مەجلیسێکدا دانەنیشتووەو قورئانی نەخوێندوەو نوێژێکی نەکردووە ئیلا ئەوەی بەم ووشانە کۆتایی پێهێناوە... فەرموودەکە...). أخرجه النسائي في عمل اليوم والليلة**

**واتـه: خوايه پاك و بێگەردی و ستايش بۆ تۆيه. شايـەتی دەدەم كه هيچ پەرستراوێك نييه بە هەق جگه لە تۆ، داوای لێخۆشبوونت لێ دەكەم و دەگەڕێمەوە بۆ لات.**

٢- قال رسول الله(ﷺ): ((مَن قالَ سُبحانَ اللهِ وَبِحَمدِهِ، سُبحانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أن لا إلـهَ إلاّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتوبُ إلَيكَ، فَقالَهَا في مَجلِسِ ذِكرٍ كانَت كالطّابعِ يَطبَعُ عَلَيهِ، وَمَن قالَها في مَجلِسِ لَغوٍ كانَت كَفّارَةَ لَه)). (٤٥٠)

**واته: هەركەسێك بڵێت: خوايه پاك و بێگەردی و ستايش بۆ تۆيه. شايـەتی دەدەم كه هيچ پەرستراوێك نييه بە هەق جگه لە تۆ، داوای لێخۆشبوونت لێ دەكەم و دەگەڕێمەوە بۆ لات.**

**جا ئەگەر لە مەجليسێكی زيكردا بيڵێت ئەوا وەك مۆرێك مۆری لێ دەدرێت، وە هەركەسێك لە مەجليسێكی لەغوو ووشەی بەتاڵدا بيڵێت بۆی دەبێتە كەفارەت.**

---

برقم (٣٠٨) وأحمد ٧٧/٦ وصَحَّحَهُ الدكتور فاروق حمادة في تحقيقه لعمل اليوم والليلة للنسائي ص/ ٢٧٣.

(٤٥٠) أخرجه الطبراني (٢/٧٩/١) والحاكم (٥٣٧/١) قال الحاكم: هذا حديث صحيح على شرط مسلم، ولم يخرجاه، ووافقه الذهبي، وصحّحه الألباني أنظر السلسلة الصحيحة١/١٢٠ برقم(٨١).

# پاڕانەوەی دوای دانیشتن

(( اللَّهُمَّ اقسِمْ لَنا مِنْ خَشْيَتِكَ ما تَحُولُ بِهِ بَينَنا وَبَيْنَ مَعاصِيكَ. وَمِنْ طاعَتِكَ ما تُبَلِّغُنا بِهِ جَنَّتَكَ.وَمِنَ اليَقِينِ ما تُهَوِّنُ بِهِ عَلَينا مَصائِبَ الدُّنيا. اللَّهُمَّ مَتِّعْنا بِأَسماعِنا وَأَبْصارِنا وَقُوّاتِنا ما أَحيَيْتَنا. وَاجعَلْهُ الوارِثَ مِنّا. وَاجعَلْ ثَأْرَنا عَلَى مَنْ ظَلَمَنا وَانْصُرْنا عَلَى مَنْ عادانا. وَلا تَجْعَلْ مُصِيبَتَنا فِي دِينِنا. وَلا تَجْعَلِ الدُّنيا أَكبَرَ هَمِّنا وَلا مَبْلَغَ عِلْمِنا. وَلا تُسَلِّط عَلَينا مَنْ لا يَرْحَمُنا )).(٤٥١)

**واتە: خوایە لەترسی خۆت ئەوەندەمان بەسەردا بەش بکە کە دوورمان بخاتەوە لە سەرپێچی کردنت. وە لە گوێ ڕایەڵی خۆت ئەوەندەمان پێ ببەخشە کە بمانگەیەنێتە بەهەشتەکەت. وە لە دڵنیایی ئەوەندەمان پێ ببەخشە کە بەڵاو موسیبەتەکانی دنیامان لا ئاسان بکات. خوایە کامەرانمان بکە بە بیستن و بینین و هێزەکانمان تا دەمان ژیێنی و لەدوای خۆمان بە میرات بەجێی بهێڵە بۆ کەس وکارو نەوەکانمان. وە ڕق و توڕەییمان ڕوو پێ بکەرە ئەو کەسەی ستەمی لێ کردووین و سەرمان بخە بەسەر ئەوەدا دوژمنایەتیمان دەکات. وە بەڵاو موسیبەتمان مەخەرە دینەکەمانەوەو دنیا مەکە بە گەورەترین خەفەتمان و مەیکەرە ئەوپەڕی زانستمان و خوایە کەسێك دەسەڵاتدار مەکە بەسەرماندا کە ڕەحممان پێ ناکات و بەزەیی نایەتەوە پێماندا.**

---

(٤٥١) الترمذي ٥٢٨/٥ والحاكم ٢٥٨/١ وصححه ووافقه الذهبي. وابن السني برقم(٤٤٦) وانظر صحيح الترمذي ١٦٨/٣ وصحيح الجامع ٤٠٠/١.

# ئەگەر کەسێك پێی ووتی
# خوا لێت خۆش بێت ( غَفَرَ اللهُ لَكَ )

لە(عبــدالله ی کــوڕی ســرجس)ەوە(ڕەزای خــوای لێ بێــت) دەفـەرموێت: پێغەمبـەری خـوام(ﷺ) بینـی و لـە خواردنەکـەیم خوارد، پێم ووت: (غَفَرَ اللهُ لَكَ يا رسولَ الله) خوا لێت خۆش بێت ئەی پێغەمبـەری خـوا. ئـەویش فـەرمووی: (( وَلَكَ )) واتـە: وە لـە تۆش خۆش بێت........[٤٥٢]

# ئەگەر کەسێك چاکەیەکی لەگەڵدا کردیت

(هەر کەسێك چاکەیەکی لەگەڵدا کراو بە بکەری چاکەکەی ووت: (( جَزاكَ اللهُ خَيراً )) واتە: خوای گەورە چاکترین پاداشتت بداتـەوە (یان واتە: خێری دونیاو قیامەتت پێ ببەخشێت). ئەوا ئەوپەڕی سوپاسی کردووە).[٤٥٣]

---

(٤٥٢) أحمد ٨٢/٥ والنسائي في عمل اليوم والليلة ص (٢١٨) برقم (٤٢١) تحقيق الدكتور فاروق حمادة.

(٤٥٣) أخرجه الترمذي رقم (٢٠٣٥) وانظر صحيح الجامع (٦٢٤٤) وصحيح الترمذي٢/٢٠٠.

## ئەو زیكرەی كە خوا دەتپارێزێ بەهۆیەوە لە( دەجال )

(( مَــنْ حَفِــظَ عَشــرَ آيــاتٍ مِــنْ أَوَّلِ ســورَةِ الكَهْــفِ عُصِــمَ مِــنَ الدَّجّالِ)).[٤٥٤]

**واتــە: هــەر كەسـێك(دە) ئایــەتی ســەرەتای ســورەتی(الكَهْــف) لەبەربكات لە دەجال دەپارێزێت.**

**وە پـەنا گـرتن بـە خـوای گـەورە لـە ئاشـووبەی دەجال لـە دوای تەحییاتی كۆتایی هەموو نوێژێكەوە.[٤٥٥]**

## ئەگەر یەكێك پێی ووتی: چۆنیت؟ یان ئەم بەیانییەت چۆن لێ بوویەوە؟

عَن أَنَسَ بن مالك: أنه سَمعَ عُمر بن الخطاب(رضي الله عنه)، وَسلَّمَ عليهِ رَجُلٌ فَرَدَّ السَّلامَ، ثُمَّ سأَلَ عمر الرَّجُلَ: كَيفَ أَنتَ؟ فَقالَ: أَحمَدُ اللهَ إِلَيكَ، فَقالَ عُمر: (هَذَا الَّذِي أَرَدْتُ مِنْكَ).[٤٥٦]

**واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە: گوێی لێ بوو عومـەری كوڕی خەتتاب(ڕەزای خوای لێ بێت) پیاوێك سـەلامی لێ كردو ئەویش**

---

(٤٥٤) مسلم ٥٥٥/١ برقم(٨٠٩). وە لەریوایەتێكدا: (( مِـن آخِـر الكَهــف )) . واتـە: لەكۆتایی سورەتی( الكَهف ) ٥٥٦/١.

(٤٥٥) بڕوانە فەرموودەی یەكەمو دووەمو سێیەمی لاپەڕە (٨٧) ، (٨٨).

(٤٥٦) قال الألباني: صحيح موقوفا وثبت مرفوعا. صحيح الأدب المفرد (٤٥٥/١) برقم(١١٣٢/٨٦٦) باب كيف انت؟

**وەلأمی سەلامەكەی دایەوە، پاشان عومەر لە پیاوەكەی پرسی؟ چۆنیت؟ فەرموی: سوپاسی خوای گەورە دەكەم لە لای تۆدا(بە شایەتی تۆ)، عومەر فەرموی: ئا ئەمەم دەویست لە تۆ كە بیلێییت.**

٢- عَن جابر بن عبدالله: قيلَ للنَّبي(ﷺ): كَيفَ أَصبَحتَ؟ قالَ: (بِخَيرٍ، مِن قَومٍ لَم يَشهَدوا جَنازَةً، وَلَم يَعودوا مَريضاً).[٤٥٧]

**واتە: بە پێغەمبەری خوایان(ﷺ) فەرموو: ئەم بەیانییەت چۆن لێ بوویەوە؟ فەرموی: بە خێرو چاكە. لە كەسانێك باشتر كە ئامادەی هیچ جەنازەیەك نەبوون و سەردانی هیچ نەخۆشێكیشیان نەكردووە.**

# ئەگەر كەسێكت لەبەر خوا خۆش ویست

**پێی بڵێ:** (( إنّي أُحِبُّكَ في اللهِ )).[٤٥٨]

**واتە: من لەبەر خوای گەورە تۆم خۆش دەوێت.**

---

(٤٥٧) البخاري في الأدب المفرد، قال الألباني: حسن لغيره. صحيح الأدب المفرد(٤٥٦/١) برقم(١١٣٣/٨٦٧)باب كيف يجيب إذا قيل له: كيف أصبحت؟.

(٤٥٨) اخرجه أبوداود ٣٣٣/٤ برقم(٥١٢٥). وحسَّنَه الألباني في صحيح أبي داود٩٦٥/٣.

# ئەگەر موسڵمانێك پێی ووتی من لەبەر خوا خۆشم دەوێیت

**پێی بڵێ:** (( أَحَبَّكَ الَّذي أحبَبْتَني لَهُ )).(٤٥٩)

**واتە: ئەو خوایە خۆشی بووێیت کە منت لەبەر ئەو خۆش دەوێ.**

# ئەگەر موسڵمانێك پێکەنی

**پێی بڵێ:** (( أضحَكَ اللهُ سِنَّكَ )).(٤٦٠)

**واتە: یاخوا هەردەم لە پێکەنین و دڵخۆشیدا بیت.**

# ئەگەر کەسێك پارەو سامانی خستە ڕووت

**پێی بڵێ:** (( بارَكَ اللهُ لَكَ في أهلِكَ وَمالِكَ )).(٤٦١)

**واتە: خوای گەورە فەڕو بەرەکەت و خێری زۆر بخاتە خێزان و ماڵو سامانتەوە.**

---

(٤٥٩) أخرجه أبوداود ٤/٣٣٣برقم(٥١٢٥). وحسنه الألباني في صحيح ابي داود٣/٩٦٥.

(٤٦٠) رواه البخاري الفتح(٣٦٨٣) ومسلم في فضائل الصحابة(٢٣٩٦) عن سعد بن أبي وقاص (رضي الله عنه).

(٤٦١) البخاري مع الفتح ٤/٢٨٨برقم(٢٠٤٩).

# نزاو پاڕانەوە بۆ خاوەن سامان لە کاتی قەرز گەڕاندنەوەدا بۆی

(( بـارَكَ اللهُ لَـكَ فـي أهلِـكَ وَمالِـكَ. إنَّمـاجَزآءُ السَّـلَفِ الحَمْـدُ وَالأدآءُ)). [٤٦٢]

**واتە. خوا بەرەکەت بخاتـە نـاو خێـزان و سـامانتەوە. بـە ڕاسـتی پاداشـتی قـەرز دان سـوپاس کردنـی خـاوەن سـامانەکەو قەرزگەڕاندنەوەیە وەك خۆی.**

# نزاو پاڕانەوەی ترسان لە هاوبەش دانان بۆ خوا( الشِّرك )

(( اللَّهُـمَّ إنّـي أعـوذُ بِـكَ أن أُشْـرِكَ بِـكَ وَأنـا أعلَـمُ. وَأسـتَغْفِرُكَ لِمـا لا أعلَمُ)). [٤٦٣]

---

**(٤٦٢) أخرجه النسائي في عمل اليوم والليلة ص (٣٠٠)(٣٧٢) وابن ماجه ٨٠٩/٢ برقم(٢٤٢٤) وانظر صحيح ابن ماجه ٥٥/٢. وفي روايته: ((... إنّما جزآءُ السّلَفِ الوَفاءُ وَالحَمْدُ ) حديث حَسَن. واتە:... پاداشتی قەرز گەڕاندنـەوە وەفـاو سـوپاس کردنـە لەسەری.**

**(٤٦٣) أحمد ٤٠٣/٤ وغيره وانظر صحيح الجامع ٢٣٣/٣ برقم(٣٧٣١) وصحيح الترغيب والترهيب للالباني ١٢٢/١ برقم(٣٦).**

واتە: خوایە پەنات پێ ئەگرم لەوەی کە هاوبەشت بۆ دابنێم و ئاگادار بم پێی، وە داوای لێخۆشبوونت لیدەکەم لەوەی کە نایزانم و ئاگادار نیم پێی.

## کەفارەتی سوێند خواردن بە غەیری خوا

(هەرکەسێ سوێندی خواردو وتی بە لات و عوزا[٤٦٤] ئەوا با بڵێ: ((لا إلٰهَ إلاّ الله )). وە هەر کەسێك بە هاوڕێکەی ووت: وەرە با قومارت لەگەڵ بکەم با خێرێك بکات).[٤٦٥]

## چی دەڵێ ئەگەر دیارییەك یا خێرێکی دا بە کەسێك و ئەویش پاڕایەوە بۆی یان ئەگەر یەکێ پێی ووتی: ( بارَكَ اللهُ فيكَ )

لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: مەڕێکیان بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەویش فەرمووی: بەشی بکە. وەعائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت) کاتێك خزمەتکارەکە دەگەڕایەوە لەماڵەکان دەیفەرموو: وتیان چی؟ دەیفەرموو:

(٤٦٤) کە ئەم دووانە ناوی دوو بت و پەرستراوی سەردەمی نەفامی بووە، وە بێگومان سوێند خواردن بە هەرشتێکی تر(جگە لەخوای پەروەردگار) هەمان حوکمی هەیەو دروست نیيەو هەمان کەفارەتی دەوێ.

(٤٦٥) البخاري ٤٦٧/١١ ومسلم (١٦٤٧) عن أبي هريرة(رضي الله عنه).

**دەیانووت:** ( بارَكَ اللهُ فيكم ) **واتە: خوا بەرەكەت بخاتە ناوتان.**
**عائیشەش دەیفەرموو:** (( ( وَفيهِم بارِكَ اللهُ ) نَردُ عَلَيهِم مِثلَ ماقالوا، وَيَبقى أجرُنا لَنا )).(٤٦٦)

**واتە: خوای گەورە بەرەكەت بڕژێ بەسەر ئەوانیشدا، چییان ووت پێیان دەڵێینەوە وە پاداشتەكەشمان بۆ خۆمان دەمێنێتەوە.**

## پاڕانەوەی بە دڵدا هاتنی ڕەشبینی و شوومی( الطِّيرة )

(( اللَّهُمَّ لا طَيرَ إلاّ طَيرُكَ. وَلاخَيرَ إلاّ خَيرُكَ. وَلا إلهَ غَيرُكَ )).(٤٦٧)

**واتە: خوایە هیچ شتێك (لە باڵندەو شتی تر) سوودو زیان ناگەیەنێ جگە لە تۆ. وە هیچ خێرێك جێگەی ئومێد نییە جگە لە خێری تۆ. وە هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە تۆ.**

---

(٤٦٦) أخرجه ابن السني ص (١٣٨) برقم (٢٧٨) وانظر الوابل الصيب لابن القيم ص(٣٠٤) تحقيق بشير محمد عيون. وقال الألباني في تحقيق الوابل الصيب ص١٧٥: إسناده جيد.

(٤٦٧) أحمد ٢/٢٢٠ وابن السني برقم ٢٩٢ وصحَّحَه الالباني في الاحاديث الصحيحة٣/٥٤ رقم (١٠٦٥).

تێبینی/ بەلاّم ووشەی گەشبیناوی (الفأل) پێغەمبەر(ﷺ) پێی خۆش بووە،بۆیە ووشەیەكی خۆشی لەكابرایەك بیستو پێی خۆش بوو فەرمووی: (( أخذنا فألَكَ من فيك)) واتە: ووشەیەكی گەشبیناویمان لە دەمی خۆتەوە وەرگرت). ابو داود برقم(٣٩١٧) وأحمد. وصحَّحَهُ الألباني في الصحيحة ٣٦٣/٢ عند ابي الشيخ في أخلاق النبي (ﷺ) ص (٢٧٠).

## پاڕانەوەی سوار بوونی وڵاغ

وعن مُحَمَّدُ بْنُ حَمْزَةَ عن عمرو الأسلَمي أنَّه سَمِعَ أباهُ يَقولُ سَمِعتُ رَسولَ اللهِ(ﷺ) يَقولُ: ((عَلَى (ظَهْرِ) كُلِّ بَعِيرٍ شَيْطَانٌ فَإِذَا رَكِبْتُمُوهَا فَسَمُّوا اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ وَلَا تُقَصِّرُوا عَنْ حَاجَاتِكُمْ)).(٤٦٨)

**واتە: لەسەر پشتی هەموو ووشترێك شەیطان هەیە، جا هەركاتێ سواری بوون ناوی خوای گەورە بهێنن و كەمتەرخەمی مەكەن لە پێویستی و كاروبارەكانتان.**

## پاڕانەوەی سوار بوونی وڵاغ یان ئامێری گواستنەوە

(( بِسمِ الله (**سێ جار**). الحَمدُ للهِ. ﴿ سُبْحَـٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَـٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ، وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴾ الحَمدُللهِ. الحَمدُ للهِ. الحَمدُللهِ. اللهُ أكبر. أللهُ أكبر أللهُ أكبرُ. سُبحانَكَ اللهُمَ إنّي ظَلَمْتُ نَفسي، فاغفِرْ لي، فإنّهُ لا يَغفِرُ الذُّنوبَ إلاّ أنتَ )).(٤٦٩)

---

(٤٦٨) رواه أحمد والطبراني وإسنادهما جيد وصححه الألباني انظر حديث رقم (٤٠٣١) في صحيح الجامع . وانظر صحيح الترغيب والترهيب(١١٤/٣) برقم(٣١١٤).

(٤٦٩) أبوداود ٣٤/٣ برقم(٢٦٠٢) والترمذي ٥١٠/٥ برقم(٣٤٤٦) وفيه: (...بسم الله ثلاثا...) وانظر صحيح الترمذي ١٥٦/٣. وانظر صحيح الكلم الطيب(١٢٦/١٧٢)، وصحيح أبي داود(٢٣٤٢) وە تیایدا هاتووە: (...پاشان عەلی كوری ئەبو طالب(ڕەزای خوای لێ بێت) پێكەنی، ووتم: بە چی پێكەنیت ئەی ئەمیری ئیمانداران؟ فەرموی: پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی ئاوای كرد كە من كردم پاشان پێكەنی. ووتم: لە چ شتێك پێكەنیت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ فەرموی: خوای پەروەردگارت عەجایەبی لە عەبدێكی دێت كاتێ دەڵێت: پەروەردگار لە گوناهەكانم خۆشبە، بە ڕاستی كەس لە گوناهەكان خۆش نابێت جگە لە تۆ).

**واته: (خۆم پەنا ئەدەم)بە ناوی خوا. هەموو ستایش بۆ خوا. پاکی و بێ کەم و کورتی و گەورەیی بۆ ئەو خوایەی ئەمەی بۆ ژێربار خستوین و ئێمە دەستەڵاتمان نەبوو بە سەریدا، وە ئێمە(لە ڕۆژی دواییدا) بۆلای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە. سوپاس و ستایش بۆ خوا... خوا گەورەترە لە هەموو شتێك... پاکی و بێ کەم و کورتی و گەورەیی بۆ تۆیە خوایە من ستەمم لە نەفسی خۆم کردووەو لێم خۆش بە. بەڕاستی کەس لە گوناه خۆش نابێ جگە لە تۆ.**

# نزاو پاڕانەوەی چوون بۆ گەشت ( سەفەر )

١- (( اللهُ أكبَـرُ. اللهُ أكبَـرُ. اللهُ أكبَـرُ. ﴿سُبۡحَـٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَـٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ ، وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ﴾ اللَّهُـمَّ إنّا نَسـأَلُكَ في سَفَرِنا هذا البِرَّ وَالتّقوَى. وَمِنَ العَمَلِ ما تَرضَى.اللَّهُمَّ هَوِّنْ عَلَينا سَفَرَنا هذا وَاطْوِ عَنّا بُعْدَهُ. اللَّهُمَّ أنتَ الصّاحِبُ في السَّفَرِ. وَالخَليفَةُ في الأَهْلِ. اللَّهُـمَّ إِنّي أعوذُ بِكَ مِنْ وَعْثآءِ السّفَرِ. وَكَآبَةِ المَنْظَرِ. وَسُوءِ المُنقَلَـبِ فـي المـالِ والأَهْـلِ )). **وە ئەگەر گەڕایەوە لەسەفەر دەیلێتەوەو ئەمەی بۆ زیاد دەکات:** ((آيبونَ. تائِبونَ. عابِدونَ. لِرَبِّنا حامِدونَ )).(٤٧٠)

---

**(٤٧٠) مسلم ٢/٩٩٨ برقم(١٣٤٢).وفي رواية: ((آيبونَ إنْ شاءَ الله...)).وە بڕوانە تەفسیری ئایەتی (١٢- ١٣-١٤)ی سورەتی(الزخرف).**

واتە: خوا گەورەترە لە هەموو شتێك ... پاكی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی ئەمەی بۆ ژێر بار خستووین و ئێمە دەستەڵاتمان نەبوو بەسەریدا، وە ئێمە(لە ڕۆژی دواییدا)بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە. خوایە لەم سەفەرەماندا داوات لێ دەكەین هیدایەتمان بدەیت بۆ ئەنجامدانی كردەوە چاكەكان و خۆپاراستن لە تاوان كردەوە خراپەكان و ئەنجامدانی كردەوەیەك كە پێی ڕازی بیت. خوایە ئەم گەشتەمان بۆ ئاسان بكەو دوورییەكەیمان بۆ نزیك بخەرەوە. خوایە تۆ ئاگات لێمانە(پشتیوان وتەوفیق دەرو پارێزەرمانی) لە گەشتەكەمانداو تۆ پارێزەری كەس وكارمانی(كە جێمان هێشتون). خوایە پەنات پێ ئەگرم لە ماندوێتی و ناڕەحەتی سەفەرو غەمباری ڕواڵەت و شتێك كە غەمبارم بكات و خراپ گەڕانەوە بۆ ماڵ و خێزان (بەوەی كە شتێكیان لێ ببینم دڵ تەنگم بكات)... گەڕاینەوە بە سەلامەتی و چاكەوە (ئەگەر خوا ویستی لێ بێت). بەتەوبەكردن لە گوناه و لەسنوور دەرچوون. وە بە موخلیصی و پەرستشەوە، ستایشی پەروەردگارمان دەكەین (لەسەر هەموو نیعمەت و ئاسانكارییەكانی).

**٢- پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر بچوایە بۆ سەفەر و سواری وولاغەكەی بووایە سێ جار (الله اكبر)ی دەكردو دەیفەرموو:**

﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ، وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ﴾. **پاشان دەیفەرموو:** «اللَّهُمَّ إني أَسأَلُكَ في سَفَري

هذا مِنَ البِرِّ وَالتَّقوى، وَمِنَ العَمَلِ ما تَرضَى، اللَّهُمَّ هَوِّن عَلَينا المَسيرَ، وَاطوِ عَنّا بُعدَ الأَرضِ، اللَّهُمَّ أَنتَ الصّاحِبُ في السَّفَرِ، وَالخَليفَةُ في الأَهلِ، اللَّهُمَّ اصْحَبْنَا في سَفَرِنا، وَاخلُفنا في أَهلِنا))، **وه كه دهگهڕایهوه بۆ ناو كهسوكاری دهیفهرموو:** ((آيبونَ إن شاءَ اللهِ. تائِبونَ. عابِدونَ. لِرَبِّنا حامِدونَ)).(٤٧١)

**٣- پێغهمبهری خوا(ﷺ) ئهگهر سهفهری بكردایه سواری وولاغهكهی دهبوو پهنجهی ئاوا لێ دهكرد(شوعبه پهنجهی درێژ دهكرد)و دهیفهرموو:** ((اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ فِي الْأَهْلِ، اللَّهُمَّ اصْحَبْنَا بِنُصْحِكَ، وَاقْلِبْنَا بِذِمَّةٍ، اللَّهُمَّ ازْوِ لَنَا الْأَرْضَ، وَهَوِّنْ عَلَيْنَا السَّفَرَ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ)).(٤٧٢)

**واته: ئهی خوایه تۆ ئاگادارمی له گهشتهكهمداو ئاگاداری كهسوكارمی. خوایه به ئامۆژگاری خۆت ئاگات لێم بێت و به چاودێری خۆت بمانگێڕهوه مهنزڵگا. خوایه زهویمان بۆ بێنهوه یهك و گرانی و ناڕهحهتی گهشتمان لهسهر ئاسان بكه، خوایه من پهنات پێدهگرم له ناسۆری گهشت و به غهمباری گهڕانهوه.**

---

**(٤٧١) أخرجه الترمذي(٣٤٤٧) وصححه الألباني في صحيح الترمذي٤٤٧/٧ وانظر صحيح أبي داود(٢٣٣٩).**

**(٤٧٢) أخرجه الترمذي برقم(٣٤٣٨) وصححه الألباني في صحيح الترمذي٤٣٨/٧ وانظر صحيح أبي دواد(٢٣٣٩).**

**٤- پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر سەفەری بکردایە دەیفەرموو:** ((اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِى السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ فِى الأَهْلِ، اللَّهُمَّ اصْحَبْنَا فِى سَفَرِنَا، وَاخْلُفْنَا فِى أَهْلِنَا، اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ، وَمِنَ الْحَوْرِ بَعْدَ الْكَوْنِ، وَمِنْ دَعْوَةِ الْمَظْلُومِ، وَمِنْ سُوءِ الْمَنْظَرِ فِى الأَهْلِ وَالْمَالِ)).(٤٧٣)

**واتە: ئەی خوایە تۆ ئاگادارمی لە گەشتەکەمداو ئاگاداری کەسوکارمی. خوایە پارێزەرو پشتیوانمانبە لە گەشتەکەمانداو کەسوکارەکانمان بپارێزە کە جێمان هێشتوون، خوایە پەنات پێ ئەگرم لە ماندوێتی و ناڕەحەتی سەفەرو غەمباری رواڵەت و شتێك کە غەمبارم بکات لە کاتی گەڕانەوەمان لەسەفەر، وە پەنات پێ ئەگرم لە گۆڕانی حاڵ(لە ئیمانەوە بۆ کوفرو لە گوێڕایەڵیەوە بۆ سەرپێچی)، وە لە پاڕانەوەی ستەم لێکراوو خراپ گەڕانەوە بۆ ماڵو خێزان (بەوەی کە شتێکیان لێ‌ببینم دڵ تەنگم بکات).**

**٥-کاتێ هاوەڵان لە سەفەریاندا گەڕانەوەو نزیك بونەوە لە شاری مەدینە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی:** ((آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ)) **بەردەوام ئەمەی دەفەرموو هەتا دەچووە ناو مەدینەوە.**(٤٧٤)

---

**(٤٧٣) أخرجه الترمذي(٣٤٣٩) ويروي: (الحور بعد الكور) وصححه الألباني في صحيح الترمذي٤٣٩/٧. وانظر ابن ماجه(٣٨٨٨).**

**(٤٧٤) صحيح البخاري (رقم:٣٠٨٥)، وصحيح مسلم (رقم:١٣٤٥).**

# ئەو شتانەی پەنا دەگری بە خوای گەورە لێی لە گەشتدا

**لە عبدالله ی کوڕی سرجس(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەفەرمویٚ:**

﴿ کان رسول الله(ﷺ) إذا سافرَ يَتَعَوَّذُ من وَعثاءِ السَّفَرِ وَكآبةِ المُنقَلَبِ، وَالحورِ بعْدَ الكور. وَدعوة المظلوم، وَسوء المنظر في الأهلِ وَالمالِ﴾.(٤٧٥)

**واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر سەفەری بکردایە پەنای دەگرت بەخوای گەورە لە ناسۆری گەشت و غەمباری ڕواڵەت و گەڕانەوە بە غەمباری و لە نوقسانی دوای زیادە( یان لە خراپ بوونی کاروبارمان دوای چاك بوونی)(٤٧٦)وە لە پاڕانەوەی ستەم لێکراوو خراپ گەڕانەوە بۆ ناو کەس و کارو ماڵ و سامان.**

# نزاو پاڕانەوەی چوونە ناو گوندێك یان شارێك

﴿ اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمواتِ السَّبعِ وَما أظْلَلْنَ. وَرَبَّ الأرضِينَ السَّبعِ وَما أقْلَلْنَ. وَرَبَّ الشّياطينِ وَما أضلَلْنَ. وَرَبَّ الرِّياحِ وَما ذَرَيْنَ. أسأَلُكَ

---

(٤٧٥) رواه مسلم ١١١/٩ والنسائي ٢٧٢/٨.

(٤٧٦) انظر النهاية لإبن الأثير ٤٥٨/١.

خَيرَ هـذهِ القَريَـةِ. وَخَيـرَ أهلِهـا. وَخَيـرَ مـا فِيهـا. وأعـوذُ بَـكَ مِنْ شَـرِّها. وَشَرِّ أهْلِها. وَشَرِّ ما فِيها )).(٤٧٧)

**واته: خوایه پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و هەموو ئەوەی سێبەری بۆ دەکات(لە ئەستێرەو مانگ و خۆرو زەوی)، وە پەروەردگاری حەوت چینەکەی زەوی‌و ئەوەی لەسەر پشتی خۆی هەڵی گرتووە (لە دروستکراوان). پەروەردگاری شەیطانەکان‌و ئەوانەی گومڕایان کردوون. پەروەردگاری (با)کان و ئەوەی لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن. داوای خێر و چاکەی ئەم گوندە(لە مانەوە بە سەلامەتی تێیدا)و چاکەی خەڵکەکەی(لە ئیمان و دامەزراوی و یارمەتی دانیان لەسەر خێر و کۆبونەوەیان لەگەڵ زاناو پیاوچاکان و ناسیاوان)و ئەو چاکەیەت لێ‌دەکەم کە تیایدایە( لە خەڵك و جێگاو خۆراك)و پەنات پێ‌دەگرم لەخراپەکەی‌و خراپەی خەڵکەکەی‌و خراپەی ئەوەی تیایەتی.**

(٤٧٧) الحاكم وصَحّحَهُ وَ وافقَهُ الذَهَبي ٢/١٠٠ وابن السني برقم (٥٢٤) وحَسَّنَهُ الحافظ في تخـريج الاذكـاره/١٥٤. قـال ابـن بـاز: و رواه النسـائي في عمـل اليـوم والليلـة برقم(٥٤٧–٥٤٨) بإسناد حسن. انظر تحفة الاخيار ص (٣٧). وصحيح الكلم الطيب ص ٦٧.

# نزای چوونه بازاڕ

(( لآ إلـهَ إلاّ اللهُ وَحـدَهُ لا شـريكَ لَـهُ. لَـهُ المُلْـكُ وَلَـهُ الحَمـدُ. يُحْيـي وَيُميـتُ. وَهـوَ حـيٌّ لا يمـوتُ. بِيَـدِهِ الخَيـرُ، وَهـوَ عَلَـى كُـلّ شـيءٍ قَديرٌ)).(٤٧٨)

**واتـە: هـیچ پەرسـتراوێك نییـە بـە هـەق جگـە لـە (الله) تـاكی بـێ هاوەڵەو هەمووو موڵك و ستایش بۆ ئەوەو ئەژیەنێ‌و ئـەمرێنێ‌و خۆی زیندووەو هەرگیز نامرێ. هەموو خێرو چاكەیەك بەدەست ئەوەو بەسەر هەموو شتێكدا بە تواناو دەستەڵاتدارە.**

# لە كاتی خلیسكان و هەڵدێرانی ئامێری سواری یان سەرسم دانی دا

**بڵێ** (( بِسْمِ اللهِ )).(٤٧٩)

**واتە: (خۆم پەنا ئەدەم)بەناوی خوای گەورە.**

---

**(٤٧٨) هەركەسێ ئەمە بڵێ خوای گەورە هەزار هەزار(ملیونێك) چاكەی بۆ دەنوسێ و هەزار هەزار گوناهی لێ هەڵدەوەرێنێ و هەزار هەزار پلە (لەبەهەشتدا)بەرزی دەكاتەوە (وە ماڵێكی لـە بەهەشـت دا بـۆ دروسـت دەكـات). الترمـذي ٢٩١/٥ بـرقم(٣٤٢٩) والحـاكم٥٣٨/١ وحسـنه الالبـاني في صـحيح ابـن ماجـه ٢١/٢ وفي صـحيح الترمذي١٥٢/٣. وزيادة ما بين المعكوفين في صحيح الجامع برقم(٦٢٣١) وصحيح وضعيف الجامع الصغير١٧٦/٢٣ برقم(١١١٧٦).**

**(٤٧٩) أبوداود ٢٩٦/٤ برقم(٤٩٨٢) وصححه الالباني في صحيح أبي داود ٩٤١/٣.**

# نزاو پاڕانەوەی ئەو کەسەی دەچێت بۆ گەشت

# ( المُسافر ) بۆ جێماوەکان لە کەس و کاری

(( أستودِعُكُمُ اللهَ الَّذي لا تَضيعُ وَدائِعُهُ )). (٤٨٠)

**واتە: ئەتان سپێرم بەو خوایەی کە سپاردە زایە ناکات (واتە ئەتانخەمە پاراستن و چاودێری).**

# پاڕانەوەو ئامۆژگاری جێماو

# بۆ ئەو کەسەی دەچێت بۆ گەشت

١- (( أستَودِعُ اللهَ دينَكَ. وَأمانَتَكَ. وَخَواتيمَ عَمَلِكَ )). (٤٨١)

**واتە: دین و ئەمانەت(کە بریتییە لە کەس و کاری کە جێی هێشتووە) وە کۆتایی کردەوەکانت دەسپێرم بە خوای گەورە.**

٢- (( زَوَّدَكَ اللهُ التَّقـوَى. وَغَفَـرَ ذَنْبَـكَ. وَيَسَّـرَ لَـكَ الخَيْـرَ حَيثُمـا كُنْتَ)). (٤٨٢)

---

(٤٨٠) أحمد ٤٠٣/٢ وابن ماجه ٩٤٣/٢ برقم(٢٨٨٥) وانظر صحيح ابن ماجه ١٣٣/٢ وصحيح الجامع(٩٥٨).

(٤٨١) أحمد ٧/٢ والترمذي٤٩٩/٥ برقم(٣٤٤٣) والنسائي في عمل اليوم والليلة (٥٢٣) وصحّحَهُ الألباني في صحيح سنن الترمذي برقم(٢٧٣٨) وانظر صحيح الترمذي١٥٥/٢ وە لە ڕیوایەتی الترمذيدا:((...... وَآخِرُ عَمَلِكَ )).

(٤٨٢) الترمذي برقم(٣٤٤٤) وحسنه الألباني انظر صحيح الترمذي ١٥٥/٣.

**واته: خوا تەقوات زیاد بکات و لە گوناهت خۆش بێت وخێرو چاکەت بۆ ئاسان بکات لە هەر جێگەو شوێنێك بوویت( لە سەفەرو غەیری سەفەردا).**

**٣- لە ئەبی هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) پیاوێك ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ئەمەوێت سەفەر بکەم، سا ئامۆژگاریم بکە. ئەویش فەرمووی:** (( عَلَيكَ بِتقوَى اللهِ. وَالتّكبيرُ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ )). **واتە: تەقوای خوات هەبێت و لەسەر هەموو بەرزاییەك تەکبیر** (اللهُ أكبر) **بکە. جا کاتێ پیاوەکە پشتی هەڵکردو ڕۆیشت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:**(( اللَّهُمَّ أطْوِلَهُ الأرضَ. وَهوِّنْ عَلَيهِ السَّفَرَ)). **واتە: خوایە: زەوی بۆ بێنەوە یەك و گەشت و سەفەرەکەی لەسەر ئاسان بکە.**[٤٨٣]

# تەکبیر کردن لە بەرزایی و سەرکەوتن و تەسبیح کردن لە دابەزیندا

قال جابِر(رضي الله عنه): (( كُنّا إذا صَعَدْنا كَبَّرْنا. وَإذا نَزَلْنا سَبَّحْنا)).[٤٨٤]

---

**(٤٨٣) الترمذي برقم(٣٤٤٥). وابن ماجه برقم(٢٧٧١)، وحَسّنَهُ الألباني في السلسلة الصحيحة برقم(١٧٣٠).**

**(٤٨٤) البخاري مع الفتح ١٣٥/٦.**

**واته: جابر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: ئێمە ئەگەر بە شوێنی بەرزدا سەربکەوتینایە – اللّهُ أكبَر – مان دەكردو ئەگەر دابەزینایە – سُبحانَ اللّه – مان دەكرد.**

# پاڕانەوەی گەشتیار ئەگەر پارشێوی بەسەردا هات

(( سَمِعَ سامِعٌ بِحَمدِ اللّهِ. وَحُسنِ بَلائهِ عَلَينا. رَبَّنا صاحِبْنا وَأفضِلْ عَلَينا عائِذاً باللّهِ مِنَ النّار )). (٤٨٥)

**واته: مانای (سمِعَ سامِعٌ) شایەتێك ئاگادار بوو شایەتیدا لەسەر ستایش كردنمان بۆ خوای گەورە لەبەر نیعمەتەكانی و چاك و تاقیكردنەوەمان. وە مانای(سَمَّعَ سامِعٌ): واتە: بیسەری ئەم ووتەیەم گەیاندنی بە غەیری خۆی و ئەویش وەكو ئەمەی ووت بۆ ئاگادار كردنەوە لەسەر زیكركردن لە پارشێوداو لەسەر پاڕانەوە تیایدا. وە پەروەردگار بمانپارێزەو فەزڵی خۆتمان بە سەردا بڕژە بە نیعمەتەكانت و هەموو خراپەیەكمان لێ دوور بخەرەوە.(٤٨٦) ئەمە لە كاتێكدا ئەڵێم كە پەنا ئەگرم بە خوای گەورە لە ئاگری دۆزەخ.**

---

(٤٨٥) مسلم ٢٠٨٦/٤ برقم(٢٧١٨).

(٤٨٦) شرح النووي ٣٩/١٧.

## نزاو پاڕانەوەی گەشتیار ئەگەر دابەزییە جێگایەکلە گەشتەکەیدا یان لە غەیری گەشت دا

**بڵێ:** (( أعوذُ بِكَلِماتِ اللهِ التّامّاتِ مِن شَرِّ ما خَلَقَ )).(٤٨٧)

**واتە: پەنا ئەگرم بە ووتە تەواوە(بێ نوقسانی و شیفادەرە)کانی خوای گەورە لە خراپەی دروست کراوەکانی.**

## نزاو زیکری گەڕانەوە لە گەشت

**لە ابن عمرەوە(ڕەزای خوایان لێ بێت): پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر لەغەزا یان لەحەج یان عەمرە بگەڕایەتەوە لەسەر هەموو بەرزاییيەك سێجار (الله اکبر) ی دەکردو پاشان دەیفەرموو:**

(( لا إلهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ. لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ. وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِيرٌ. آيبونَ. تائِبونَ. عابِدونَ.{ساجِدونَ}. لِرَبِّنا حامِدونَ. صَدَقَ اللهُ وَعْدَهُ. وَنَصَرَ عَبْدَهُ. وَهَزَمَ الأحزابَ وَحْدَهُ)).(٤٨٨)

**واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە(الله) تاکی بێ هاوەڵە. هەموو موڵكو ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە. گەڕاینەوە بەتەوبەکردنو پەرستش کردن(لەسەرخستنی**

---

**(٤٨٧) ئەگەر ئەمە بڵێ هیچ شتێك زیانی پێناگەیەنێ تا لەو شوێنەی باردەکات/مسلم٤/٢٠٨٠ برقم(٢٧٠٨).**

**(٤٨٨) البخاري٧/١٦٣ برقم(١٧٩٧) ومسلم ٢/٩٨٠ برقم(١٣٤٤) و ٩/١١٢ وما بين المعكوفين صحيح رواه أبوداود أنظر صحيح الجامع برقم(٤٧٦٩).**

دینەکـــەی) و کوڕنـــوش بردنـــەوە. ســـوپاس و ستایشـــی پـــەروەردگارمان دەکـــەین. خـــوای گـــەورە بەڵێنەکـــەی بەڕاســـت بەجێهێناو بەندەکەی خۆی سەرخستو بەتـەنها خۆی هـەموو کۆمەڵو پارتەکانی شکاند(بە بێ کوشتاری کەس).

## لە کاتی هاتنی شتێکی خۆش یان ناخۆشی دا

١-پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر شتێکی خۆشی بەسەردا بهاتایە دەیفەرموو: (( أَلحَمْدُ للهِ الّذي بِنِعْمَتِهِ تَتِمُّ الصّالِحاتُ )).

واتە: هەموو سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە بە نیعمـەتی ئەوەوە هەموو چاکەکان تەواو دەبێ.

وە ئەگـەر شـتێکی ناخۆشـی بەسـەردا بهاتایـەوە دەیفـەرموو: (( أَلحَمْدُ للهِ على كُلِّ حالٍ )). واتـە: هـەموو سـوپاس و سـتایش بۆ خوایە لەسەر هەموو بارێك.(٤٨٩)

٢-((خوای گەورە هەر نیعمەتێکی دابێت بەسەر هەر عەبدێکدا و وتبێتـــی: الحمـدلله، ئـــیلا ئـــەوەی کـــە پێـــی بەخشـــیوە (لـــە سوپاسکردنی خوا) باشترە لەوەی کە لێی گرتۆتەوە.)).(٤٩٠)

---

(٤٨٩) أخرجه ابن السني في عمل اليوم والليلة برقم(٣٧٨) والحاكم وصَحَّحَهُ ١/ ٤٩٩ وصحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع ٤/٢٠١ برقم(٤٦٤٠).

(٤٩٠) رواه ابـن ماجـه بـرقم(٣٨٠٥)، وحسّـنه العلاّمـة الألبـاني كمـا في السلسـلة الضعيفة(٥/٢٤).

## بەشی هەشتەم:

# فەزڵی صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەری خوا( ﷺ )

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴿٥٦﴾ ﴾ (الأحزاب: ٥٦)

واتە: بەڕاستی خواو فریشتەکانی (صەڵاوات دەدەن لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئێوەش (صەڵاوات)ی لەسەر بدەن و سەلامی لیٚ بکەن.

١- وە دەفەرموێت(ﷺ): (( البَخيلُ مَنْ ذُكِرْتُ عِندَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ)).(٤٩١)

واتە: بەخیل ئەو کەسەیە کە لەلایدا ناوم دێنن و صەڵاواتم لەسەر نادات.

٢- وە دەفەرموێت(ﷺ): (( لا تَجعَلوا قَبْرِي عِيداً وَصَلُّوا عَلَيَّ.فَإِنَّ صَلاتَكُمْ تَبلُغُني حَيثُ كُنْتُمْ )).(٤٩٢)

واتە: دوای خۆم گۆڕەکەم مەکەن بە شوێنی کۆبونەوەو یادەوەری و جێگای ئاهەنگ گێڕان (یان جێگایەك بۆ صەڵاوات دان بێن بۆ لام)، وەصەڵاواتم لەسەر بدەن. چونکە صەڵاواتەکانتانم پیٚدەگات لەهەر شوێنێك بن.

---

(٤٩١) الترمذي ٥٥١/٥ برقم(٣٥٤٦) وغيره وانظر صحيح الجامع ٢٥/٣ برقم(٢٧٨٧) وصحيح الترمذي ١٧٧/٣.

(٤٩٢) أبوداود ٢١٨/٢ برقم(٢٠٤٢) وأحمد ٣٦٧/٢ وصحَّحَهُ الألباني في صحيح أبي داود ٣٨٣/٢.

٣- **پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:** (( مَنْ صَلَّى علَيَّ صَلاةً صَلّى اللّهُ عَلَيهِ بِها عَشْراً )).(٤٩٣)

**واتە: هەرکەسێك یەك صەڵاواتم لەسەر بدات خوای گەورە بەهۆیەوە(دە) صەڵاواتی لەسەر دەدات.(٤٩٤)**

٤- **وە دەفەرموێت(ﷺ):** (( إنَّ للهِ مَلآئِكَةً سَيّاحِينَ في الأرضِ، يُبَلِّغوني مِنْ أُمَّتي السَّلامَ )).(٤٩٥)

**واتە: خوای گەورە چەند مەلائیکەتێکی گەڕۆکی هەیە لە زەویدا کە سڵاوی ئومەتەکەمم پێدەگەیەنن کە لێم دەکەن.**

٥- **وە دەفەرموێت(ﷺ):** (( ما مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ، إلاّ رَدَّ اللّهُ عَلَيَّ رُوحِيَ، حَتَّى أَرُدَّ عَلَيهِ السَّلامَ )).(٤٩٦)

**واتە: هیچ کەسێك نییە کە سڵاوم لێ بکات ئیلا خوای گەورە ڕۆحەکەم بۆ دەگێڕێتەوە(یان پێشتر وەك پێغەمبەرانی تریش ڕۆحەکەم بۆ لاشەم گەڕاوەتەوە) لەبەر ئەوە هەتا وەڵامی سڵاوەکەی دەدەمەوە.**

---

(٤٩٣) أخرجه مسلم ٢٨٨/١ برقم(٤٠٨).

(٤٩٤) ئیمامی(الطیبي) دەفەرموێت: ( ئەگونجێ ئەو صەڵاواتەی خوای گەورە ڕواڵەتەکەی ووتەو قسەیەك بێت کە مەلائیکەتەکان دەیبیستن. بۆ ڕێزلێنانێکە بۆ ئەو کەسەی کە صەڵاواتەکەی داوەو تەکریمە بۆ ئەو، وەك خوای گەورە لە فەرموودەی قودسیدا دەفەرموێ: (( وإنْ ذَكَرَني في مَلأٍ ذكرتهُ في مَلأٍ خيرٍ مِنْهُم..)). واتە: ئەگەر ئەگەر لە ناو کۆمەڵێکدا یادم بکات. منیش لە ناو کۆمەڵێکی لەوان چاکتردا باسی دەکەم). بڕوانە تحفة الأحوذي(٦٢٠/٢-٦٢١).

(٤٩٥) النسائي٤٣/٣ والحاكم ٤٢١/٢. وصحَّحَهُ الألباني في صحيح النسائي ٢٧٤/١.

(٤٩٦) أبوداود برقم (٢٠٤١) وحسَّنهُ الألباني في صحيح أبي داود ٢٨٣/١.

٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ(رَضيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ): ((رَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ، وَرَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ دَخَلَ عَلَيْهِ رَمَضَانُ ثُمَّ انْسَلَخَ قَبْلَ أَنْ يُغْفَرَ لَهُ، وَرَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ أَدْرَكَ عِنْدَهُ أَبَوَاهُ الْكِبَرَ فَلَمْ يُدْخِلَاهُ الْجَنَّةَ)).(٤٩٧)

**واته: لوتی ئەو کەسە خۆڵاوی بێت و زەلیل بێت کە لە لایدا ناوی من دەبرێت و صەڵاواتم لەسەر نادات، وە لوتی ئەو کەسە خۆڵاوی بێت مانگی ڕەمەزان دێت بەسەریدا پاشان مانگەکە دەڕوات پێش ئەوەی ئەوەندە کرداری چاکی کردبێت خوای گەورە لێی خۆش بووبێت، وە لوتی ئەو کەسە خۆڵاوی بێت کە دایك و باوکی لە لایدا بن و کەوتبنە تەمەنی پیرییەوە کەچی نەیتوانیبێت بە هۆی چاکە کردن لەگەڵیان بچێتە بەهەشتەوە.**

٧- **وە دەفەرموێت(ﷺ):** ((مَن صَلَّى عَلَيَّ واحِدَةً صَلَّى اللهُ عَلَيهِ عَشرَ صَلَوات، وَحَطَّ عَنهُ عَشرَ خَطيئاتٍ، وَرَفَعَ لَهُ عَشرَ دَرَجاتٍ)).(٤٩٨)

**واتە: هەرکەسێك یەك صەڵەواتم لەسەر بدات خوای گەورە (دە) صەڵەواتی لەسەر دەدات و (دە) تاوانی دەسڕێتەوەو (دە) پلە بەرزی دەکاتەوە.**

---

(٤٩٧) رواه الترمذي(٣٥٤٥) وقال حديث حسن غريب وقال الألباني: حسن صحيح. أنظر صحيح الترغيب والترهيب٢/١٣٩ برقم(١٦٨٠). والمشكاة(٩٢٧) والتعليق الرغيب(٢/٢٨٣) وفضل الصلاة على النبي(ﷺ)(١٦).

(٤٩٨) صححه الألباني في صحيح الجامع برقم(٦٣٥٩). وانظر صحيح الترغيب والترهيب برقم(١٦٥٧).

## بەشی نۆیەم:

# بڵاوکردنەوەی سڵاو

**١- پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:** (( لاتَدخُلُوا الجَنّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا. وَلا تُؤمِنـوا حَتّـى تَحـابُّوا. أوَلا أدُلُّكُـمْ عَلَـى شَـيءٍ إذا فَعَلْتُمُـوُهُ تَحـابَبْتُمْ؟ أفْشُوا السَّلامَ بَينَكُمْ )).(٤٩٩)

**واتـە: ناچـنە بەهەشـتەوە هـەتا بڕواتـان نـەبێ‌و بـڕواو ئیمـانی تەواویتان نابێ هەتا یەکتریتان خۆش نەوێ. ئایا شتێکیان پـێ بڵێم ئەگەر بیکەن لە ناویەکدا خۆشەویست دەبن لای یەك ؟ سڵاو زۆر بڵاو بکەنەوە لە ناو خۆتاندا.**

**٢-** ((أَفْشُوا السَّلَامَ تَسْلَمُوا)).(٥٠٠)

**واتە: سەلام بڵاو بکەنەوە لەناو خۆتاندا سەلامەت دەبن (لە هەموو هۆکارێکی پەرتەوازەیی و جیاجیایی).**

**٢- وە عـەمماری کـوڕی یاسـر(ڕەزای خـوا لێ بێـت) دەفـەرموێت:** (( ثَلاثٌ مَنْ جَمَعَهُنَّ فَقَد جَمَعَ الإيمانَ: الإنصافُ مِن نَفْسِكَ. وَبَذلُ السَّلامِ لِلعالَمِ. وَالإنفْاقُ مِنَ الإقْتارِ )).(٥٠١)

---

(٤٩٩) مسلم برقم(٥٤) وغيره.

(٥٠٠) رواه البخاري في الأدب المفرد(١٢٦٦/٤٧٧) وأحمد٢٨٦/٤ وأبويعلى وابن حبان وأبونعيم. زاد البخاري: (وَالْأَشَرَةُ أَشَـرٌّ) قال أبو معاوية: الأشرة: العبث. وحسنه الألباني في صحيح الجامع برقم(١٠٨٧). والسلسلة الصحيحة٤٨٠/٣ برقم(١٤٩٣).

(٥٠١) البخاري مع الفتح ٨٢/١ قبل حديث رقم(٢٨) عن عَمّار(رضـي الله عنـه) موقوفاً مُعلقاً.

واتــه: ســێ شــت هــەن هەركــەس لــە خۆیــدا كــۆی بكاتــەوە ئەوا(فـەزائیل و خەسـڵەتەكانی) ئیمـانی كۆكردۆتـەوە: ویـژدان هەبوون لە حوكم دان دا بەرامبەر خۆت. وە سڵاوكردن لە خەڵكی. وە بەخشین لە كەم دەستی و هەژاری.

٣- وە لە عبدالله ی كوڕی عومەرەوە(ڕەزای خوایان لەسەر بێت): كـەوا پیاوێك پرسـیاری كـرد لـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) كـە كـام ئیسلام بوونە چاكە بۆم؟(واتە كـام ئادابـەی ئیسـلام و هـەڵگرانی چاكە). فەرمووی: (( تُطعِمُ الطَّعامَ . وَتَقرَأُ السَّلامَ عَلَى مَنْ عَرَفْـتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ )).(٥٠٢)

واتە: خواردن ببەخشەو سڵاو بكـە لـەو كەسـەی كـە دەیناسـی و ئەوەش كە نایناسی.

## چۆن وەڵامی سڵاوی بێبڕوایەك دەدەیتەوە

(( إذا سَلَّمَ عَليكُم أهلُ الكِتابِ فَقولُوا: وَعَلَيكُم )).(٥٠٣)

واتە: ئەگەر خـاوەن كتێبـەكان(گاورو جولەكە)سـڵاویان لێ كـردن بڵێن: لە ئێوە بێ.

تێبینی: سڵاو كردن دروست نییە لە كافرو بێبڕواو دووڕووەكان، مەگـەر ترسـی زەرەرێكـی دیـن و دونیـا بكـەیت لـە ئـەنجامی ئـەو

(٥٠٢) البخاري مع الفتح ١/٥٥ برقم(١٢) ومسلم ١/٦٥ برقم(٣٩).

(٥٠٣) البخـاري مـع الفـتح ١١/٤٢ بـرقم(٦٢٥٨) ومسـلم ٤/١٧٠٥ بـرقم(٢١٦٣). لـە ڕیوایەتێكی تردا دەفەرموێ: (( چونكە لەو كاتەدا پێتان دەڵێن( السَّامُ عَلَيكُم) واتە: مردن بۆ ئێوە بێت )). البخاري ١١/٤٢ ومسلم ٤/١٧٠٦.

سـلاّونەکردنەوە لێـی[٥٠٤] وەك ئیمـامی نـەوەوەی و ابـن العربـی دەفەرموون.[٥٠٥] وە ابن العربی زیاد لەوەش دەفەرموێت: وە دەبێ لە وتنی(السّلامُ عَلَیکم)ەکەش مەبەستت وابێ کەوا خوای گـەورە ئاگادارە بەسەرتانەوە، چونکە(السّلام) ناوێکە لە ناوەکانی خوای گەورە. بەلاّم سلاّوکردن لە مەجلیسێکی تێکەڵ لە کافرو موسڵمان دروستە بە مەرجێ مەبەستت موسڵمانەکانی بێت.[٥٠٦]

## کـاتـێ دوو موسڵمان بەیەك دەگەن و لەیەکتر جیـادەبنەوە

عَنْ أَبِي مَدِينَةَ الدَّارِمِيِّ، وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ، قَالَ: ((كَانَ الرَّجُلانِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ(ﷺ) إِذَا الْتَقَيَا لَمْ يَفْتَرِقَا حَتَّى يَقْرَأَ أَحَدُهُمَا عَلَى الآخَرِ: ﴿وَالْعَصْرِ إِنَّ الإِنْسَانَ لَفِي خُسْرٍ﴾، ثُمَّ يُسَلِّمَ أَحَدُهُمَا عَلَى الآخَرِ)).[٥٠٧]

واتە: کاتێ دوو پیاو لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بەیـەك دەگەیشـتن لەیـەکتر جیانەدەبوونـەوە هـەتا یـەکێکیان سورەتی(والعصـر)ی بەسـەر ئـەوەی تـردا دەخوێنـد، پاشـان یەکێکیان سلاّوی لەوەی تر دەکرد.

---

(٥٠٤) مسلم برقم(٢١٦٧).

(٥٠٥) فتح الباري ١١/ ٤٠

(٥٠٦) ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە. فتح الباري ٣٨/١١.

(٥٠٧) أخرجه الطبراني في الأوسط (٢/١١/٢/٥٢٥٦)، وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة ٣٠٧/٦ برقم(٢٦٤٨).

## بەشی دەیەم:

# هەندێ کاتی جیاوازی تر

## پارانەوە بۆ ئەو کەسەی
## کە جوێنت پێداوەو ئەزیەتت داوە

**لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) کەوا بیستویەتی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە فەرموویەتی:** (( اللَّهُمَّ فأيُّما مُؤمِنٍ سَبَبتُهُ، فاجعَلْ ذلكَ لَهُ قُربَةً إلَيكَ يومَ القِيامَةِ )).(٥٠٨)

**واتە: خوایە قسەم بە هەر ئیمانداریك وتوەو ئەزیەتم داوە(دوعام لێ کردووە بە دوعایەکی لەفزی بەبێ مەبەست) ئەوا بۆی بکەرە نزیك بوونەوەیەك لە خۆت لە ڕۆژی دواییدا.**

## لە کاتی خوێندنی کەڵەشێرو زەڕەی گوێدرێژدا

(( **ئەگەر گوێتان لە دەنگی خوێندنی کەڵەشێر بوو داوای فەزڵی خوای گەورە بکەن** (( اللَّهُمَّ إنّي أسألُكَ مِن فَضلِكَ )) **چونکە مەلائیکەتی بینیوە. وە ئەگەر گوێتان لە دەنگی زەڕینی گوێ درێژ بوو پەنا بگرن بەخوای گەورە لە شەیطان:** (( أعوذُ باللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرّجيمِ )) **چونکە شەیطانی بینیوە** )).(٥٠٩)

---

(٥٠٨) البخاري مع الفتح ١٧١/١١ برقم(٦٣٦١) ومسلم ٢٠٠٧/٤ برقم(٢٦٠١) وە لەفزەکەی: (( فاجعَلْها لَهُ زَكاةً ورَحْمَةً )). واتە: بۆی بکەرە پاك بوونەوەو بەزەیی بۆی.

(٥٠٩) البخاري مع الفتح ٣٥٠/٦ برقم(٣٣٠٣) ومسلم٢٠٩٢/٤ برقم(٢٧٢٩).

# ئەگەر گوێت لە دەنگی سەگ بوو بە شەو

(( إذا سَمِعْتُم نُباحَ الكِلابِ وَنَهيقَ الحَميرِ بِاللَّيلِ، فتَعَوَّذوا بِاللهِ مِنهُنَّ فإنَّهُنَّ يَرَينَ ما لا تَرونَ )).(٥١٠)

**واتە: ئەگەر گوێتان لە دەنگی وەڕینی سەگ و زەڕەی گوێ درێژ بوو بە شەو ئەوا پەنا بگرن بەخوای گەورە لێیان چونکە ئەوان شتێك دەبینن لەو کاتەدا( لە شەیطان و جنۆکە) کە ئێوە نایبینن.**

# موسڵمان چی بڵێ لە کاتی مەدح کردنی موسڵمانێکدا

**پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت:...ئەگەر یەکێ لە ئێوە هەردەبوو بە چاکە باسی هاوەڵەکەی بکات بابڵێ:** (( أحسِبُ فُلاناً وَاللهُ حَسيبُهُ ولا أُزَكِّي على اللهِ أحداً، أحْسِبُهُ – إن كانَ يَعلَمُ ذَاكَ – كَذا وَكَذا)).(٥١١)

**واتە: وا گومان دەبەم و وابزانم کە فڵانە کەس کە خوای گەورەش باشتر دەیناسێ‌و دەزانێ‌و ڕواڵەت و عاقیبەتی کەس بەباش لە قەڵەم نادەم و بڕیار نادەم بەسەر ئەوەی کە تەنها خوای گەورە**

---

(٥١٠) أبوداود ٣٢٧/٤ برقم(٥١٠٣) وأحمد ٣٠٦/٣ وصَحَّحَهُ الألباني في صحيح أبي داود ٩٦١/٣.

(٥١١) رواه مسلم ٢٢٩٦/٤ برقم(٣٠٠٠) والبخاري برقم(٢٦٦٢). لە ئەبی بکرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: پیاوێك لەخزمەتی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) مەدحی پیاوێکی تری کرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: ((ویحك(ماڵوێران))، گەردنی هاوڕێکەت قرتاند، گەردنی هاوڕێکەت قرتاند–دووبارەی دەکردەوە– پاشان فەرموی:......فەرمودەکە...

دەیزانێت، وای دەناسم _ ئەگەر ئەو سیفەتەی تێدا شك برد _ ئاواو ئاوایە.[٥١٢]

---

(٥١٢) تێبینی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کردووە بە خۆڵ کردن بەدەم وچاوی مەدح کەراندا:

عنْ أَبِي مَعْمَرٍ قَالَ: قَامَ رَجُلٌ يُثْنِي عَلَى أَمِيرٍ مِنَ الْأُمَرَاءِ فَجَعَلَ الْمِقْدَادُ يَحْثِي عَلَيْهِ التُّرَابَ وَقَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ) أَنْ نَحْثِيَ فِي وُجُوهِ الْمَدَّاحِينَ التُّرَابَ./مسلم٣٠٠٢

واتە: پیاوێك هەستایە سەر پێو دەستی کرد بە مەدح کردنی ئەمیرێك لە ئەمیرەکان. مقدادیش هەستاو خۆڵی دەکرد بە دەموچاویدا و فەرموی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی پێکردوین کە خۆڵ بکەین بە دەموچاوی مەدحکاراندا.

الخطابي فەرمویەتی: (المَدّاحون) ئەوانەن کە مەدح کردنی خەڵکیان کردۆتە عادەت و کالآیەك ماڵی مەدحکراوەکەی پێوە دەخۆن. بەڵام ئەو کەسەی پیاوێك دەکات لەسەر کارێکی چاك و باش و دەبێتە هۆی هاندانی بۆ ئەنجامدانی کردەوەی تری هاووێنەیو هاندانی خەڵکی بۆ چاولێکردنی لەو جۆرە کارانە ئەم کەسە بەمەدحکار ناژمێردرێت). تحفة الأحوذي٦٢/٧.

ئیمامی نەوەوی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (المقداد)ی راوی فەرمودەکەو کۆمەڵێکی تر کاریان بە ڕوکەشی فەرمودەکە کردووە بەوەی خۆڵیان کردووە بە دەموچاوی مەدح کارەکەدا هەندێکی تر دەڵێن: واتا بێ هیوایان بکەن و هیچیان مەدەنێ لەسەر مەدحەکەیان). شرح النووي على مسلم ١٢٨/١٨.

ابن حجر(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (ابن بطال فەرمویەتی: نەهیەکە دەرهەق بەو کەسانەیە کە زیادەرەوەی دەکەن لە مەدحکردنی کەسێکی تردا بە شتێك مەدحی دەکەن کەتیایدا نیە و ئەمینیش نیت کە مەدحکراوەکە تووشی عوجب ببێت و وا گومان ببات لەو پلە بەرزەدایەو لەوانەیە واز لە کردەوەو زیادەکردنی چاکە بهێنێت و پاڵی لێ بداتەوە لەبەر ئەو وەسف کردنەی.

هەر لەبەر ئەمە زانایان تەئویلی ئەم فەرمودەیەیان واکردووە کە مەبەست پێی ئەو کەسەیە کە مەدحی ڕووبەڕووی خەڵکی دەکات بە بەتاڵ...پاشان پێنج لێکدانەوەی زانایان دێنێتەوە بۆ فەرمودەکە). فتح الباري لابن حجر ٢٢٥/١٧.

## موسڵمان چی دەڵێ ئەگەر بە باش باس کرا

(( اللَّهُمَّ لا تُؤاخِذني بَما يَقولونَ. وَاغفِر لي ما لا يَعلَمونَ [ وَاجعَلني خَيراً مِمّا يَظُنُّونَ] )).(٥١٣)

**واتە: خوایە لەسەر ئەوەی ئەوان دەیڵێن سزام مەدەو لەو گوناهانەم خۆش ببە کە ئەوان نایزانن و لەو مەدح و وەسفە چاکترم بکە کە ئەوان گومانم پێدەبەن.**

## چۆن کەسی ئیحرام بەستوو ( تەلبیە ) دەکات لە حەج یان لە عومرەدا

١- (( لَبَّيكَ اللَّهُمَّ لَبَّيكَ. لَبّيكَ لا شَريكَ لَكَ لَبَّيكَ. إنّ الحَمْدَ وَالنِّعمَةَ. لَكَ وَالمُلكَ. لا شَريكَ لَكَ )).(٥١٤)

**واتە: خوایە وەڵامی دوای وەڵام دەدەمەوە بۆت و بەردەوامم لە گوێ ڕایەڵی بەجێگەیاندنی فەرمانەکانت دا. هیچ هاوبەشێکت نییە. ستایش و نیعمەت و هەموو موڵک بۆ تۆیە. هیچ هاوبەشێکت نییە.**

---

**(٥١٣) ئەگەر یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) مەدح بکرایە دەیفەرموو:..../ البخاري في الأدب المفرد برقم (٧٦١). وصَحَّحَ إسناده الالباني في صحيح الادب المفرد برقم(٥٨٥). وبين المعكوفين زيادة للبيهقي في شعب الايمان ٢٢٨/٤ من طريق آخر.**

**(٥١٤) البخاري مع الفتح ٤٠٨/٣ برقم(١٥٤٩) ومسلم٨٤١/٢ برقم (١١٨٤).**

**٢- وه عومـەر(ڕەزای خـوای لێ بێـت) دەیفـەرموو:** (( لَبَّيكَ اللَّهُمَّ لَبَّيكَ.لَبّيـكَ وَسَـعدَيكَ.وَالخَيرَ فـي يَـديكَ.لبّيكَ وَالرَّغبـاءُ إليـكَ وَالعَمَلُ)).(٥١٥)

**واتـە: خوایـە وەڵامـی دوای وەڵام و گوێڕایـەڵم هەیـە بـۆ فەرمانەکانت. خێروچاکە لـە دەستی تۆدایـە. وەڵامی فـەرمان و ئومێدو هیواو کردار ئەنجام دان بۆ تۆیە.**

**٣- وه لە ئەبی هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفـەرموێ: لـە تەلبیەکردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەبوو دەیفـەرموو:** (( لَبّيكَ إلهَ الحَقِّ )).(٥١٦)

**واته: فەرمانبەرداری تۆم ئەی پەرستراوی بە هەق.**

**<u>تێبینی</u>: لە عەمرەکردن دا کاتێ دەچێتە حەرەمەوە تەلبیە کردن دەوەستێنێو کۆتـایی پێدێنێت.(٥١٧)بـەڵام لـە حـەج کردنـدا لـە دوای ڕەجم کردنی**(الجَمَرةُ العقبة)**ەوە کۆتایی پێدێت.(٥١٨)**

---

**(٥١٥) رواه مسلم ٨/٨٩.**

**(٥١٦) رواه ابن خزيمة في صحيحه برقم(٢٦٢٤) وصَحّحَهُ الألباني في السلسلةالصحيحة برقم(٢١٤٦).**

**(٥١٧) رواه المالك في الموطأ رقم(١١٢٢).**

**(٥١٨) رواه البخاري(١٦٨٥).**

# تەكبیر كردن كاتێ دەگاتە ئەو گۆشەی بەردە ڕەشەكەی تیایە( الرُّكن الأسوَد )

(( پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەسەر حوشترەكەیەوە بە دەوری كەعبەدا سووڕایەوە، هەركاتێ ئەگەیشتە گۆشەكە بەرەو ڕووی ئیشارەتیدەكرد بەشتێك كەپێی بوو وە (اللهُ أكبَر)ی دەكرد)). [519]

# پاڕانەوە لە نێوان گۆشەكەی لای یەمەن ( الرُّكنُ اليَماني )و بەردە ڕەشەكە( الحَجَر الأسودُ )

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە نێوان گۆشەی ڕووی یەمەن و بەردە ڕەشەكەدا دەیفەرموو: ﴿ رَبَّنا آتِنا في الدُّنيا حَسَنةً وَفي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النّار ﴾. [520]

واتە: پەروەردگار لە دونیادا چاكەمان پێ ببەخشە (واتە: لە زانست و كردار، یان لێبوردن و لەش ساغی و ڕۆزی باش، یان ژیانی خۆش، یان قەناعەت، یان نەوەی صاڵح). وە لە دوا ڕۆژدا چاكەمان پێببەخشە (لە لێخۆشبوون و بەهەشت و پلەی بەرز،

---

(519) البخاري مع الفتح ٤٧٦/١ برقم(١٦١٢). (وە مەبەست بە(شت) لە فەرموودەكەدا بریتیيە لە (گۆچانێكی سەرچەماوە) بڕوانە البخاري مع الفتح ٤٧٢/٣.

(520) أبوداود ١٧٩/٢ وأحمد ٤١١/٣ والبغوي في شرح السنة ١٢٨/٧ وحَسَّنَهُ الألباني في صحيح أبي داود ٣٥٤/١. والآية من سورة البقرة/ ٢٠١.

یان هاوریيەتی پێغەمبەران، یان ڕازی بوونی خۆت، یان بینینت، یان بەخزمەت گەیشتنت))، وە لە سزای ئاگر بمانپارێزە.

## پاڕانەوەی وەستان لەسەر( صەفا ) و ( مەروە )

جابر(ڕەزای خوای لێ بێت) لە باسی شێوازی حەجی پێغەمبەردا(ﷺ) دەفەرموێت: ((....کاتێك نزیك بوویەوە لە صەفا فەرمووی: ﴿ إِنَّ الصَّفا وَالْمَروَةِ مِن شَعائِـرِاللهِ ﴾ أبدَأُ بِما بَدَأَ اللهُ بِهِ )).

واتە: ( صەفاو مەروە لە دروشمەکانی خوای گەورەیە کە دایناوە، بەوەیان دەست پێ‌دەکەم کە خوای گەورە دەستی پێ‌کردووە)، بۆیە بە صەفا دەستی پێ‌کردوو سەرکەوت بەسەریدا هەتا چووە سەرەوەو کەعبەی بینی و ڕووی کردە ڕووگە(قیبلە)و خوای گەورەی بە تاك ڕاگرت و بەگەورەی داناو فەرمووی: (( لآ إلهَ إلاّ اللهَ وَحدَهُ لا شَريكَ لَه، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهوَ على كلِّ شيءٍ قَدير. لآ إلهَ إلاّ اللهُ وَحدَهُ . أنجَزَ وَعْدَهُ. وَنَصرَ عَبدَهُ. وَهَزَمَ الأَحزابَ وَحْدَهُ )).

واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە(الله) تاکی بێ هاوەڵەو هەموو موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە. هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە(الله) تاکە. بەڵێنی خۆی هێنایەدی و بەندەکەی خۆی سەرخست و بە تەنیا هەموو کۆمەڵو پارتەکانی شکان.

پاشان لەم نێوانەدا پاڕایەوە. وە سێ جار وەك ئەمەی فەرموو.) فەرموودەكە... وە تیایدا هاتووە كە (چی لەسەر صەفا كرد ئاواشی لەسەر مەروە كرد.....).[521]

## لە كاتی سەعی نێوان صەفاو مەروەدا

(( رَبِّ اغفِر وَارحَم إِنَّكَ أَنتَ الأَعَزُّ الأَكرَم )).[522]

واتە: پەروەردگارم لێم خۆشبەو ڕەحمم پێ بكە بەڕاستی هەر تۆی بە دەستەڵاتی بەخشندە.

## لە كاتی ڕۆیشتندا بەرەو عەرەفە

لە ابن عمرەوە(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەفەرموێت: بەیانییەك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) لە میناوە ڕۆیشتین و كەوتینە ڕێ بەرەوعەرەفات، تیاماندابوو(دەنگی هەڵبڕی بوو) تەلبییەی دەكردو هەشمانبوو تەكبیری(جەژنی بە دەنگی بەرز) دەكرد.[523]

---

(٥٢١) مسلم ٨٨٨/٢ برقم(١٢١٨).

(٥٢٢) رواه ابن أبي شيبة (٦٨/٤و٦٩) عن ابن مسعود وابن عمر رضي الله عنهما بإسنادين صحيحين وعن المسيب بن رافع الكاهلي وعروة بن الزبير ورواه الطبراني مرفوعا بسند ضعيف كما في المجمع (٢٤٨/٣)./ مناسك الحج والعمرة٢٦/١ برقم(٥٥).

(٥٢٣) رواه البخاري ٥٩/١٦ ومسلم ٢٩/٩.

# نزاو پاڕانەوەی ڕۆژی عەرەفە

**( چـاكترین پاڕانـەوە، پاڕانـەوەی ڕۆژی عەرەفەیـە.وە چـاكترین نزایـەك كـە مـن و پێغەمبـەرانی پـێش مـن فەرموویانـە ئەمەیـە:** (( لآ إلهَ إلاّ اللهُ وَحدَهُ لا شَريكَ لَه، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهوَ على كُلِّ شيءٍ قَدير )).(٥٢٤)

# نزاو زیكری لای ( المَشْعَرِ الحَرام ) (٥٢٥)

**جابر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرمووێت:** (( **پێغەمبەری خوا(ﷺ) سـواری**(القَصْوآء) **بـوو- كـە حوشـترەكەی بـوو- هـەتا گەیشـتە** (المَشـعَر الحَـرام)**و ڕووی كـردە ڕووگە(قیبلـە)وە پاڕایـەوەو** ((اللهُ أكبر وَلآ إلهَ إلاّ اللهُ وَحدَهُ لا شَريكَ لَه...)) **ی كردو بەردەوام ئاوا بە پێوە مایەوە هەتا بە تەواوی دنیا ڕووناك بوویەوەو پێش ئەوەی خۆر هەڵبێ ڕۆیشت و دەرچوو** )).(٥٢٦)

---

(٥٢٤) الترمذي برقم(٣٥٨٥) وحَسّنَهُ الألباني في صحيح الترمذي ١٨٤/٣ وفي الأحاديث الصحيحة٦/٤. وە سوننەت وایە جگە لە ووتنی ئەم ذیكرە تەلبیە بكات و بپاڕێتەوە.

(٥٢٥) دەربارەی(المشعر الحرام) ووتراوە بریتیيە لە شاخی(قُزَح) كە شاخێكی بەناوبانگە لە(مزدلفة)دا، وە ئەهلی تەفسیرو سیرەو فەرموودەناسان فەرمویانـە: (المشعر الحـرام) هەموو(مزدلفة) دەگرێتەوە/ انظر شرح النووي على مسلم ٨٩/٨.

(٥٢٦) مسلم ٨٩١/٢ برقم(١٢١٨).

# تەکبیر کردن لە کاتی هاویشتنی زیخەکان لە( مینا ) لەگەڵ هەموو زیخێکدا

**(( پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەرکات زیخێکی دەهاوێشت لە لای(الجِمار)ەکانەوە[٥٢٧] تەکبیر(الله أكبر)ی دەکرد، پاشان دەچووە پێشەوەو دەوەستاو ڕووەو قیبلە دەپاڕایەوە بە دەستی بەرزکردنەوە لەدوای جەمرەی یەکەم و دووەم. بەڵام لەلای(جَمرَة العَقَبَة)دا زیخەکەی دەهاوێشت و تەکبیری دەکرد لەگەڵ هەموو زیخێکداو دەڕۆیشت و لەلایدا نەدەوەستا )).[٥٢٨]**

# پیرۆزبایی کردن لەو کەسەی لە حەج هاتۆتەوە

عَن أَبُو جَمْرَةَ نَصْرُ بْنُ عِمْرَانَ الضُّبَعِيُّ قَالَ: (( تَمَتَّعْتُ فَنَهَانِي نَاسٌ، فَسَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) فَأَمَرَنِي فَرَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنَّ رَجُلًا يَقُولُ لِي: حَجٌّ مَبْرُورٌ، وَعُمْرَةٌ مُتَقَبَّلَةٌ، فَأَخْبَرْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، فَقَالَ: سُنَّةَ النَّبِيِّ(ﷺ) فَقَالَ لِي: أَقِمْ عِنْدِي فَأَجْعَلَ لَكَ سَهْمًا مِنْ مَالِي. قَالَ شُعْبَةُ: فَقُلْتُ: لِمَ؟ فَقَالَ: لِلرُّؤْيَا الَّتِي رَأَيْتُ )).[٥٢٩]

---

**(٥٢٧) سێ جێگای ڕەجم کردنە کە بریتین لە: الجمرة الأولى، الجمرة الوسطى، الجمرة العقبة.**

**(٥٢٨) البخاري مع الفتح ٥٨٣/٣ برقم(١٧٥٢) و ٥٨٤/٣ برقم(١٧٥٣) وە بڕوانە لەفزەکەی لەوێداو البخاري مع الفتح ٥٨١/٣ برقم(١٧٥٠) هەروەها(مسلم)ڕیوایەتی کردووە برقم(١٢٩٦).**

**(٥٢٩) صحيح البخاري٥٦٨/٢ برقم(١٤٩٢) ومسلم(١٢٤٢).**

واتە: ئەبو جەمرە نەصری کوڕی عیمرانی الضبعي فەرمویەتی: تەمەتتوعم کرد(لە مانگی حەجدا) کەچی خەڵکانێك نەهییان لیٚ کردم منیش پرسیارم کرد لە ابن عباس(ڕەزای خوای لیٚ بێت) فەرمانی پیٚ کردم کە بەردەوام بم لە تەمەتوعەکەم، لە خەودا بینیم وەك پیاوێك پێم بڵێت: ((حَجٌّ مَبْرُورٌ، وَعُمْرَةٌ مُتَقَبَّلَةٌ)) واتە: حەج و عومرەیەکی وەرگیراو بێت، منیش هەواڵم دا بە ابن عباس، ئەویش فەرموی: سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێی فەرموم: هەستە لام با بەشێکت لە ماڵ و سامانەکەم بدەمیٚ، شوعبە دەفەرموێت: ووتم بۆچی؟ (ئەبو جەمرە)فەرموی: بۆ ئەو خەونەی کە بینیبوی(واتە لە پاداشتی ئەو خەوە خۆشە وەك ڕێزێك بۆی یان لەبەر ئەوەی لای خەڵکی بیگێڕێتەوە).

## لە کاتی سەرسووڕمان و شتی دڵخۆشکەردا

١- (( سُبحانَ الله )).[٥٣٠] واتە: پاك و بیٚنوقسانی بۆخوایە.

٢- (( اللهُ أكبر )).[٥٣١] واتە: خوا لە هەموو شتێك گەورەترە.

---

(٥٣٠) البخاري مع الفتح ٢١٠/١ برقم(١٥٥) و٣٩٠/١ برقم(٢٨٣) ومسلم برقم(٣٧١) والبخاري٤١٤/١ برقم(٣١٤) ومسلم ١٨٥٧/٤ برقم(٣٣٢).

(٥٣١) البخاري مع الفتح٤٤١/٨ برقم(٤٧٤١) وانظر صحيح الترمذي ١٠٣/٤ و ٢٣٥/٢ ومسند أحمد ٢١٨/٥.

# چی ئەکات ئەگەر هەواڵێکی خۆشی بۆ هێنرا

(كانَ النَّبيُّ(ﷺ) إذا أَتاهُ أَمْرٌ يَسُرُّهُ أو يُسَرُّ بِهِ، خَرَّ ساجِداً شُكراً للهِ تَبارَكَ وَتَعالى ).(٥٣٢)

**واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر هەواڵێکیان بۆ بهێنایە دڵی خۆش بکردایە یان پێی دڵخۆش بووایە کوڕنووشی دەبرد لە سوپاسی خوای گەورەدا.**

# چی دەڵێت ئەگەر لە چاوی خۆی ئەترسا بدا لە شتێك و ببێتە هۆی زیان پێ گەیاندنی

(( [ ماشآءَ اللهُ لا قُوَّةَ إلاّ باللهِ ] اللَّهُمَّ بارِك عَلَيهِ )).(٥٣٣)

**واتە: ئەوەی خوای گەورە ویستی ببێت دەبێ‌و هێزو توانایەك نییە (لەسەر ئەنجامدانی تاعەتی خوا)مەگەر بە کۆمەکی خواوە. خوایە فەڕو بەرەکەتی تێ‌بخە.**

---

(٥٣٢) رواه أهل السنن إلاّ النَّسائِي. انظر صحيح ابن ماجه ٢٣٣/١ وإرواء الغليل ٢/٢٢٦

(٥٣٣) بەشی یەکەمی بڕوانە سورەتی (الكهف) ئایەتی ( ٣٩) . وە بۆ بەشی دووەمیش پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (( ئەگەر یەکێك لە ئێوە شتێکی لەبراکەی یان لە خۆی یان لە ماڵ‌و سامانی‌دا بینی کە سەرسامی کردبوو وە بەلایەوە سەیربوو (با بپاڕێتەوە بۆی بە بەرەکەت). چونکە چاو لێدان ڕاست‌و ڕەوایە)) مسند أحمد٤٤٧/٤ وابن ماجه برقم(٣٥٠٩). ومالك برقم(١٦٩٧-١٦٩٨). وصَحّحَهُ الألباني في صحيح الجامع ٢١٢/١ برقم(٥٥٦) وانظر تحقيق زاد المعاد للأرناؤوط ٤/١٧٠.

کی ذىیەو دروست کراوە.

# ئەگەر لە چاوی یەکێك ترسایت

(( **سورەتی ﴿ الفَلَق ﴾ و ﴿ النّاس ﴾ بخوێنە** )).[٥٣٤]

# ئەگەر کەسێك چاو لێیدا

عن عائِشةَ (رضي الله عنها) قالَت: ((كَانَ يُؤْمَرُ الْعَائِنُ فَيَتَوَضَّأُ ثُمَّ يَغْتَسِلُ مِنْهُ الْمَعِينُ)).[٥٣٥]

**واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی دەکرد بە چاولێدەرەکەو تا دەستنوێژ بگرێت پاشان چاولێدراوەکە خۆی پێ بشوات.**[٥٣٦]

---

(٥٣٤) عَن أَبِي سَعِيدٍ قال: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ) يَتَعَوَّذُ مِنْ الْجَانِّ وَعَيْنِ الْإِنْسَانِ حَتَّى نَزَلَتْ الْمُعَوِّذَتَانِ، فَلَمَّا نَزَلَتَا أَخَذَ بِهِمَا وَتَرَكَ مَا سِوَاهُمَا). أخرجه الترمذي(٢٠٥٨) و ابن ماجة(٣٥١١) بلفظ: (..يتعوذ من عين الجان. ثم أعين الإنس..) وصححه الألباني أنظر صحيح الجامع(٤٩٠٢).

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پەنای دەگرت بە خوای گەورە لە جنۆکەو چاوی مرۆڤ( لە ڕیوایەتەکەی تردا : لە چاوی جنۆکە پاشان چاوی مرۆڤ) هەتا هەردوو سورەتی(الفلق) و (الناس) دابەزین، کاتێ ئەم دوو سورەتە دابەزین ئەمانەی دەخوێندو وازی لە شتی تر هێنا.

ابن القیم(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (جا هەموو چاولێکەرێك حەسودە بەڵام هەموو حەسودێك چاوپیس نی‌یە، جا لەبەر ئەوەی حەسودبەرەکە گشتی ترە لە چاوپیس بۆیە پەنا گرتن بە خوا لە حەسودبەر پەناگرتنە بە خوا لە چاوپیسیش).زاد المعاد٤/١٤٩.

(٥٣٥) أخرجه أبو داود (١٥٣/٢) وعنه البيهقي (٣٥١/٩) وقال الألباني: وهذا سند صحيح على شرط الشيخين. السلسلة الصحيحة٦١/٦ برقم(٢٥٢٢).

(٥٣٦) دوو تێبینی لەسەر چارەسەری چاولێدان:

تێبینی(١): وه چارەسەری چاولێدانیش وەك شێخ عثیمین(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: بەخوێندنی دوعاچارەیە بەسەر کەسەکەدا لەگەڵ خۆشتن بە ئاوی دەست نوێژی کەسی چاولێدەرە../ بۆ درێژەی ئەمە بڕوانە مجموع فتاوی ورسائل ابن عثیمین٢/٩٣، بترقیم الشاملة آليا.

تێبینی(٢): چۆنێتییەکەشی وەك زانایان لە فەرمودەکەی بەسەر هاتی سەهەیلی کوری حەنیف کاتێ عامری کوری ربیعە تەماشای کردو سەهلیش نەخۆش کەوت...وەریانگرتووە بەم جۆرەیە: دەفرێك ئاوی بۆ دێنن هەردوو لەپی دەستی تێ دەخات و ئاو لە دەم ڕادەدات و دەیکاتەو ناوی و پاشان دەموچاوی تێدا دەشوات و پاشان دەستی چەپی تێ دەکات و ئاو دەکات بە لەپی دەستی ڕاستیدا پاشان دەستی چەپی تێ دەخات و ئاو دەکات بە لەپی دەستی چەپیدا، پاشان بەهەمان شێوە ئەنیشکی_وە نێوان ئەنیشك و لەپی دەستەکانی ناشوات) پاشان قاچی پاشان ئەژنۆی پاشان کراس دامێنەکەی تێ هەڵدەکێشێت و دەیشوات (واتە ناوەوەی کراس دامێنەکەی کە بەر لاشەی دەکەوێت، یان ئەو چمکە شۆڕبووەوەی پۆشاکەکەی لای کەلەکەی ڕلستی، هەندێکیش فەرمویانە مەبەست بە دامێنێتی). وە قاپەکە لەسەر زەوی دانانێت، دواتر هەموو ئاوەکە بەیەکجار قلْپ دەکاتەوە بەسەر نەخۆشەکەدا. ئەمەش ووتەی الزهریيە. بڕوانە شرح السنة ـ للإمام البغوی متنا وشرحا١٢/١٦٥-١٦٦ وشرح النووي على مسلم (٧/ ٣٢٧) و فتح الباري-دار المعرفة١٠/٢٠٤. وفتاوی الشیخ محمد صالح المنجد رقم(٢٠٩٥٤).

## ئادابی ماڵ و منداڵ پاراستن

## له کاتی داخستنی دەرگاو دا پۆشینی دەفردا

(( إذا كانَ جُنْحُ اللَّيلِ ـ أوْ أمْسَيتُمْ ـ فَكُفُّوا صِبْيانَكُمْ. فإنَّ الشَّياطِينَ تَنْتَشِرُ حِينَئِذٍ. فإذا ذَهَبَ ساعَةٌ مِنَ اللّيلِ فَخَلُّوهُمْ. وَأغلِقُوا الأبوابَ وَاذكرُوا اسمَ اللهِ. فإنَّ الشَّيطانَ لا يَفْتَحُ باباً مُغْلَقاً. وَأوكُوا قِرَبَكُم وَاذكرُوا اسمَ اللهِ. وَخَمِّروا آنِيَتَكُمْ وَاذكرُوا اسمَ اللهِ. وَلَو أن تَعرُضُوا عَلَيها شَيئاً. وأطْفِئوُا مَصابِيحَكُمْ )).(٥٣٧)

**واته: ئەگەر تاریکی شەو داهات، یان ئێوارەتان بەسەرداهات منداڵەکانتان بگرنەوە لە دەرچوونە دەرەوە. چونکە شەیطانەکان لەو کاتەدا بڵاودەبنەوە. وە کە کاتێك لەشەو ڕۆیشت وازیان لێبهێنن، وە دەرگاکان دابخەن و ناوی خوای گەورە بهێنن چونکە شەیطان دەرگایەکی داخراو ناکاتەوە. وە دەمی مەشکەو کوندەکانتان بەپەت ببەستن و ناوی خوا بهێنن. وەسەری قاپەکانتان بنێنەوەو داپپۆشن و ناوی خوا بهێنن. ئەگەر چی شتێکی بچوکیشی بخەنە سەر. وە چراکانتان بکوژێننەوە.**

---

(٥٣٧) البخاري مع الفتح ١٠/٨٨ برقم(٥٦٢٣) ومسلم٣/١٥٩٥ برقم(٢٠١٢).

# سوننەتەكانی فیطرەت

عنْ عائِشة(رضي الله عنها) قالَتْ: قالَ رسول الله(ﷺ): (( عَشرٌ مِنَ الفِطْرَةِ: قَصُّ الشّارِب، وَإعفاءُ اللَّحيَةِ، وَالسِّواكِ، وَإستنشاقُ الماءِ، وَقَصُّ الأظفارِ، وَغَسلُ البَراجِم، وَنَتْفُ الإبطِ، وَحَلقُ العانةِ، وانتِقاصُ الماءِ )) قال الراوي: ونَسيتُ العاشِرَة إلاّ أن تَكونَ(المَضْمَضَةُ). قال وَكيع – وهو أحَدُ رواتِهِ–: إنتِقاصُ الماءِ: يعني الإستِنجاءَ )).(٥٣٨)

**واتە: (دە) شت لە فیترەتەوەیە: سمێڵ كورت كردنەوە و ڕیش هێشتنەوە و سیواك كردن و ئاو لە لووت وەردان و نینۆك كردن وشۆردنی**(البَراجم): **( كە كۆی(برجمة)یە واتە: ئەو شوێنانەی كە چڵكی تێدا كۆدەبێتەوە وەك خەتی سەر پەنجەكان).وە هەڵكێشان و لابردنی مووی بن باڵ و تاشینی مووی داوێن و شەرمگاو** (إنتقاصُ المآءِ)**.ڕاوی دەفەرموێت: (دە)یەمم لەبیر چۆتەوەو پێم وابێت : ئاو لەدەم وەردانە. وە(وەكیع)– كە یەكێكە لە ڕاوییەكانی– دەفەرموێت:** (إنتقاصُ المآءِ) **واتە: تارەت گرتن و خۆپاكردنەوە بە ئاو.**

---

(٥٣٨) **رواه مسلم(٦٠٣) وأبوداود(٥٣)/ وە لە فەرموودەی تردا بەم جۆرەش هاتووە:عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن رسول الله(ﷺ) قال: (( الفِطرةُ خَمسٌ: الإختِتانُ. والإستِحدادُ. وَقَصُّ الشّارِبِ وَتقليمُ الأظفار. وَنَتفُ الإبطِ )).صحيح. ابن ماجه (٢٩٢)ق (آداب الزفاف ١١٧ وارواء الغليل ٧٣) انظر صحيح سنن النسائي باختصارالسندللالباني ص٥.. واتە: فیترەت پێنجە: یان پێنج شت لە فیترەتەوەیە: خەتەنە كردن و تاشینی مووی شەرمگا و سمێڵ كورت كردنەوە و نینۆك كردن و توكی بن باڵ هەڵكێشان.**

عَنْ أنَس بِن مالِك قالَ: (( وُقِّتَ لَنا رسولُ الله(ﷺ) في قَصِّ الشّارب وَتَقلِيمِ الأظفار. وَحَلْقِ العانَةِ. وَنَتْفُ الإبطِ أن لا نَترُكَ أكثرَ مِنْ أربعينَ يوماً )) وقال مَرّةً أخرى أربعينَ لَيلَةً.(٥٣٩)

**واته: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆی داناوین کە کورت کردنەوەی سمێڵو نینۆك کردنو لابردن و تاشینی مووی شەرمگاو توکی بن باڵ هەڵکێشان لە چل ڕۆژ یان چل شەو زیاتر واز لێ نەهێنین.**

## سمێڵ کورت کردنەوەو ڕیش بەردانەوە

عن ابن عُمَر عَنِ النَّبيِّ(ﷺ) قال: (( أحفُوا الشّوارِبَ، وَأعفُوا اللّحيّ)).(٥٤٠)

**واته: سمێڵ کورت بکەنەوە و ڕیش بهێڵنەوە.**

## کورتی پۆشاك و نەخشاندنی بە دوای خۆیدا

(( ما تَحْتَ الكَعبينِ مِنَ الإزارِ فَفي النّارِ )).(٥٤١)

---

**(٥٣٩) صحيح. ابن ماجه (٢٩٥) م. انظر صحيح سنن النسائي باختصار السند للالباني ص٥.**

**(٥٤٠) الترمذي (٢٩٢٥) و (٢٩٢٦): ق ( رياض الصالحين ١٢١٣ وصحيح الجامع ٢٠٧ ) انظر صحيح سنن النسائي باختصار السند للألباني ص(٦).**

**(٥٤١) رواه الامام أحمد ٢٥٤/٦ وهو في صحيح الجامع (٥٥٧١). و البخاري هێناویەتی(٢١٨/١٠) بە لەفزی: (( ما أسفَلَ منَ الكَعبَينِ منَ الإزارِ ففي النّارِ )) عن أبي هريرة(رضي الله عنه).**

واته: ئەوەی کە ئەکەوێتە ژێر دوو قولە پێکەوە لە پۆشاك لە ئاگردایە.

---

تێبینییەکی گرنگ:

جیاوازی نی‌یە لەمەدا لە نێوان پۆشاکی(عەرەبی یان کوردی یان فارسی یان تورکی یان... هتد.

ئیمامی النّووی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ( پۆشاك درێژی لە کراس دامێن و قەمیص و عەمامە دایە. وە دروست نی‌یە ئەگەر بۆ خۆبەزل زانی‌و فیز بوو بهێڵرێتەوە تا خوار قولەپێکان. خۆ ئەگەر بۆ فیز نەبوو مەکروهە........وە موستەحەبە تا ناوەڕاستی قاچ بێت. وە دروستیشەو مەکروهە نی‌یە کە بگاتە دوو قولەپێکە . بەڵام لەوە دابەزێ یاساغ کراوە لە شەرع دا، خۆ ئەگەر بە فیزیشەوە بێت ئەوە مەنع کراوە بە مەنعی تەحریم..). شرح النووي على مسلم (٧/ ١٦٨) .

وەئیبن حەجەر(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە(فَتحُ الباري) دا دەفەرموێت: ( وە قاضي عیاض ئیجماعی هێناوە لەسەر ئەوەی ئەم مەنعە دەرهەق بە پیاوانەو ئافرەتان ناگرێتەوە(واتە درێژکردنەوەی پۆشاك تا خوار قولەپێکان). پاشان دەفەرموێ: (بەهەرحاڵ پیاوان دوو حاڵەتیان بۆ هەیە: یەکێکیانە باشەو ئیستحبابەو ئەویش ئەوەیە کە پۆشاکەکەی کورت بکاتەوە تا ناوەڕاستی ئێسقانی قاچی. وە حاڵەتێکی تریش کە دروستەو جائیزە تا دوو قولەپێکە). فتح الباري لابن حجر (١٦/ ٣٣٣).

وە ئەگەر ئەم کارەی بۆ فیزو خۆبەزل زانی دەکرد ئەوا سزاکەی سەخت تر دەبێت و ئەم جۆرە کەسانە لە ڕۆژی دواییدا لەو کەسانەن کە خوای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکات و تەماشایان ناکات و لە گوناه پاکیان ناکاتەوەو سزایەکی ئازاراویان بۆ هەیە. رواه مسلم(١٠٦) عن أبي ذر (رضي الله عنه).

## بەشی یانزەهەم:

# داوای لێخۆش بوون كردن و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە ( الإستِغفار والتَّوبةَ )

**١- پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت:** (( وَاللهِ إنّي لأستَغْفِرُ اللهَ وَأتوبُ إلَيهِ في اليَومِ أكثَرَ مِنْ سَبعينَ مَرَّةٍ )).[٥٤٢]

**واتە: سوێند بەخوا من لە ڕۆژێكدا زیاد لە حەفتا جار داوای لێخۆشبوون دەكەم لە خوای گەورەو دەگەڕێمەوە بۆلای.**

**٢- وە چاك وایە لە ڕۆژێكدا(سەد) جار بوترێ:** (( أستَغفرُ اللهَ وَأتوبُ إليهِ )). **چونكە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەنجامی داوە.**[٥٤٣]

**واتە: داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەكەم و دەگەڕێمەوە بۆلای.**

**٣- وە دەفەرموێت(ﷺ):** (( يا أيُّها النّاسُ تُوبوا إلى اللهِ. فإنّي أتوبُ في اليَومِ إلَيهِ مِائةَ مَرَّةٍ )).[٥٤٤]

**واتە: ئەی خەڵكی بگەڕێنەوە بۆ لای خوا. بە ڕاستی من لە ڕۆژێك دا(سەد)جار دەگەڕێمەوە بۆلای.**

---

(٥٤٢) البخاري مع الفتح ١٠١/١١ برقم(٦٣٠٧).

(٥٤٣) أخرجه ابن ماجه برقم(٣٨١٥) . وصححه الألباني أنظر السلسلة الصحيحة٤٣٥/٣ برقم(١٤٥٢).

(٥٤٤) مسلم ٢٠٧٥/٤ برقم(٢٧٠٢).

**٤- وه دهفـهرمویْت**(ﷺ): (( مَنْ قـالَ ( أسْتَغْفِرُ اللهَ العَظِيمَ الَّذي لآ إلـهَ إلاّهـوَ الحَـيُّ القَيّـومُ وَأتـوبُ إلَيـهِ) غُفِـرَ لَـهُ، وَإنْ كـانَ فَـرَّ مِـنَ الزَّحفِ)).(٥٤٥)

**واتـه: هەرکەسـێك بڵـێ: داوای لێخۆشـبوون دەکـەم لـەو خـودا مەزنەی کە هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لەو، وە زیندووی هەڵسـووڕێنەری بوونـەوەرەو دەگەڕێمـەوە بـۆ لای. ئـەوا خـوای گەورە لێی خۆش دەبێ ئەگـەر چی لـە کـاتی بەرەنگاربوونـەوەی سوپا لەگەڵ دوژمن پشتی هەڵکردبێو ڕای کردبێ.**

**٥- وه دهفـهرمویْت**(ﷺ): (( طُوبَى لِمَنْ وُجِدَ فـي صَـحيفَتهِ إستِغفارَاً كَثيراً )).(٥٤٦)

**واتـه: خـۆش بـەختی( یـان طوبا کـە دارێکـە لـە بەهەشـت دا) بـۆ کەسێك کە لە نامەی کردەوەکانیدا داوای لێخۆشبوون کردنی لە خوای گەورە زۆر تێدا بێت.**

**٦- وه دهفهرمویْت**(ﷺ): (( أقرَبُ ما يَكونُ الرَّبُّ مِنَ العَبْدِ في جَوْفِ اللَّيلِ الآخِرِ. فَإنِ استَطَعْتَ أن تَكونَ مِمَّنْ يَذكُرُ اللهَ في تِلْكَ السَّاعَةِ فَكُنْ )).(٥٤٧)

---

(٥٤٥) أخرجـه أبـوداود٢/٨٥ بـرقم(١٥١٧) بـدون(...العظـــيم...) والترمـذي٥/٥٦٩ برقم(٣٥٧٧) واللفظ لـه. ورواه الحـاكم مـن حـديث ابـن مسـعود وقـال صـحيح علـى شـرطهما إلا أنـه قـال: يقولها ثلاثـا.. وصـححه الألبـاني أنظـر السلسـلة الصـحيحة برقم(٢٧٢٧).

(٥٤٦) رواه ابن ماجه (٣٨١٨) والنَّسائي في عمل اليوم والليلة ٤٥٥ وصحّحَهُ الألباني في صحيح الجامع ٣٩٣٠.

(٥٤٧) أخرجه الترمذي(٣٥٧٩) وغيره وصححه الألباني في صحيح الجامع(١١٧٣).

واتە: نزیکترین کاتێك کە پەروەردگار لە بەندەکەیەوە نزیك بێت لە سێ بەشی کۆتایی شەودایە(ئەو کاتەی خوای گەورە دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا). ئەگەر توانیت لەو کەسانەبێت کە یادی خوای گەورە دەکەن لەو کاتەدا ئەوا ببە.

٧- وە دەفەرموێت (ﷺ): (( أَقْرَبُ ما يَكونُ العَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهوَ ساجِدٌ فأكثِروا الدُّعآءَ )).(٥٤٨)

واتە: نزیکترین کات کە بەندە لە پەروەردگارییەوە نزیکە لە کاتی کوڕنووش بردنیدایە. دەسا لەو کاتەدا زۆر بپاڕێنەوە تیایدا.

٨- وە دەفەرموێت(ﷺ): (( إنَّهُ لَيُغانُ عَلى قَلْبي، وَإِنّي لأَستَغْفِرُاللهَ في اليَومِ مِائةَ مَرَّةٍ )).(٥٤٩)

واتە:تارمایی دێت بەسەر دڵم داو بیرم دەچێ. وە من لە ڕۆژێك دا (سەد)جار داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکەم.

---

(٥٤٨) مسلم ٣٥٠/١ برقم(٤٨٢).

(٥٤٩) أخرجه مسلم ٢٠٧٥/٤ برقم(٢٧٠٢). ابن الاثير دەفەرموێت: (لَيُغانُ عَلَى قَلْبي) واتە: دایدەگرێتەوەو دایدەپۆشێ. وە مەبەست پێی (بیرچونەوەیە). چونکە پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوام لە زیادە ذیکرکردنو نزیك بوونەوەو بەردەوامێتی چاودێری خۆکردن دا بووە. بەڵام کاتێ ئاگای لێنەمایە لە هەندێ کاتەکانیدا یان بیری بچوایە ئەوا بە گوناه حسابی دەکرد لەسەر خۆیو یەکسەر داوای لێخۆشبوونی دەکرد لەخوای گەورە. بڕوانە جامع الأصول ٣٨٦/٤.

## بەشی دوانزەهەم:

# فەزڵی ( تەسبیح و تەحمیدو تەهلیل و تەکبیر ) کردن[٥٥٠]

١- عَن أبي هُريرَة(رضي الله عنه) أنَ رسول الله(ﷺ) قالَ: (( مَنْ قالَ: ( لا إلهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ. لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِير) في يومٍ مِائة مَرّةٍ كانَتْ لَهُ عَدلُ عَشرِ رقابٍ وَكُتِبَتْ لَهُ مائَة حَسَنَةٍ. وَمُحيَت عَنْهُ مِائَةَ سَيئَةٍ وَكانَت لَهُ حِرزاً مِنَ الشَّيطانِ يَومَهُ ذلِكَ حَتّى يُمسِيَ. وَلَمْ يَأتِ أحَدٌ أفضَلَ مِمّا جآءَ بِهِ إلاّ أحَدٌ عَمِلَ أكثَرَ مِن ذلكَ )).[٥٥١]

**واتە: هەر کەسێ لەڕۆژێکدا سەدجار بڵێ: هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە(الله) تاکی بێهاوەڵەو هەموو موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێك دا بە توانایە، ئەوا بە ئەندازەی ڕزگارکردنی دە کۆیلە چاکەی دەست دەکەوێت و(سەد) چاکەی بۆ دەنوسرێت و(سەد) گوناهی لێ دەسڕێتەوەو ئەو ڕۆژە لە شەیطان پارێزراو دەبێ هەتا ئێوارەی لێ دەبێتەوەو کەس بە پاداشتی لەم چاکترەوە نایەت مەگەر کەسێك لەم زیاتر بکات.**

---

(٥٥٠) تەسبیح واتە (سُبحانَ اللهِ) کردن و تەحمید واتە (الحَمدُلله) و تەهلیل: واتە وتنی (لا إلهَ إلاّ الله ) و تەکبیر واتە ( الله أكبرُ ) کردن.

(٥٥١) البخاري ٤/٩٥ برقم(٣٢٩٣) ومسلم ٤/٢٠٧١ برقم(٢٦٩١).

**٢- وه دەفەرموێت**(ﷺ): (( مَنْ قالَ: ( سُبْحانَ الله وَبِحَمْدِهِ ) في يومٍ مِائةَ مَرّةٍ، حُطَّتْ خَطاياهُ وَلَوكانَتْ مِثْلَ زَبَدِ البَحْرِ )).[(٥٥٢)]

**واتە: هەر کەسێك لە ڕۆژێك دا(سەد) جار بڵێ پاکیو بێگەردیو ستایش بۆ خوایە، ئەوا گوناهەکانی لەسەر لادەچێت ئەگەر چی وەکو کەفی دەریاش(پڕ بە دەریاش) وابێت.**

٣- عَن أبي أيوب الأنصاري(رضي الله عنه) عَن رَسول الله(ﷺ): ((مَنْ قالَ: (لا إلـهَ إلاّ اللهَ وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ. لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدير ) عَشرَ مِرارٍ، كانَ كَمَنْ أعتَقَ أربعةَ أنفُسٍ مِنْ وَلَدِ إسماعِيلَ )).[(٥٥٣)]

**واتە: هەر کەسێك دەجار بڵێ: هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە**(الله) **تاکی بێهاوەڵەو هەموو موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێك دا بە توانایە، وەکو ئەوە وایە کە چوار کەسی لە نەوەکانی ئیسماعیل پێغەمبەر**(علیه الصلاة والسّلام) **ئازادو ڕزگارکردبێت.**

٤- عن أبي هريرة(رضي الله عنه): قال رسول الله(ﷺ): (( كَلِمَتانِ خَفيفَتانِ عَلَى اللِّسانِ. ثَقِيلَتانِ في المِيزانِ. حَبيبَتانِ إلى الرَّحْمنِ: (سُبحانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحانَ اللهِ العَظِيمِ ) )).[(٥٥٤)]

---

**(٥٥٢) البخاري ١٦٨/٧ برقم(٦٤٠٥) ومسلم ٢٠٧١/٤ برقم(٢٦٩١).**

**(٥٥٣) البخاري ١٦٧/٧ ومسلم بلفظه ٢٠٧١/٤.**

**(٥٥٤) البخاري ١٦٨/٧ برقم(٣٤٦٢) ومسلم ٢٠٧٢/٤ برقم(٢٦٩٤).**

**واته: دوو ووشه هەن کە لەسەر زووبان سوکن و لە تەرازووی کردەوەکاندا قورسن و بەلای خواوە خۆشەویستن ئەویش بریتییە لە ووتنی: پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ خوایە. پاکی و بێگەردی بۆ خوای مەزن.**

٥- عَن أبي هُريرَة(رضي الله عنه) قالَ: قالَ رسولُ اللهِ(ﷺ) : (( لأَنْ أقولَ: ( سُبحانَ اللهِ . وَالحَمْدُ للهِ . وَلا إلهَ إلاّ اللهُ . وَاللهُ أكبرُ ) أحَبُّ إليَّ مِمّا طَلَعَتْ عَلَيهِ الشَّمْسُ )).(٥٥٥)

**واته: ئەگەر بڵێم پاکی بێگەردی و هەموو ستایشێك بۆ خوا و هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە(الله) و خوا گەورەترە لە هەموو شتێك. خۆشترە بەلامەوە لە هەموو ئەو شتانەی کە خۆر بەسەریدا هەڵدێ (واتە هەموو دونیا).**

٦- عَنْ سَعد(رضي الله عنه) قال: كُنّا عِندَ رسولِ الله(ﷺ) فقالَ: ((أيَعجِزُ أحدُكُم أن يَكسِبَ كُلَّ يَومٍ ألْفَ حَسَنةٍ؟ فَسَألَهُ سآئِلٌ مِن جُلَسآئِهِ: كَيفَ يَكسِبُ أحَدُنا ألفَ حَسَنةٍ؟ قالَ: يُسَبِّحُ مِائةَ تَسْبيحَةٍ. فَيُكتَبُ لَهُ ألْفُ حَسَنةٍ، أو يُحَطُّ عَنهُ ألْفُ خَطيئَةٍ )).(٥٥٦)

**واتە: سەعد دەفەرموێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووین(ﷺ)و فەرمووی: ئایا کەس لە ئێوە هەیە ئەوەندە بێتوانا بێ کە نەتوانێ هەموو ڕۆژێ هەزار چاکە دەست بخات بۆ خۆی؟**

---

(٥٥٥) مسلم ٢٠٧٢/٤ برقم(٢٦٩٥).

(٥٥٦) مسلم ٢٠٧٣/٤ برقم(٢١٤٠).

**یەکیٚ لەوانەی کە دانیشتبوو پرسیاری لیٚ کرد: چۆن یەکێك لە ئێمە دەتوانیٚ هەزار چاکەی دەست بکەویٚ؟ فەرمووی: سەد تەسبیحات** (سُبحانَ اللّهِ) **بکات هەزار چاکەی بۆ دەنوسریٚ.یان هەزار گوناهی لیٚ هەڵدەوەریٚت.**

٧- عَن جابر (رضي الله عنه) عَن النَّبيّ(ﷺ) قال: (( مَنْ قالَ (سُبحانَ اللّهِ العَظيمِ وَبِحَمْدِهِ) غُرِسَتْ لَهُ نَخلَةٌ في الجَنّةِ )).(٥٥٧)

**واتە: هەرکەسێك یەك جار بڵیٚ پاکی و بیٚ کەم و کورتی و گەورەیی ستایش بۆ خوای مەزن، دارخورمایەکی لە بەهەشتدا بۆ دەڕوێت.**

٨- عَن عبدالله بن قيس(رضي الله عنه) قال: قالَ رَسول الله(ﷺ): ((يا عَبدَاللّهِ بِنَ قَيْسٍ ألا أدُلُّكَ عَلَى كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الجَنَّةِ؟ )) فقُلتُ: بلى يا رسول اللّهِ. قالَ: (( قُلْ: لا حَوْلَ وَلا قُوَّة إلاّ بِاللّهِ )).(٥٥٨)

---

(٥٥٧) أخرجه الترمذي ٥١١/٥ برقم(٣٤٦٤-٣٤٦٥) والحاكم ٥٠١/١ وَصَحّحَهُ و وافَقَهُ الذهبي. وانظر صحيح الجامع ٥٣١/٥ برقم(٦٤٢٩) وصحيح الترمذي ١٦٠/٣.

(٥٥٨) البخاري مع الفتح ٢١٣/١١ برقم(٤٢٠٥) ومسلم ٢٠٧٦/٤ برقم(٢٧٠٤).

ئیبن تەیمییە(ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) فەرمویەتی: ئەویش لەبەر ئەوەی ئەم ووشەیە(واتە: لاحول ولا قوة الا بالله) ووشەیەکە بۆ پشت بەستن بە خوای گەورە بەکاردەهێنرێت نەك بۆ استرجاع، وە زۆرێك لە خەڵکی لە کاتی موسیبەتدا دەیڵێت وەك استرجاع، جا وەك ناڕەزایی دەیڵێت نەك وەك ئارامگری دەربڕین./الاستقامة(٨١/٢).

واتە: ئەی عبداللە ی کوڕی قیس(ئەبو موسای ئەشعەری) ئایا ئاگادارت بکەمەوەو گەوهەرێك لە گەوهەرەکانی بەهەشتت پێبلێم؟ وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: بڵێ هیچ گۆڕان و هێزێك نییە مەگەر بەخوای گەورەوە.

٩- وە دەفەرمویێت(ﷺ): (( أَحَبُّ الكلامِ إلى اللهِ أرْبَعٌ: ( سُبحانَ اللهِ. والحَمدُ للهِ. ولا إلهَ إلاّ اللهُ. واللهُ أكبَرُ). لا يَضُرُّكَ بأيّهِنَّ بَدَأْتَ. وَلا تُسَمِّيَنَ غُلامَكَ يَساراً. وَلا رَباحاً. وَلا نَجِيحاً. وَلا أفْلَحَ. فإنّكَ تَقولُ: أثَمَّ هوَ ! فَلا يَكونُ: فيقولُ: لا )).(٥٥٩)

واتە: خۆشەویسترین ووتە(ی مرۆڤ) بەلای خوای گەورەوە چوارە: پاکی و بێعەیبی و هەموو ستایشێك بۆ خوای گەورەو هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە(الله) و خوا گەورەترە لە هەموو شتێك. زیانت پێناگەیەنێ بەهەرکامێکیان دەست پێبکەیت.وە منداڵەکەت ناومەنێ ئاسان یان قازانج و سەرفراز و ڕزگار بوو. چونکە تۆ دەڵێی فلانیان(لەو ناوانە) لەماڵە؟ ئەویش لەماڵ نەبێت دەڵێن:نەخێر لەماڵ نییە (واتە ئاسانی و قازانج و سەرفرازی و ڕزگاربوون لەماڵماندا نییە بەم هۆیەشەوە کەسی بانگکەر توشی ڕەشبینی دەبێت).

---

(٥٥٩) مسلم ١٦٨٥/٣ برقم(٢١٣٧).

١٠- عَن سَعدِ بنِ أبي وَقاص(رضي الله عنه) قالَ: (( جاءَ أعرابيٌّ إلى رَسولِ اللهِ (ﷺ) فَقالَ : عَلِّمني كَلاماً أقولُهُ. قالَ: قُلْ: ( لا إلهَ إلاّ اللهَ وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ. الله أكبرُ كَبيراً. وَالحَمْدُلله كَثيراً. سُبْحانَ الله رَبِّ العالَمينَ. لا حَوْلَ وَ لا قُوَّةَ إلاّ بِاللهِ العَزيزِ الحَكيمِ ( قالَ: فَهؤلآءِ لِرَبّي فَما لي؟ قالَ: (( قُلْ: اللَّهُمَّ اغفِرْلي وَارحَمْني. وَاهْدِني. وَارْزُقْني)).(٥٦٠)

**واته: دەشتەکییەك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ووتەیەکم فێربکە کە بیڵێم. فەرمووی: بڵێ هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە(الله) تاکی بێ هاوبەشە. خوا گەورەترە لە هەموو شتێك و زۆر ستایشی خوا دەکەم. پاکی و بێ کەم و کورتی و گەورەیی بۆ خاوەن و پەروەردگاری جیهانیانەو هیچ گۆڕانو هێزو توانایەك نییە مەگەر بەخوای خاوەنی عیززەتی تەواوی کاربەجێوە، دەشتەکییەکە ووتی: ئەمانە بۆ (حەق و ستایش کردن)ی پەروەردگارمە. ئەی چی بۆ( نزا و پاڕانەوە)ی خۆمە؟ فەرمووی: بڵێ: خوایە گوناهم ببۆشەو ڕەحمم پێبکەو ڕێنمایم بکەو ڕۆزیم بدە.**

---

(٥٦٠) مسلم ٤/٢٠٧٢ برقم(٢٦٩٦) وزاد أبوداود: ( فلما وَلّى الأعرابيُّ قالَ النّبيُّ (ﷺ): ((لقدْ مَلأَ يَدَيهِ مِن الخَيرِ )) ١/٢٢٠ برقم(٨٣٢). واتە: کاتێ کە کابرا دەشتەکی‌یەکە ڕۆیشت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەردوو دەستی خۆی لە چاکە پڕ کرد.

١١- عن طارقِ الأشْجَعي قالَ: كانَ الرَّجلُ إذا أسْلَمَ عَلّمَهُ النّبيُّ(ﷺ) الصَّلاةَ، ثُمَّ أمَرَهُ أنْ يَدْعُوَ بِهؤلاءِ الكَلِماتِ: (( اللَّهُمَّ اغفِرْلي. وَارْحَمْني. وَاهدِني. وَعافِني وَارْزُقْني )).(٥٦١)

**واته: طاریقی ئەشجەعی دەفەرموێ: ئەگەر هەرکات پیاوێک موسڵمان بووایە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فێری نوێژی دەکردو پاشان فەرمانی پێدەکرد کە بەم ووشانە بپاڕێتەوە: خوایە لێم خۆش ببەو ڕەحمم پێبکەو ڕێنمایم بکەو بمپارێزەو ڕۆزیم بدە.**

١٢- عن جابر بن عبدالله (رضي الله عنهما) أنَّ رسولَ اللهِ (ﷺ) قالَ: (( إنَّ أَفْضَلَ الدُّعاءِ الحَمْدُللهِ. وَأَفْضَلُ الذِّكرِ لا إلهَ إلاّ الله )).(٥٦٢)

**واته: باشترین پاڕانەوە (الحَمْدُ للهِ)کردنە و باشترین زیکر بریتییە لە وتنی(لا إلهَ إلاّ اللهَ).**

**١٣- وە دەفەرموێت**(ﷺ): (( الباقياتُ الصّالِحاتُ: ( سُبحانَ اللهِ. الحَمْدُللهِ، وَلا إلهَ إلاّ الله. وَاللهُ أكبرُ. وَلا حَوْلَ وَلا قُوّة إلاّ بِاللهِ)).(٥٦٣)

---

(٥٦١) مسلم ٢٠٧٣/٤ برقم(٢٦٩٧) وفي رواية لمسلم: (( فإنّ هؤلاءِ تَجَمَعَ لَكَ دُنياكَ وَآخِرَتَكَ)) واته: ئەم شتانە (چاکەی) دنیاو قیامەتت بۆ کۆدەکاتەوە.

(٥٦٢) الترمذي ٤٦٢/٥ برقم(٣٣٨٣) وابن ماجه ١٢٤٩/٢ برقم(٣٨٠٠) والحاكم ٥٠٣/١ وصَحَّحَهُ وَوَافقَهُ الذّهبي وَانظُر صَحِيحَ الجامع ٣٦٢/١ برقم(١١٠٤).

(٥٦٣) أحمد٧٥/٣ برقم(٥١٣) بترتيب أحمد شاكر وإسناده صحيح وانظر مجمع الزوائد٢٩٧/١ وعزاه ابن حجر في بلوغ المرامِ مِن روايةِ أبِي سَعيدِ إلى النَّسائِي في عمل اليوم والليلة برقم(٨٤٨) وَقالَ: صَحّحَهُ الحاكم٥١٢/١ وابن حبان برقم(٨٤٠).

**واتـه: ئـەو كـردەوە چـاكانەی كـه (مەبەسـت تيايـدا بـۆ خوايـەو پاداشتەكەيان هەتا هەتايـه) دەمێنێتـەوە[٥٦٤] بريتيـه لـه ووتنـی: و بێگەردی بۆ خوايەو ستايش بۆ خوايەو هيچ پەرستراوێك نييه بە هەق جگه له(الله)و خوا گەورەتره لە هەموو شتێك و گۆڕان و هێزێك نييه مەگەر بەخوای گەورە.**

١٤- ((سُبْحَانَ اللهِ عَدَدَ مَا خَلَقَ ، سُبْحَانَ اللهِ مِلْءَ ما خَلَقَ، سُبْحَانَ اللهِ عَـدَدَ مـا فـي الأَرْضِ وَالسَّـماء، سُـبْحَانَ اللهِ مِـلْءَ مـا فـي السَّـماءِ وَالأَرْضِ، سُبْحَانَ اللهِ مِلْءَ ما خَلَقَ، سُبْحَانَ اللهِ عَدَدَ ما أَحصَى كِتابَهُ، وَ سُبْحَانَ اللهِ مِلْء كُلّ شَيء، وَتَقول: الحَمْدُلله، مِثل ذلِك)).[٥٦٥]

**واتـــه: پـــاك و بـــێ گـــەردی بـــۆ خوايـــە بـــە ئەنـــدازەی ژمـــارەی دروستكراوانی و پڕ بە هەموو دروستكراوان و ژمارەی ئەوەی لە زەوی و ئاسماندايەو پڕ بەوەی لە ئاسمان و زەويدايـه، وە پـڕی هەمو شتێك.**

---

(٥٦٤) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ... وَالباقياتُ الصّالِحاتُ خَيرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَواباً وخَيرٌ أملاً ﴾ (سورة الكهف:٤٦).

(٥٦٥) لە ئەبی ئومامەی الباهلييەوە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەلايدا تێ پەڕی بينی لێوی دەجـوڵێنـێ، فـەرموی: ئـەوە چـی دەڵێيـت ئـەی ئـەبا ئومامـە؟ فـەرموی: يـادی پەروەردگارم دەكەم. فەرموی: ئايا هەواڵت بدەمێ بە چاكتر يان زۆرتر لە زيكركرنی شەوت لەگەڵ ڕۆژو ڕۆژ لەگەڵ شەو، ئەوەيە كەبڵێيت:..../أخرجه النسائي في عمل اليـوم والليلـة(١٦٦) وابـن حبـان في صـحيحه والرويـاني والطبرانـي في المعجـم الكـبير(٨١٢٢) والحـاكم والبيهقـي واحمـد وابـن ابـي الـدنيا. وصـححه الألبـاني في السلسـلة الصـحيحة١٥٧/٦ بـرقم(٢٥٧٨) وانظـر صـحيح الجـامع(٢٦١٥) وصـحيح الترغيب والترهيب١١٤/٢برقم(١٥٧٥).

**١٥- (١٠٠)جــار بڵــێ**: (سُــبْحَانَ اللهِ)، **وه (١٠٠) جــار بڵــێ**: (الحَمْدُللهِ)، **وه (١٠٠)جار بڵـێ**: (اللهُ أكبرُ)، **وه (١٠٠) جار بڵـێ**: (لا إلهَ إلاّ الله).[٥٦٦]

**١٦- عَن أَبي هُرَيرَةَ وَ أبي سَعيدٍ(رضي الله عنهما) عَنِ النَّبي(ﷺ) قَالَ**: ((إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى مِنْ الْكَلَامِ أَرْبَعًا: (سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ، وَ اللَّـهُ أَكْبَـرُ) فَمَـنْ قَـالَ: (سُـبْحَانَ اللهِ) كُتِبَـتْ لَـهُ عِشْرِينَ حَسَـنَةً، وَحُطَّتْ عَنْـهُ عِشْـرِينَ سَـيِّئَةً، وَمَـنْ قَـالَ: (اللَّـهُ أَكْبَـرُ) فَمِثْلُ ذَلِكَ، وَمَنْ قَالَ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) فَمِثْلُ ذَلِكَ، وَمَنْ قَالَ: (الْحَمْدُ

---

**(٥٦٦) له ئوم هانی کچی ئەبی تالیبەوە فەرمویی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) به لامدا تێ پەڕی وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! من پیر بوم و لاواز بووم، شتێکم فێر بکه که هەر به دانیشتنمەوه بیکەم، ئەویش فەرمویی: (١٠٠)جار بڵێ (سبحان الله) ئەوا بۆ تۆ وەك ئەوه وایه سەد کەس له نەوەکانی ئیسماعیلت ئازاد کردبێت، وه (١٠٠) جار بڵێ(الحمدلله) بۆ تۆ به ئەندازەی پاداشتی سەد ئەسپی جڵەوگیراوه که له ڕێگای خوادا بۆ جیهاد موجاهیدانی پێ بار بکەیت، وه (١٠٠)جار بڵێ (الله اکبر) بۆ تۆ وەك به دیاری بەخشینی سەد ووشتره که خوای گەوره لێی وەرگرتبیت، وه (١٠٠) جار بڵێ (لا اله الا الله) پاداشتەکەی پڕ به نێوانی ئاسمان و زەوی دەکات و ئەو ڕۆژه هیچ کردەوەیەکی هیچ کەسێك بەرز نابێتەوه که له تۆ پاداشتی زیاتری دەست کەوتبێت مەگەر کەسێك وەك تۆی کردبێت). أخرجه أحمد٣٤٤/٦ والبيهقي في شعب الإيمان٣٧٩/١-٣٨٠ ضعفه الألباني ضعيف الجامع(٣٢٣٤) ولكن تراجع وحسنه في السلسلة الصحيحة ٣٠٢/٣ برقم(١٣١٦).**

لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) مِنْ قِبَلِ نَفْسِهِ كُتِبَتْ لَهُ ثَلَاثُونَ حَسَنَةً، وَحُطَّتْ عَنْهُ ثَلَاثُونَ سَيِّئَةً)).(٥٦٧)

**واته: خوای گەورە لە ناو ووتەکاندا چوار دانەیانی هەڵبژاردووە:** (سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَ اللَّهُ أَكْبَرُ)، **جا هەر کەسێك بڵێت**(سُبْحَانَ اللهِ) **بیست چاکەی بۆ دەنوسرێت و بیست خراپەی لەسەر دەسڕێتەوە. وە هەرکەسێك بڵێت**(اللَّهُ أَكْبَرُ) **هەمان پاداشتی هەیە، وە هەر کەسێك بڵێت**(لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) **هەمان پاداشتی هەیە، وە هەرکەسێك بڵێت** (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) **سی چاکەی بۆ دەنوسرێت و سی خراپەی لەسەر لادەچێت.**

**١٧-** ((إِنَّ أَحَبَّ الْكَلَامِ إِلَى اللهِ أَنْ يَقُولَ الْعَبْدُ: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلا إِلَهَ غَيْرُكَ). وَإِنَّ أَبْغَضَ الكَلامِ إِلى اللهِ أَنْ يَقولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: اتَّقِ اللهَ، فَيَقولُ: عَلَيكَ بِنَفْسِكَ)).(٥٦٨)

---

(٥٦٧) رواه أحمد وابن أبي الدنيا والنسائي واللفظ له والحاكم بنحوه وقال صحيح على شرط مسلم، وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب٢/١٠٩برقم(١٥٥٤) وصحيح الجامع(١٧١٨).

(٥٦٨) أخرجه النسائي في عمل اليوم والليلة(٨٤٩/٤٨٨) وابن منده في التوحيد(ق١٢٣/٢-الظاهرية) والبيهقي في الشعب(٣٥٩/١-هندية) والدعوات الكبير(١٣٦/١٠٢) وصححه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة١٠٥٥/٦ برقم(٢٩٣٩) و (٢٥٩٨).

**واتە: خۆشەویستترین ووتە بە لای خوای گەورەوە ئەوەیە کە بەندە بڵێت:** (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلا إِلَهَ غَيْرُكَ) **وە ناشیرینترین ووتە بە لای خوای گەورەوە ئەوە کە پیاوێك بە یەکێکی تر بڵێت: لەخوا بترسە، کەچی ئەو بڵێت: خەریکی خۆتبە.**

**١٨-** ((أَحَبُّ الكَلامِ إِلَى اللهِ أَنْ يَقُولَ العَبْدُ: سُبْحانَ اللهِ وَ بِحَمْدِهِ)).(٥٦٩)

**واتە: خۆشەویسترین ووتە بە لای خوای گەورەوە ئەوەیە کە بەندە بڵێت:** (سُبْحانَ اللهِ وَ بِحَمْدِهِ).

**١٩-** ((**پێغەمبەری خوا(ﷺ) چڵی دارێکی وشکی گرت و رایتەکاند بەڵام نەتەکی، پاشان تەکاندی و هیچ نەتەکی، پاشان تەکاندی تەکاو گەڵاکان وەرین، فەرموی: وتنی**(سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ) **گوناهەکان دەوەرێنێت وەك چۆن دار گەڵاکانی دەوەرێن**)).(٥٧٠)

**٢٠-** عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ(رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ): ((إِنَّ مِمَّا تَذْكُرُونَ مِنْ جَلاَلِ اللهِ التَّسْبِيحَ وَالتَّهْلِيلَ وَالتَّحْمِيدَ، يَنْعَطِفْنَ حَوْلَ الْعَرْشِ، لَهُنَّ دَوِيٌّ كَدَوِيِّ النَّحْلِ، تُذَكِّرُ

---

**(٥٦٩) أخرجه أحمد وغيره وصححه الألباني في صحيح الجامع برقم(١٧٤).**

**(٥٧٠) رواه أحمد والترمذي وحسنه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب١١٣/٢ برقم(١٥٧٠). وانظر صحيح الأدب المفرد(٤٩٥/٦٣٤).**

بِصَـاحِبِهَا، أَمَـا يُحِـبُّ أَحَـدُكُمْ أَنْ يَكُـونَ لَـهُ أَوْ لَا يَـزَالَ لَـهُ مَـنْ يُـذَكِّرُ بِهِ)). [٥٧١]

**واته: ئەو زیکرانەی کە ئێوە لە بەگەورە گرتنی خوای گەورەدا دەیکەن لە وتنی(سُبْحانَ اللّهِ) و(لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّـهُ) و(الْحَمْـدُ لِلَّـهِ) بە دەوری عەرشدا دەسوڕێنەوە دەنگێکیان لێ دێت وەك دەنگی هەنگ، یادی خاوەنەکەی دەخاتەوە( لای مەلائیکەتە پلە بەرزەکاندا)، ئایا هیچ کەسێك لە ئێوە حەز ناکات کە بەردەوام کەسێکی هەبێت باسی بکات و لای خەڵکیدا باسی ئەم بکات.**

**٢١-** عَـنْ أَبـي ذَرّ عَـنِ النَّبـيّ(ﷺ) قـالَ: ( أَحَـبُّ الكَـلام إِلـى الله: ((سُبحَان الله، لا شَريكَ لَه، لَه المُلك ولَهُ الحَمدُ، وهُو عَلى كُل شَيءٍ قَديرٍ، ولا حَولَ ولا قُوةَ إلا بِالله، سُبحان الله وبِحمِده )). [٥٧٢]

**واتە: خۆشەویسترین ووتە بە لای خوای گەورەوە بریتییە لە:** ((سُبحَان الله، لا شَريكَ لَه، لَه المُلك ولَهُ الحَمدُ، وهُو عَلى كُل شَيءٍ قَديرٍ، ولا حَولَ ولا قُوةَ إلا بِالله، سُبحان الله وبِحمِده )).

---

**(٥٧١) رواه ابن أبي الدنيا وابن ماجه(٣٨٠٩) واللفظ له، والحاكم وقال صحيح على شرط مسلم. وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب ١١٢/٢برقم(١٥٦٨) وسلسلة الصحيحة(٣٣٥٨). وفي مختصر العلو ص٧٥ من حديث كعب أن ( سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر لهن دوي حول العرش كدوي النحل يذكرن بصاحبهن).**

**(٥٧٢) البخاري في الأدب المفرد وصححه الألباني في صحيح الأدب المفرد٢٤٣/١ برقم(٦٣٨/٤٩٧).**

٢٢-عَـنْ عَبْـدِ اللهِ بْـنِ عَمْـرٍو(رَضِـيَ اللهُ عَنهُمـا) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللهِ(ﷺ): (مَا عَلَى الْأَرْضِ أَحَدٌ يَقُولُ: ((لاَ إِلَهَ إِلاّ اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاّ بِاللهِ))، إِلاّ كُفِّرَتْ عَنْهُ خَطَايَاهُ وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ)).(٥٧٣)

**واته: هیچ كەسێك نییە لەسەر زەویدا كە بڵێت:** ((لاَ إِلَهَ إِلاّ اللَّهُ، وَاللَّـهُ أَكْبَـرُ، وَلاَ حَـوْلَ وَلاَ قُـوَّةَ إِلاّ بِـاللهِ))، **ئـیلا گوناهـەكانی دەسڕێتەوە ئەگەرچی وەك كەفی دەریاش وابێت.**

٢٣-عن أبي أمامة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): ((مَنْ هَالَهُ اللَّيْلُ أَنْ يُكَابِدَهُ، أَوْ بَخِلَ بِالْمَالِ أَنْ يُنْفِقَهُ، أَوْ جَبُنَ عَنِ الْعَدُوِّ أَنْ يُقَاتِلَهُ، فَلْيُكْثِرْ مِنْ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، فَإِنَّهَا أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنْ جَبَلِ ذَهَبٍ يُنْفِقُهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلّ)).(٥٧٤)

**واته: هەركەسێك توانای نەبوو شەو شەونوێژ بكات، یان ڕژد بوو لەوەی سامانەكەی ببەخشێت، یان ترسا لە دوژمن كە لەگەڵی بەجەنگ بێت، با زۆر بڵێت:** (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ) **چونكە ئەمە**

---

**(٥٧٣) رواه النسائي والترمذي واللفظ له وقال حديث حسن وروى شعبة هذا الحديث من أبي بلج بهذا الإسناد نحوه ولم يرفعه انتهى. ورواه ابن أبي الدنيا والحاكم وزادا: (..وسبحان الله والحمد لله) . وحسنه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب٢/١١٢ برقم(١٥٦٩) وصحيح الجامع(٥٦٣٦).**

**(٥٧٤) رواه الفريابي والطبراني واللفظ له وهو حديث غريب ولا بأس بإسناده إن شاء الله وقال الألباني: صحيح لغيره أنظرصحيح الترغيب والترهيب ٢/ ١٠٧برقم(١٥٤١).**

بەلای خوای گەورە خۆشەویستره لـه شـاخێك زێڕ کـه لـه ڕێگـای خوادا بیبەخشێت.

٢٤-پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: ((کاتێ نوح پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە کاتی سەرەمەرگ بە کوڕەکەی فەرموو: من وەسییەتت بۆ دەکەم جا فەرمانت پێ دەکەم بە دوو شت و نەهیشت لێ دەکەم لە دوو: فەرمانت پێ دەکەم بە وتنی(لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) چونکە هەر حەوت ئاسمـان و حـەوت زەوییەکـە بخرێنـە تایەکـەوەو (لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّـهُ) بخرێتـە تاکـەی تـرەوە (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) قورسـتر دەبێـت، وە ئەگـەر حەوت ئاسمان و هەر حەوت زەوییەکە بکرێنە ئەڵقەیەکی داخراو ئەوا (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) دەیشکێنێت، وە زۆر بڵێ (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ) چونکە نزاو پاڕانەوەی هەموو شتێکەو بەهۆیانەوە دروستکراوان ڕۆزی دەدرێـن. وە نهیـت لێ دەکـەم لـە شـیرك و خۆبەگـەورە زانین....)).(٥٧٥)

(٥٧٥) رواه البخاري في الأدب المفرد (٥٤٨) وأحمد (٢/١٦٩-٢٢٥،١٧٠) والبيهقي في الأسماء(٧٩ هندية). قال الألباني في السلسلة الصحيحة١/٢٠٩ برقم(١٣٤): سنده صحيح.

# پێغەمبەری خوا(ﷺ) چۆن تەسبیحاتی دەکرد؟

عَن عَبْدِاللهِ بنِ عَمْروٍ(رَضَيَ الله عَنهُما) قالَ: (( رَأيتُ النَّبيَّ(ﷺ) يَعْقِدُ التَّسبيحَ بِيَمينهِ )).(٥٧٦)

**واتە: پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی بە دەستی ڕاستی تەسبیحاتی دەکرد(پەنجەکانی کۆدەکردەوە بۆ ناو لەپی دەستی).**

عـن يسـيرة الصحابية(رضـى الله عَنهـا): (( أنّ النبَّـيّ(ﷺ) أمـرَهُنَّ أن يـراعينَ التّسـبيحَ وَالتَّقـديسَ وَأن يَعقِـدنَ بالأنامِـلِ فـإنَّهُنَّ مَسـؤلاتٍ مُستَنطقاتٍ )).(٥٧٧)

**واتە: لە یەسیرەی ژنە صەحابەی بەڕێزەوە(ڕەزای خوای گەورەی لێ بێ) ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی پێکردون کە ئاگایان لە تەسبیحات و بە بەرزو پیرۆز ڕاگرتنی خوای گەورە بێت و بە(ئەنامیلەکانیان) ئەنجامی بدەن ( کە بریتییە لە ئەو بەشەی سەرەپەنجەکان کە نینۆکی پێوەیە).(٥٧٨) چونکە لە ڕۆژی دواییدا پرسیاریان لێ دەکرێت و دێنرێنە گۆو دەبنە شایەت.**

---

(٥٧٦) أخرجه أبوداود بلفظهِ ٨١/٢(١٥٠٢) والترمذي ٥٢١/٥ برقم(٣٤٨٦) وانظر صحيح الجامع ٢٧١/٤ برقم(٤٨٦٥).

(٥٧٧) رواه أبوداود(١٥٠١) والترمذي برقم(٣٥٧٧) بإسنادٍ حَسَنٍ وَحَسَّنَهُ الألباني في صحيح الجامع(٤٠٨٧).

(٥٧٨) المحيط في اللغة٣٢٩/١٠ والقاموس المحيط١٣٧٦/١ ولسان العرب٦٧٨/١١.

## وَلله الحَمْدُ وَالمِنّة

## سُبْحانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ أشهَدُ أنْ لآ إلهَ إلاّ أَنتَ أَسْتَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إلَيكَ

---

**تێبینی: شێخی ئەلبانی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت)فەرمویەتی: ئەمەش سوننەتە لە ژماردنی زیکرە مەشروعەکاندا، ئەویش بریتی‌یە لە دەست و تەنها بە دەستی چەپیش، جا ژماردنیان بە دەستی چەپ یان بە هەردو دەست بەیەکەوە وە بە چەو هەموو ئەمانە پێچەوانەی سوننەتە، وە هیچ شتێك بە صەحیحی نەهاتووە دەربارەی ژماردنیان بە چەوو زیخ چ جای بە تەسبیح../ سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة وأثرها السيئ في الأمة ٣/٤٨.**

# سەرچاوەکان

١-تفسير القرآن العظيم. إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي الدمشقي، تحقيق: سامي بن محمد سلامة، دار الطيبة الطبعة: الثانية ١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م.

٢- تەفسیری ڕامان لە ماناو مەبەستی قورئان. ماموٚستا ئەحمەد کاکە مەحمود. نەشری ئیحسان، چاپی یەکەم ١٤٢٨ك-٢٠٠٧ز.

٣- تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان. بورهان محمد أمين، پێداچوونەوەی لیژنەیەك، لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ڕۆشنبیر.

٣- ولله الأسماء الحسنى. الشيخ عبدالعزيز بن ناصر الجليل.

٤- شرح الأسماء الحسنى في ضوء الكتاب والسنة. سعيد بن علي بن وهف القحطاني.. راجعه الشيخ د.عبدالله بن عبدالرحمن الجبرين.

٥- الأذكار... محي الدين أبي زكريا يحيى بن شرف النووي طبعة سنة ١٩٨٢.

٦- نتائج الأفكار في تخريج أحاديث الأذكار. جزء/١.. ابن حجر العسقلاني.

٧- رياض الصالحين... محي الدين أبي زكريا يحيى بن شرف النووي.

٨- فقه السنة... لسيد سابق سنة ١٣٩١-١٩٧١.

٩- الأدلة الرضية لمتن الدرر البهية في المسائل الفقهية... محمد بن علي الشوكاني.

١٠- الدعاء ويليه العلاج بالرقى من الكتاب والسنة... سعيد بن علي بن وهف القحطاني.

١١- حصنُ المسلم من أذكار الكتاب والسنة، سعيد بن علي بن وهف القحطاني، طبعة فريدة ومضبوطة بالشكل.

١٢- شرح حصن المسلم من اذكار الكتاب والسنة. شرحه: مجدي بن عبدالوهاب الأحمد. صححه وعلق عليه: مؤلف حصن المسلم.

١٣- فقه الأدعية والأذكار. عبدالرزاق بن عبدالمحسن البدر.

١٤- سبحانكَ اللّهُمَّ... مهندس جميل إبراهيم.

١٥- أذكار الصباح و المساء الصحيحة( من المأثورات ومن صحيح الكلم الطَيِّب) الدكتور: عبدالله عزّام.
١٦- تحفة الذاكرين... محمد بن علي الشوكاني.
١٧- فتاوى مهمة تتَعَلقُ بالصلاةِ...عبدالعزيز بن عبدالله بن باز.
١٨- أحكام العيدين في السنة المطهرة... علي حسن علي عبدالحميد الحلبي الأثري.
١٩- أذكار اليوم و الليلة بنسخة مزينة بشرح غريبِ الألفاظ...... إعداد وترتيب:علاءالدين بن يوسف العتيبي ١٤١٦هـ.
٢٠- صحيح الكلّم الطَيّب... لشيخ الإسلام ابن تيمية. بقلم محمد ناصرالدين الألباني ١٤٠٧-١٩٨٧.
٢١- الصحيح المسند من أذكار اليوم والليلة... تأليف: مصطفى بن العدوي أحمد. راجَعَهُ: مُقبل بن هادي الوادعي ١٤١٦هـ - ١٩٩٥م.
٢٢- المُنتقى من الأدعية والأذكار.. إعداد: محمد بن فهد الصبيحي. دار الخضيري. الطبعة الخامسة ١٤٢١ هـ.
٢٣- صحيح أذكار الصلاة...إعداد وترتيب: محمد حسن يوسف....الطبعة الأولى شوال ١٤٢٥ هـ - نوفمبر ٢٠٠٤ م.
٢٤- الذكر الجماعي بين الاتباع والابتداع.... د. محمد بن عبد الرحمن الخميس
٢٥- كتاب الذكر والدعاء في ضوء الكتاب والسنة....عبد الرزاق بن عبد المحسن البدر...الطبعة الأول.. تاريخ النشر : ١٤٢٢هـ .
٢٦- جامع صحيح الأذكار للعلامة المحدث محمد ناصر الدين الألباني رحمه الله تعالى....جمع و ترتيب: أبي الحسن محمد بن حسن الشيخ.
٢٧- صحيح وضعيف اذكار الصباح والمساء من حصن المسلم للقحطاني.....ابو مسلم الارياني.
٢٨- الحصن الواقي.....الشيخ: عبدالله السدحان.
٢٩- إتحاف الأطهار بفضل الدعاء وصحيح الأذكار وفوائدهما

# نـاوەرۆك

| لاپەڕە | بابەت |
|---|---|

بەشی شەشەم: هەندێ كاتی گرنگ و پێویست :

## هەندێك لە بەرهەمەکانی نوسەر

١- قەڵای موسڵمان لە زیکرەکانی شەوانەو رۆژانە لە قورئان و سوننەتدا.

٢- رووخسارو رەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

٣- چارەسەر بە دوعا لە قورئان و سوننەتدا.

٤- راستێتی جنۆکە.

٥- نیشانە بچوکەکانی رۆژی دوایی.

٦- نیشانە گەورەکانی رۆژی دوایی.

٧- قیامەتی گەورەو نارەحەتی‌یەکانی (دوو بەش).

٨- ئەحکامەکانی جەژن و ئادابەکانی.

٩- حوکمی نوێژنەکەر.

١٠- ئامۆژگاری‌یەکی زێرین بۆ ئەو کۆمەڵانەی ئیسلامین.

١١- دۆستایەتی‌و خۆبەری کردن لە ئیسلامدا.

١٢- زنجیرەی چیرۆکە صەحیحەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوو زنجیرە.

١٣- هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام و ئیمان.

١٤- سوودەکانی هاورێیەتی پیاوچاکان.

١٥- بڵاوبوونەوەی داوێن پیسی..هۆکارو چارەسەر.

١٦- دیاردەی مەی خواردنەوە لە ناو گەنجاندا.

١٧- دامەزراوی.

١٨- زمانت بە یادی خوای گەورە پاراو بکە.

١٩- بۆ خوشکێکی لەچکە بەسەر لەم مانگەدا.

٢٠- دیاردەی ساردبوونەوە لە دین.

٢١- حوکمی سەرفیترەو جەژن.

٢٢- چۆنێتی خۆشۆردن(غوسل)ی لەشگرانی و تەیەمموم.

٢٣- هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە(الشرك).

**٢٤- مەرجەكانی پاڕانەوەو ڕێگرەكانی وەڵامدانەوەی.**

**٢٥- داهێنراو لە دیندا(البدعة).**

**٢٦- پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) وەك ئەوەی بیبینی.**

**٢٧- شۆردن و نوێژی مردوو.**

**٢٨- وەڵامێك بۆ مامۆستا عەلی باپیرو هاوڕایانی لەسەر حەڵاڵ كردنی مۆسیقاو گۆرانی.**

**٢٩- (أولي الأمر) كێن؟**